


# تەفسیری کوردی

## لە کەلامی خوداوەندی

مەلای گەورە
(مەلا محەمەدی کۆیی)

بەرگی دووەم

# تەفسیری کوردی

## لە کەلامی خوداوەندی

مەلای گەورە
( مەلا گەورەی کۆیی )

بەرگی دووەم

جوزئی (٤-٥-٦)

لەسەر ئەرکی بەڕێز مام جەلال سەرۆک کۆماری عێراقی فیدراڵ لەچاپدراوە



## سورەتی (ال عمران)
## لە ئایەتی ٩٢ تا کۆتایی



﴿لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ﴾ ئەی بەنی ئیسرائیل بە تەئکید أبداً ئێوە ناگەنە خێر، خێرتان ناگاتێ ﴿حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ﴾ لەماڵی چاکی خۆشەویست، لکن حرص و تەمەع ئێوەی وا گرتووە، بۆخوا شتی بێ قیمەتیش صەرف ناکەن ﴿وَمَا تُنفِقُوا۟ مِن شَىْءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ ﴿٩٢﴾﴾ خوا ئاگادارە بەو شتانەی صەرفی بکەن، ئەگەر چاك صەرف بکەن جزاتان لەسەر ئەو چاك ئەداتەوە. وە لەو تەمەعە دەڵێن خوا هەموو ماڵی دنیای دایتە ئێمە بەهەر نەوعێ بەدەستی خەین بۆمان دروستە. (أمیێن) رێیان لەسەر ئێمە نی یە ماڵیان ئەخۆین بە حەلاڵی و بە زەلالی و ئەوەش نیسبەتی بە وەحی ی ئیلاهی ئەدەن! حاشا وانی یە! بەڵێ ئەوەندە هەیە ﴿كُلُّ ٱلطَّعَامِ كَانَ حِلًّا لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ حوشتر و غەیری وی لە حەیوانات و حبوبات ﴿إِلَّا مَا حَرَّمَ إِسْرَٰٓءِيلُ عَلَىٰ نَفْسِهِۦ﴾ تەبەعەشی بە تەبەعیەت کردیان نە حەرامی عام وە الا ئەو خاصە لەخۆی حەرام کردبوو ئەوەش لە تحلیل و لە تحریم ﴿مِن قَبْلِ أَن تُنَزَّلَ ٱلتَّوْرَىٰةُ﴾ ئەمەش مەعنای وا نی یە هەموو شت بۆ بەنی ئیسرائیلی خەلق کراوەو عیبادی تر حەقیان نی یە، بەڵکو مەقسەد ئەوەیە ئەو مطعوماتە حەلاڵ بووە بۆ بەنی ئیسرائیلی پێش نزولی تەورات وە تەورات گەلێ شتی لەئێوە حەرام کرد. ئەو حوکمە لەسەر قاعیدەی أصل لە أشیا إباحەیە بۆ تەحریم دەلیلی ئەوێ.

﴿قُلۡ فَأۡتُواْ بِٱلتَّوۡرَىٰةِ﴾ ئەگەر راست ئەكەن ئەڵێن حوكمی خوای بۆ ئێمە وایە وەك ئـەڵێن تـەورات بێـنن ﴿فَٱتۡلُوهَآ﴾ بـی خوێننـەوە بەئاشـكرا ﴿إِن كُنتُمۡ صَٰدِقِينَ ٩٣﴾ لەو دەعوایە ﴿فَمَنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ ٱلۡكَذِبَ﴾ بەخەیاڵی خۆیان ئەو قەومە (أمیّن) وەك كوردان چ نازانن هەرچی نیسبەتی بدەین بـۆ تـەورات و سائری كتبی سماوی نازانن، بەقسەی ئێمە هەڵ ئەخەڵـەتێن. ﴿مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ﴾ پاش ئەوەی كـە خـودا بـۆ خـاتمی إظهـار كـرد، غەڵـەت و درۆی بەدەرخـستن، ئەگەر شەرمتان هەبێ جاری تر إفترا بەخوا ناكەن، درۆی خۆتـان نیـسبەت بـۆ خوا نادەن. ئـەوی وابكـا ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ٩٤﴾ بەهـەموو مـەعنای زوڵـم ﴿قُلۡ صَدَقَ ٱللَّهُ﴾ ئێوە درۆتان كـرد، نـەتان تـوانی بـە نـەقڵ دەعـوای خۆتـان ئیسپات بكـەن، خـوا راسـت ئەفـەرموێ. ﴿فَٱتَّبِعُواْ مِلَّةَ إِبۡرَٰهِيمَ حَنِيفٗا﴾ بـێ درۆو دەلەسە، بێ مەیلی باطـل، بـێ فیكـری فەسـاد و حـەق گـۆڕین و ڕێ تێكـدان. ﴿وَمَا كَانَ مِنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٩٥﴾ نە بە قلب، نە بە قـەول، نـە بـە عەمـەل خـالص و مخلص بووە بـۆ خـوا، ئێـوەش دەسـت لـە "شـرك" هـەڵگرن، روو لـە تماثیـل مەكەن، روو بكەنە قیبلەی ابو الأنبیای بینـاكردەی خـەلیل ﴿إِنَّ أَوَّلَ بَيۡتٖ وُضِعَ لِلنَّاسِ﴾ بـۆ قیبلـەی عباداتیـان ﴿لَلَّذِي بِبَكَّةَ﴾ تـاریخ عالـەم شـاهیدە پـاش چەندێ بیت المقدس بیناكرا ئەو وولاتەكەی كەوتە بەردەست ئـەهلی ئیمـان و لەدینی ئیلاهی روو لە شەرق و غەرب كردن نـی یـە، ئەمـە كـاری رۆژپەرسـتانە ﴿مُبَارَكٗا وَهُدٗى لِّلۡعَٰلَمِينَ ٩٦﴾ بـەیتێك بـە بەرەكـەت لەسـەر پـاكی و بڵنـدی داندراوە ﴿فِيهِ ءَايَٰتُۢ بَيِّنَٰتٞ﴾ تێدا هەیە عەلاماتی ئاشكرا كە بیناكردەی خەلیلە ﴿مَّقَامُ إِبۡرَٰهِيمَ﴾ مەقامی ئیبراهیم عەلامەتێكە مشتمل بەسەر ئایات، ئەو ئایاتە عەینی مەقامی ئیبراهیمە، یا مـەقامی ئیـبراهیم أعظمـی ئـەو ئایەتـەیـە ﴿وَمَن

دَخَلَهُۥ﴾ ئەوی بچێتە ناو مەقامی ئیبراهیم مەرکەزی خەلافەت و ئیمامەمەتی ﴿كَانَ ءَامِنًاۗ﴾ الآن بۆ ئێمە، بۆ ئێمە نەبێ کافران سەدیان کردووە، دیارە مەقسەد نەفسی (صخرة)یێ نی یە کە وەقتی بیناکردن حەزرەتی ئیبراهیم لەسەری رادەوەستا ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ﴾ جوو، دیان، موسڵمان، عەرەب، هیندی، ئێرانی، ﴿حِجُّ ٱلْبَيْتِ﴾ لە تأریخ ئەڵێ لە زەمانێ هەموو ئەچوون بۆ تەوافی بەیتی "خليل الرحمن" خۆشەویستی هەمووان، پاشان عەداوەتیان خستە بەین، ئەم رێ یە بەسترا ﴿مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًاۚ﴾ ئەگەر ئێمە محصورین رێمان لێ گیراوە خۆ ئێوە لەگەڵ قورەیش دۆستن، مەمنون ئەبن تەشریفتان بچێتە مەککە ئەگەر بچن زیادە دۆستاتیتان مەحکەم ئەبێ، لە عەلەیهی ئیسلام بەقووەت تر ئەبن!!

﴿وَمَن كَفَرَ﴾ بەڵێ حەج لەسەر ئێمە نی یە، دینی ئێمە جوایزە لەگەڵ دینی ئیبراهیم، ئەوە بۆ ئیسماعیلیانە، بۆ ئیسرائیلیان نی یە ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ غَنِيٌّ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ٩٧﴾ خوا استغنای هەیە بالذات لە هەموو عالەم: علوی و سفلی، مؤمن و کافر، بَرّ و فاجر. غنای راستی ئەوەیە حاجەتت بە شت نەبێ، ئەگەر محتاجی بی هەیشت بێ هەر فەقیری، وەك شافیعی دەفەرموێ:

"غنيت بلا مال عن الناس كلهم
وليس الغني الاّ عن الشيء، لا به"

﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تَكْفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ کەونی وەحیی تەئریخی سەبەبی چی یە ئینکاریان ئەکەن؟ ﴿وَٱللَّهُ شَهِيدٌ﴾ خوا خەبەردارە. ئاگادارە ﴿عَلَىٰ مَا تَعْمَلُونَ ٩٨﴾ قلبی و قالبی کەسێ ئینکاری عیلم بەجوزئیات بکا ناتوانێ ئیعتیراف بە نبووەت بکا.

﴿قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ لِمَ تَصُدُّونَ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ مَنۡ ءَامَنَ﴾ بۆچە ڕێی ئەوانی ئیمانیان هێناویە وەرئەگێڕن لەڕێی خودا بە ئیعتیقاد بەعەمەل. ﴿تَبۡغُونَهَا عِوَجٗا﴾ تەلەب ئەکەن، مەیلیان وایە ڕێی ڕاستی خوا خوار بکەن. ڕێی ڕاست بکەن خوار. بە دەرەجەیێ مبالغە ئەکەن، اوّلی ڕۆژ ئیمان ئەهێنن، ئاخری ڕۆژ مورتەد ئەبن تا مؤمنان وەربگێڕن (أنە) وەك عەرەبان (أمّي) نین نەدەبایە ئێوەش وەك ئەوان بکەن، ڕێی ڕاست لە خەڵکی وەربگێڕن. ئەوانە خۆیان خوارن. خوار لەگەڵ ڕاست ڕێك ناکەوێ، ئەمما خوار لەگەڵ خوار زۆر چاك و ڕاست ڕێ و ڕێك ئەکەوێ ﴿وَأَنتُمۡ شُهَدَآءُۗ﴾ عولەمان و خوبەران. ئاگادارن. ﴿وَمَا ٱللَّهُ بِغَٰفِلٍ عَمَّا تَعۡمَلُونَ ٩٩﴾ ئەوەش ئەزانن ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ ئاگادارین. لەکەیدی ئەهلی کتاب ئەمین مەبن. ﴿إِن تُطِيعُواْ فَرِيقٗا مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ بە محبەتیان گرفتار و بە حیلەیان هەڵ خەڵەتێن، ئیتاعەی فەریقێك لەوانەی کتابیان دراوەتێ بکەن، ئەو فەریقە عنود و حەسود و حقود و بەدخواهە کە بە ئەنواعی دەسیسە ڕێتان لێ کەچ ئەکەن. ﴿يَرُدُّوكُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡ كَٰفِرِينَ ١٠٠﴾ ئەوەندە بەقووەتن لە إفساد ئەتوانن لەپاش ئەو ئیمانە کە هەتانە وەرتان گێڕنەوە بەکافر ﴿وَكَيۡفَ تَكۡفُرُونَ﴾ زۆر دوورە لەئێوە ﴿وَأَنتُمۡ تُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ﴾ مشافهە ئایاتی خوای دەست نازەدە لەسەر ئێوە ئەخوێندرێتەوە ﴿وَفِيكُمۡ رَسُولُهُۥۗ﴾ ڕەسولی بەرحەق لەناو ئێوەیە ئایا بە ئیغترای ئەوانە گوێ ئەدەن؟ ئیستیماعی ئایاتی خوا ناکەن؟ وە بەو پێغەمبەرە ناصیحە ئەمینە بڕوا ناکەن؟ تصدیقی ئەو خائنانە ئەکەن؟ حاشا ثم حاشا ئەوە نابێ محالە لە ئێوە. ﴿وَمَن يَعۡتَصِم بِٱللَّهِ﴾ ئەوەی دەست بە هیدایەتی خوداوە بگرێ ئیتاعەی حەبیبی ئەو بکا ﴿فَقَدۡ هُدِيَ إِلَىٰ صِرَٰطٖ

مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٠١﴾ ئەوی هیدایەتی بوو بۆ ڕێی ڕاست چۆن گوم ئەبی و ئەچێتە سەر ڕێی چەوت؟ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ﴾ حەقی تەقوا لەخوا ئەوەیە چۆن ئەمرتان ئەکاتێ وابکەن، وەك بەنی ئیسرائیلی بە ئیمان بەخوا خۆ مەکوژن هەر ئەو بە مەبدەأ و مەرجەع بزانن، إعتماد بەسەر شفعاعەکەن، بە نەسەب مەنازن. کەوابێ ئەو ئایەتە منسوخ نی یە، ئەگەرچی گەلێ کەس توەهمیان بردیە ﴿وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾﴾ سەعی بکەن لە رسوخی ئیمان بە نظر لە ئایاتی آکوان و قورئان ظلماتی شکوك و أوهام لەدڵی خۆتان مەیێڵن محبەتی خواتان لەدڵ شین ببێ. ((الحب في الله والبغض في الله)) بکەنە دەستووری ئیمان کە بووە مەلەکە قابلی زوال نی یە ﴿وَٱعْتَصِمُواْ بِحَبْلِ ٱللَّهِ﴾ ئەو ئیمانە حبل الله یە عروة الوثقایە، قابلی پسان و درز دان نی یە، دەستی پێوە بگرن، لاشك لەسەر ئیمان دەمرن ﴿جَمِيعًا﴾ هەمووتان —کل واحد— لەئێوە دەست بەو حەبلە مەتینەوە ببەستن ﴿وَلَا تَفَرَّقُواْ﴾ تەفرەقە مەکەن، إختلافتان نەبێت، لە یەك جودا مەبن، عەداوەتی یەك مەکەن ﴿وَٱذْكُرُواْ نِعْمَتَ ٱللَّهِ﴾ یادی نیعمەتی خوا بکەن ﴿عَلَيْكُمْ﴾ لەسەر خۆتان ﴿إِذْ كُنتُمْ أَعْدَآءً﴾ لە زەمانی جاهیلیەت دوژمن بوون، حاڵتان چەند ناخۆش بوو ﴿فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ﴾ بەسایەی ئیمان ﴿فَأَصْبَحْتُم بِنِعْمَتِهِۦٓ إِخْوَٰنًا﴾ بە نیعمەتی خوای تەعالان گەڕان بە برا لە شەوی عەداوەت دەرچوون بۆ سبەینێی دۆستی.

سبەینە وەك ئووەڵی حەیاتە. هەرکەسە، هەر تەیرە، هەر حەیوانە لە مەئوای خۆی دێتە دەر، دەست دەکەن بە سەعی و عەمەل بۆ گوزەران. ئێوەش لە ئەووەڵی ئەو إتحادەدا ناخۆشی، نارێکیتان لەیاد نەچووە.. لەزەت لەو خۆشی یە ئەبینن لەو ذەوقە غافڵ مەبن ﴿وَكُنتُمْ عَلَىٰ شَفَا حُفْرَةٍ مِّنَ ٱلنَّارِ﴾

لەسەر رۆخی لێوی کەندڕی بوون لەئاگر نیزیك بوون کە بکەونێ ﴿فَأَنقَذَكُم مِّنْهَا﴾ دووری خستنەوە لە لێواری ئەو حفرەیە ﴿كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ﴾ دلائلی خۆی ڕێگەتان بۆ ئاشکرا دەکا ﴿لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ (١٠٣)﴾ بۆ تأمل کردن لە شتێ، ئولفەت گرتن بەشتێ غافڵتان نەکا لە عیبرەت.

﴿وَلْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ﴾ با ببێ لەئێوە ئوممەتێ، جەماعەتێ ﴿يَدْعُونَ إِلَى ٱلْخَيْرِ﴾ یەعنی لەئێوە ئوممەتێ تکوّن بکا دەعوەتی عالەم بکەن بۆ صلاحی دین و دنیا، یەعنی خۆتان ببنە ئوممەتی وا ﴿وَيَأْمُرُونَ بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ ٱلْمُنكَرِ﴾ ئەمر بەچاکە بکەن، نەهی لە خراپە. ﴿وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ (١٠٤)﴾ ئوممەتێ بەو نەوعە هەر ئەوان فوزیا بن، بەخۆ مشغول نابن، بە عمومی سەعی بۆ نەجاتی عالەم ئەکەن، ئارەزوومان وایە ئێوە ئوممەتێ وابن دەعوەتی عالەم بکەن نەك بەقسەی مفسدان هەڵ خەڵەتێن و وەرگەڕێن و عەداوەتی یەك بکەن. یەك فکر و یەك دڵ و یەك زبان و یەك غایە بن ﴿وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّذِينَ تَفَرَّقُوا۟﴾ وەك جوو دیانان مەبن، بەدرۆی (أختلاف أمتي رحمة) هەڵ مەخەڵەتێن، مەڵێن ئەوە ڕەسولی خوایە ئەبێ هەر بێتە جێ. ذاتاً ئەو نەوعە مفدسانە بوون لێ یان تێك داین. هەر ئایەتێ روحێکی اجتماعی تێدابوو بە حدیثی درۆ هەڵ بەستی خۆیان روحەکەیان برد ﴿وَٱخْتَلَفُوا۟﴾ لە اصول، لە فروع، لە آمال و أفکار ﴿مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَهُمُ ٱلْبَيِّنَٰتُ﴾ لەپاش ئەوەی کە (بيّنات)یان بۆ هات چ ئایاتی کتابی منزل، چ ئایاتی تاریخی عالەم. وەك شاعیر ئەڵێ:

دولت همه زاتفاق خیزد
بی دولتی از نفاق خیزد

سەعدی ئەڵێ:

پشه چو پر شد بزند فیلرا
با همه تندی و صلابت که أوست
مورچەگانرا چو بوو إتفاق
شیر ژیانرا بدرانند پوست

﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ١٠٥﴾ نایێتە حەد و حیساب و تەقریر و تەحریر کەی؟ ﴿يَوۡمَ تَبۡيَضُّ وُجُوهٞ وَتَسۡوَدُّ وُجُوهٞۚ﴾ ڕۆژێ کە وجوهێ سپی ئەبێ و وجوهێ ڕەش ئەبێ، ڕووی سپی و ڕووی ڕەش ئەوێ ڕۆژێ بەدەر ئەکەوێ، ڕووڕەشەکان عەزابی گەورە پڕ لە ئەندۆەو حەسرەت و خەجاڵەت و نەدامەت ئەو ڕۆژە ئەچێژن. ئەمڕۆ کە قەومێ نارێك مغلوبن ڕوو ڕەشن إحتمالی هەیە لە بێعاری ئەلەمی شەرمەساری نەچێژن وەك کەسێ بەنج کرابێ پارچەپارچە ئەکرێ ئاگای لەخۆی نی یە، وە إلاّ ڕووڕەش و ڕووسپی ئەمڕۆ دیارە. ئێمە دیمان و ئەیان بینین عالەمی ئیسلامیەت لە چ عظمت و شکۆەو سەربڵندی ڕوویان لە مەسەڕەتی زەفەر وەك ئافتابی عالەم تاب ئەدرەوشا، سەبەب بە إختلاف چییان لێ هات، سەرشۆڕ، ڕەنگ تەڵخ، چاوحیز، ژێردەست، ئەسیر، زبان درێژی دەست کورت.

﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسۡوَدَّتۡ وُجُوهُهُمۡ أَكَفَرۡتُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡ﴾ تسدیقی پێغەمبەرانتان کرد کە خلاف و تەفرەقە خراپە. بۆ کردتان؟ ئایا کفرتان کرد؟ ئینکاری ڕاستی ی قسەی ئەوانتان کرد؟ یا هەر لەسەر مەیلی زەمانی کفر ڕۆیشتن؟ ئەدی ئیمانتان ئەوەندە نەبوو بتان گێڕێتەوەو لە مەیلی کافری پاکتان بکا. ئەی ئەهلی ئیمان ئێوە نەکەن وەکو ئەوان ڕووی خۆتان ڕەش بکەن، پێغەمبەری ئێوە قاندی گرۆهی یە (غُرّ)ن یەعنی بە نەوچەوانی سپی سەربڵند (محجّلن) یەعنی دەست و پێ خاوێن و پاك، ثابت قەدەم، دەست بە حەبلی خوا.

﴿فَذُوقُواْ ٱلۡعَذَابَ بِمَا كُنتُمۡ تَكۡفُرُونَ ١٠٦﴾ بچێژن ئەو عەزابە عظیمە ألیمە سەبەب بە کفرتان بە ئایاتی خوا، بەقەولی رەسولتان بڕوا نەکرد، دوای هەواو هەوەس کەوتن، تیاچوون، زەرەرتان کرد، ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱبۡيَضَّتۡ وُجُوهُهُمۡ﴾ ئەوانەی بە ئیتتیفاق و ئیتتیحاد لەدنیا ڕوویان گەش بوو پڕ ئاوی سروور بوو، نەشئەی زەفەر لەرووی موبارەکیان بریقەی ئەدا لەڕۆژی قیامەت بەڕووی سپی و سەری بلند ﴿فَفِي رَحۡمَةِ ٱللَّهِ﴾ بلێن ئەو رەحمەتە چی یە؟ لەبەر ظرفیّتی (فی) ئەڵێن بەهەشتە. ئەگەر لەبەر تەنگ ظرفی نەبێ ئەڵێم لە رەحمەتێ وەهان کە ((وسعت كل شيء)) احاطەی بە هەموو شت داوە.

﴿هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ١٠٧﴾ قەت لێیان قطع نابێ ﴿تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱللَّهِ﴾ بەڕاستی ﴿نَتۡلُوهَا عَلَيۡكَ بِٱلۡحَقِّ﴾ بە صدق و صریح قابلی تەبدیل و تەئویل و تەحریف و تەجەووز و مساهەلەو موبالەغە نی یە، ڕاست و دروستە، عەدل و هەموارە ﴿وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلۡمٗا لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٨﴾ أدنی أدنای لە زوڵم، ئەگەر لە کەلامیدا نەوعە مساهەلەیێ بنوێنێ چ بۆ إفراط چ بۆ تفریط بە زوڵمی ئەزانێ، ئەویش ناکا نە دەربارەی ئێوە بۆ کەس خودا مەقسەدی زوڵم ناکا، خەڵکی زوڵم لەخۆیان ئەکەن بۆ منافعی خۆشیان بەقسەی خوا ناکەن.

﴿وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ﴾ هەمووی ئی ئەوە، بۆ زوڵم بکا!؟ زوڵم کەی بکا؟ ﴿وَإِلَى ٱللَّهِ تُرۡجَعُ ٱلۡأُمُورُ ١٠٩﴾ بۆ ئەمر بەجێ نامێنن؟ لە عەزابی ناترسێن بەئومێدی شەفاعەتی آباء و آلهە و رۆساتان؟ ئەی خاك بە دەمەن!

﴿كُنتُمۡ خَيۡرَ أُمَّةٍ أُخۡرِجَتۡ لِلنَّاسِ﴾ ئێوە چاترین ئوممەتێ بوون بەدەرخران بۆ عالەمی بەشەری بۆ ئیرشادیان. هەموو قەوم سیاسی و دینی کە ظهور ئەکا بەناوی چاکە و نەجاتی ئومەم ئیرشادیان هەڵ ئەستێ تا بەدرۆو دەلەسە ئیشی خۆی ئەبینێ، گەزیی و جاوی چی؟! آمالی پیسی دەرئەکەوێ کە

غەیری استیلاو استیعباد چی تر مقصود نی یە، تەئریخی عالەم بۆ صدقی ئەو قەولە شاهیدە، جێی ئینکار نی یە، ئێوە ئەی ئەسحابی گرین رەسولی موجتەبای وانەبوون صرف مەقصودتان ئیرشادی عیباد بوو لە جەهالەت و ئەسارەتیان نەجات بدەن ﴿تَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ﴾ ئەمر ئەکەن بە هەرچی چاك بێ ﴿وَتَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ﴾ نەهی ئەکەن لە هەرچی خراپ بێ، زێرا منکر و معروف لای ئەوان معروف بوو، إختلافی مەزاهیب نەبوو. ناشکوری نەبێ إختلافی مەزاهیب معروف و منکریشی تێك دا (خاصة) إختلاف لە حوسن و قوبحی عەقلی. عەقلێ و نەقلێ مشەووەش کرد.

﴿وَتُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِۗ﴾ ئیمانی بە قووەت و پاك و خاوێنیتان هەیە بە ذاتی واحدی واجب الوجود بێ شریك لە صفات و أفعال، مال الملك، حی و قیوم، مەلیکی رۆژی جەزا، پەروەردگاری عالەم، ئیتاعەی ئەوامری ئەکەن، اجتناب لە منهیاتی ئەکەن. ﴿وَلَوۡ ءَامَنَ أَهۡلُ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ بەو جۆرە ئیمانە ﴿لَكَانَ خَيۡرٗا﴾ چاك دەبوو، یا چاتر دەبوو ﴿لَّهُم﴾ بۆ ئەوان، زەرەریان نەدەکرد، ڕاستیان لەقیس نەدەچوو، بەڵکو گەلێ گەورەتر ئەبوون، لەسایەی ئیمان بە خاتم الرسل ئیمانیان بە حەزرەتی موساو عیسا و سائری پێغەمبەران ئەبووە ئیمانی صحیح. جێ و جاه و موڵك و ماڵی خۆیان بۆخۆیان ئەبوو زوڵمیان لێ نەدەکرا ﴿مِّنۡهُمُ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ﴾، بەڵام معدود وەك (عبدالله بن سلام) هەزار هەزار(رضواني خوای لێ بێ) ﴿وَأَكۡثَرُهُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ١١٠﴾ هەزار هەزار لعن لەو فاسقانە بێ کە تەفرەقە ئەخەنە ناو عیبادەتی خوا، ڕێیان لێ تێك ئەدەن، گومڕاهیان ئەکەن. ﴿لَن يَضُرُّوكُمۡ﴾ ئەو فاسقانەی بێ ئیمان زەرەر بەئێوە نادەن و ناگەیێنن ﴿إِلَّآ أَذٗىۖ﴾ ئیللا زەرەرێکی کەم ﴿وَإِن يُقَٰتِلُوكُمۡ يُوَلُّوكُمُ ٱلۡأَدۡبَارَ﴾ ئەگەر شەڕتان لەگەڵ بکەن پشتتان تێ ئەکەن، هەڵ دێن.

﴿ثُمَّ لَا يُنصَرُونَ ﴿١١١﴾﴾ پاش هەزیمەت لەکەس یاردم نادرێن. بە حەلیفەکانیان پشت نەبەستن ﴿ضُرِبَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلذِّلَّةُ﴾ خەیمەی زیللەتیان لەسەر هەڵ دراوە کەس لای تێ شکاوی نی یە، ﴿أَيۡنَ مَا ثُقِفُوٓاْ﴾ لەهەر کوێ إصابە کران لە تەرەف ئێوە لەجیهەت دۆستانیان ﴿إِلَّا بِحَبۡلٍ مِّنَ ٱللَّهِ وَحَبۡلٍ مِّنَ ٱلنَّاسِ﴾ یەعنی مادام لەسەر حاڵی ئێستایان بن لە فسق و خروج لە عەهد و میثاق کەس إعتمادیان ناداتە سەر، لەهەموو لایێ رەزیل ئەبن، ئەگەر دەست لەو لەئامەتە هەلگرن دەرئەچن، کەسێ عیززەتی نەفسی نەبێ لای خواو عیبادی خوا عیززەتی نابێ، ئەوی بە شەرەف بێ حفظی عەهد بکا شەرەف و حورمەتی ئەبێ. ﴿وَبَآءُو بِغَضَبٍ مِّنَ ٱللَّهِ﴾ خۆیان کردوەتە شایانی غضبی خواوەندی رەحمان قەت تمسك بە حبلی خوا ئەکەن؟ ﴿وَضُرِبَتۡ عَلَيۡهِمُ ٱلۡمَسۡكَنَةُۚ﴾ ذیللەت و ضعفیان لەسەر هەڵدراوە. ئەوە ئی ئەمڕۆ نی یە لە أسلافیان بە ئیرث ماوەتەوە بۆیان.

﴿ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَانُواْ يَكۡفُرُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ﴾ عەقلی و نەقلی ﴿وَيَقۡتُلُونَ ٱلۡأَنۢبِيَآءَ بِغَيۡرِ حَقٍّۚ﴾ قەتلی مادی و مەعنەوی (علة العلة) چی یە؟ ﴿ذَٰلِكَ بِمَا عَصَواْ وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ ﴿١١٢﴾﴾ داب و پیشەی ئەوان عصیان و تەجاوز لە حەددە، وازی لێ ناهێنن، بۆ حەق نەرم نابن ئەوانن نەرمە حیز و رەق. ﴿لَيۡسُواْ سَوَآءٗۗ﴾ هەموو ئەهلی کتاب وەك یەك نین، ذاتاً فەرموی مطیعیشیان هەن، فاسقیشیان هەن ﴿مِّنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ هەیە لە ئەهلی کتاب جوو و دیان، ﴿أُمَّةٞ قَآئِمَةٞ﴾ ئوممەتێ لەسەر رێی ڕاست ثابت قدم ﴿يَتۡلُونَ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ءَانَآءَ ٱلَّيۡلِ﴾ ئایاتی خوا بە زەریفی، بە تدبّر و تفکر و تأمل ئەخوێننەوە لە ئەجزای شەو ﴿وَهُمۡ يَسۡجُدُونَ ﴿١١٣﴾﴾ لە عیبادەتدا سوجدە ئەبەن ذاتاً عیبادەتی بێ سوجدە روحی

تیا نی یە، بۆیە لە (حدیث) ئەفەرموێ ((عەبد لە سوجدە لەهەموو وەقتێ نزیکترە لە خوا)).

﴿ يُؤۡمِنُونَ بِٱللَّهِ ﴾ ئیمانی صحیح ﴿وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾ کە ((لاَ بَيْعٌ فِيهِ وَلاَ خُلَّةٌ وَلاَ شَفَاعَةٌ)) عەزابی بۆگوناهکار ألیمە دوور و درێژە ﴿وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ﴾ لە چەکبردە چەکبردەی أشاعرەو معتزلیان دوور، ئەزانن چاك چی یە ئەمری پێ ئەکەن، ئەزانن خراپ چی یە نەهی لێ ئەکەن، خۆیان لە فکر ناکەن. ﴿وَيُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡخَيۡرَٰتِ﴾ لەناو خێران دا مسارعە ئەکەن بەخێرایی لەخێرێ بۆ خێرێ ئەچن. هیچ خێرێك لە وسائل و مقاصد لەقیس خۆیان نادەن ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ مِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ١١٤﴾ ئەوانە لە زومرەی پیاوچاکانن لای خواو ئەهلی ئیمان.

ئەی گرۆهی پیاوچاك و خێرەومەندان ﴿ وَمَا يَفۡعَلُواْ﴾ خوا خطابتان لەگەڵ ئەکا ئەفەرموێ ئەوی بیکەن ﴿مِنۡ خَيۡرٖ﴾ گەورەو گچکە خاصە، عامە، قلبی، قالبی ﴿فَلَن يُكۡفَرُوهُۗ﴾ لێتان بزر ناکرێ، فائدەی ئەبینن، ثمرەی ئەچێنن. إشادە بۆ إخلاصیان بە ئەوەندە إکتفا ئەکا. ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِٱلۡمُتَّقِينَ ١١٥﴾ خۆی ئەزانێ چ نەوعە کەرەمێکیان لەگەڵ ئەکاو لای خوا هەر تەقوا حسابە ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بێ ئیمان و بێ تەقوا ﴿لَن تُغۡنِيَ عَنۡهُمۡ أَمۡوَٰلُهُمۡ وَلَآ أَوۡلَٰدُهُم مِّنَ ٱللَّهِ شَيۡـٔٗاۖ﴾ کەڵکیان ناگرێ بێ فائدە ئەچێ. ماڵێك لەرێی خوا سەرف نەکرێ پووچە، ئەولادێ بەئیمان و تەقواو تەربیە نەبێ هیچە. ﴿وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ﴾ خاوەندی ئاگرن ﴿هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ١١٦﴾ نە دەر دەچن نە ڕویان دەردەچێ، فدیە نی یە، شەفاعەت نی یە.

﴿مَثَلُ مَا يُنفِقُونَ فِي هَٰذِهِ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا﴾ لەڕێی شەهوات و فیتنە و فەساد ﴿كَمَثَلِ رِيحٖ فِيهَا صِرٌّ﴾ وەکو مەسەلی بایەکی سەرمایی بە شیددەتی تیا بێ (بای وەیشووم) ﴿أَصَابَتۡ حَرۡثَ قَوۡمٖ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ﴾ لە زراعەتی قەومێ بدا، کە زوڵمیان لەخۆیان کردبێ مەزرەعەکەیان خزمەت نەکردبێ، بە قووەت نەبێ، کە مقاومەی سەرما بکا ﴿فَأَهۡلَكَتۡهُۚ﴾ بەجاری سەرما بیبا، بەهیلاکی بدا، هیچی نەهێڵێ، ئەو قەومە ئەوی سەرفیان کرد خۆیانی پێ بەهیلاك چوون ﴿وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ﴾ جەنابی حەق زوڵمی لەوان نەکردیە ﴿وَلَٰكِنۡ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ١١٧﴾ بەڵام خۆیان زوڵمیان لەخۆیان ئەکرد. دەوامیان لەسەر ئەم حاڵە بوو. لە تتبعی کلامی بلیغ ئەزانین ئەو کەلیمە ئەگەر بچتە سەر فعل بە تخفیفی نون ئەخوێندرێتەوە، ئەگەر داخلی سەر إسم ببێ بە شەددە. لێرە خوێندنەوەی بە شەددە زۆر خۆش نی یە لە زەوق.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَتَّخِذُواْ بِطَانَةٗ﴾ کەس مەگرن بەدۆست و مەحرەمی ئەسرار بێ پەروا بێتە ماڵتان مداخلەی ئیش و کارتان بکا ﴿مِّن دُونِكُمۡ﴾ لە غەیری خۆتان لازمە لە اجانب زۆر بەر حەزەر بن (خاصة) ئەو مەلایانەی أجانب کە موسڵمان ئەبن تا تەجرەبەی أطواریان نەکەن لێیان ئەمین مەبن چ رۆم چ ئێرانی، کوردی ئەڵێ: ((دۆی ئازمودە لە ماستی نا ئازمودە چاکترە)) من نایێتە دڵم مەلایێك لە دینێك بۆ دینێ انتقال بکا لە غەلّ و غەشی دینی پێشوو قاڵ ببێتەوە ((الاّ بعد حین)) ذاتا تەفرەقەی کلّی میللەت لەوانە پەیابوو، ئەوانی هەم دین و هەم عنصری ئێوە نین. ﴿لَا يَأۡلُونَكُمۡ خَبَالٗا﴾ قسوور ناکەن لە حەق ئێوە. مەنعی نقصان و هیلاك و مشەققەت و کول بوون ناکەن، سەعی ئەکەن لە نقصتان بە هەموو مەعنای (خبال) سمی قاتلن، کێم و خوزاوکن، أعضا بە خۆرك ئەدەن عەقڵتان لێ ئەگۆڕن، لەو إفساداتە قووەتی

خۆیان سەرف ئەکەن ﴿وَدُّواْ مَا عَنِتُّمۡ﴾ مشەققەت و زەرەری ئێوە ئەجوبێنن پێیان خۆشە، ئێوە کەمێ انتباهتان هەبێ تێیان ئەگەن، هەرچەندی سیاسی بن خۆیان ناگرن، قسەی وایان لەزاری دەردەپەڕێ کە ما في الضمیریان بزاندرێ ﴿قَدۡ بَدَتِ ٱلۡبَغۡضَآءُ﴾ رق و قینتان لەئێوە بە حەققەت ئاشکرا بووە ﴿مِنۡ أَفۡوَٰهِهِمۡ﴾ لە زاریان ﴿وَمَا تُخۡفِي صُدُورُهُمۡ أَكۡبَرُۚ﴾ ئەو بغض و عەداوەت و رقەی کە سنگیان بزری ئەکا یەعنی لەناو دڵیان دایە گەلێ گەورەترو بەقووەت تر و بەشیددەت ترە ﴿قَدۡ بَيَّنَّا لَكُمُ ٱلۡأٓيَٰتِۖ﴾ طبیعي طبقاتی ئەهلی ئیمان لە فەراسەت وەك یەك نین تا هەمووتان بزانن لە علاماتی حب و بغض بەفیکر مافی الضمیری منافقان و سیاسیان و رؤسای دینان بزانن ﴿إِن كُنتُمۡ تَعۡقِلُونَ ﴿١١٨﴾﴾، بەلام أدنی عەداوەت لەگەڵ یەك عەقڵ تێك ئەدا وەك منداڵ دوای دوشمن ئەکەون، پەلاتقەو چاپلووسیی ئەو ئەو منافقانە هۆش ناهێڵێ و ئەگەر دڵیان بدەنێ، محبەتیان بێننە ناو دڵتان العیاذ بالله بەجارێ شێت ئەبن.

﴿هَٰٓأَنتُمۡ أُوْلَآءِ﴾ ئاگاداربن ئێوە ئەوەن ﴿تُحِبُّونَهُمۡ وَلَا يُحِبُّونَكُمۡ﴾ ئەوانتان خۆش ئەوێ، ئەوان ئێوەیان خۆش ناوێ ﴿وَتُؤۡمِنُونَ بِٱلۡكِتَٰبِ﴾ ئیمانتان هێناوە بە کُتُبی خوای ﴿كُلِّهِۦ﴾ هەموو بڕوا ئەکەم کە هەمووی لای خواوەیە، ئەوانی کتێبیان بۆ هاتیە پێغەمبەری خوان فەرقیان ناکەن، لەگەڵ پێغەمبەری خۆتان. ئەوان ئیمانیان بە پێغەمبەری ئێوە نی یە، سەعی لە إبطالي دینی ئەکەن، دەسەلاتیان هەبێ ئەی کوژن، ئێوە لەدین وەرئەگێڕن، ﴿وَإِذَا لَقُوكُمۡ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا﴾ کە تووشتان ئەبن ئەلێن ئیمانمان هێنایە ﴿وَإِذَا خَلَوۡاْ﴾ کە خۆبەخۆیی ئەکەونە خلوەت ئاگاتان لێیان نابێ ﴿عَضُّواْ عَلَيۡكُمُ ٱلۡأَنَامِلَ مِنَ ٱلۡغَيۡظِۚ﴾ ئەنگوستی خۆیان ئەگەزن لەرقی ئێوە، لە عەیبی ئێوە، الآنیش ئەو

حاڵە جاری یە، دیومە کەسێ روبەرووی کەسی پەلاتیقەی کردی یە، خۆی بەدۆست نواندی یە، کە پشتی کردیتەوە ئەنگوستی خۆی بەددان گەستی یە، بەچاوی رق تەماشای کردی یە، سەری لێ بادایە، ئاخ و ئۆخی هەڵکێشایە، ﴿قُلۡ مُوتُواْ بِغَيۡظِكُمۡۗ﴾ بفەرموو بمرن بە دەردی رقی خۆتان، شەق ببەن، تورەم بکەن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ١١٩﴾ خوا ئەوەی لەدڵان دایە ئەیزانێ، ئاگادارمانە، شوکر ئێمەیش عاقڵین بە (علایم) ئێوەو غەیری ئێوە ئەناسین، بڕواتان پێ ناکەین، بە تەزویراتی ئێوە هەڵ ناخەڵەتێین و جەنابی علام الغیوب جزای ئێوە ئەدا ﴿إِن تَمۡسَسۡكُمۡ حَسَنَةٞ﴾ ئەگەر چاکەیێ، نیعمەتێ بۆ ئێوە بێ پێتانەوە بنووسێ وەك إتحاد و ئولفەت و موحبەت بە سەرکەوتن ﴿تَسُؤۡهُمۡ﴾ عاجزیان ئەکا ﴿وَإِن تُصِبۡكُمۡ سَيِّئَةٞ﴾ ئەگەر خراپەیێ، نیعمەتێ إصابەی ئێوە بکا ﴿يَفۡرَحُواْ بِهَاۖ﴾ لەو إصابەیە کەیف خۆش و مەسرور ئەبن ﴿وَإِن تَصۡبِرُواْ﴾ خۆ بگرن، لە حەق پێ لە نەفسی خۆتان بنێن، قینتان لەگەڵ یەك نەبێ ﴿وَتَتَّقُواْ﴾ خۆتانیان لێ بپارێزن، ئاگادارین، ﴿لَا يَضُرُّكُمۡ كَيۡدُهُمۡ شَيۡـًٔاۗ﴾ حیلەو فیڵی ئەوان هیچ زەرەر بەئێوە ناگەیێنێ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِمَا يَعۡمَلُونَ مُحِيطٞ ١٢٠﴾ بەعەمەلی هەردوو لایان بە عیلم دەورەی داوە، هیچی لێ ناشاردرێتەوەو هیچ لاتان لەدەست قودرەتی ئەو دەرناچن.

قرائەتی (یا) و (تا) هەردووك لێرە رێکە، ئەگەر مومکین با بە یەك ئەدا ئەکرا، عیلم و قودرەتی پەروەردگار بە زەمان تەقیید ناکرێ لەو زەمانە زیاتر نەبی، بەڵام بعضاً بۆ بەیانی إحاطة بە جوزئیات زەمانێکی خاص ذیکر ئەکری بە مناسبەی مەقام. ﴿وَإِذۡ غَدَوۡتَ﴾ یادی ئەو وەقتەکە سبەینە دەرچووی ﴿مِنۡ أَهۡلِكَ﴾ لەلای ئەهل و ماڵی خۆت، ئەفەرموون لە حوجرەی عائشە بوو

﴿تُبَوِّئُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ مَقَٰعِدَ لِلۡقِتَالِۗ﴾ موسڵمانت دادەمەزراندن لەجێگای شەڕ، کوێندەری باشە بۆ پیادە لە تەپە وەردە، کێندەرێ چاکە بۆ سوارە بەگوێرەی إجابیاتی فەننی حەربی ئەو زەمان ﴿وَٱللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ١٢١﴾ چیتان ئەگوت ئەی بیست، چیتان ئەکرد ئەیزانی. ﴿إِذۡ هَمَّت طَّآئِفَتَانِ مِنكُمۡ﴾ ئەو وەقتە کە قەسدیان کرد دوو تایەفە لەخۆتان، هەردووك موسڵمان ﴿أَن تَفۡشَلَا﴾ بترسن بێهێز بن لە محارەبەی (ئوحد) کە قەرار درا بچنە دەر لەشاری، مخالفی رەئی (عبدالله بن أبی سلول) لەبەر ئەوە موافەقەی نەکرد، لە لەشکر جودا بووەوە، بەقیەی لەشکر ترسیان پێ گەیشت، خۆیان کەم قووەت دیت، خصوص مخالفە کەوتە بەین، منافقیش زۆر بوون لە کەید و خیانەتیان ئەترسان، دیارە لەو (همّة) معذور بووین، خوا لۆمەیان ناکا، تەشجیعیان ئەفەرموێ ﴿وَٱللَّهُ وَلِيُّهُمَاۗ﴾ ناصریانە، دڵ بەخوا ببەستن، بە مخالفەی منافقان بێهێز نەبن، نەترسن، ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ١٢٢﴾ ئەزانن کە ((كَمْ مِنْ فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللّٰه)) ئێوە مەعنای (توکل) چاکتر ئەزانن لە مەلایانی سەر کاغەز و منزەوی بێ تەجاریب. ئێوە لە بقیەی لەشکری طالوت کەمتر نین، دوعای نصرەت بکەن، (ربّنا ثابت قەدەممان بکەی، سەبرمان بەسەردا برژێنی).

﴿وَلَقَدۡ نَصَرَكُمُ ٱللَّهُ بِبَدۡرٖ وَأَنتُمۡ أَذِلَّةٞۖ﴾ لە حەربی بەدر خوا ئێوەی یاردی دا، غالب و مطفر بوون، ئەو وەقت ئێوە بێ دەسەڵات بوون، جەمعی کەم بوون، (أذلة) جمع القلەی ذلیلە. حقاً قورئانی کەریم کتابی حەکیمە، هەمووی هیدایەت و (عیبەر) و موعظەیە، تەماشا کەن ئەهلی ئینصاف وقایعی زەمانی صاحب وەحی بە حیکایەت ناهێنێ لە مەوقیعی مناسب رۆحی واقیعە ذیکر ئەفەرموێ نەوەك شاهنامە و کُتُبی منجسە و قەجج و بەجج بێنێ و بڵێ ئەوە

وەحی ی ئیلاهی یە. آلهي بشر بۆ وا بێ ئینصافانە بەناوی کتبی مقدسە مغرور بن بوفە ادنی کتابێ لە تأریخ چاتر لەکتبی مقدسە:

جای آنست کە خون موج زند در دل لعل

زین تغابن کە خزف میشکند بازارش

﴿فَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ خۆ بپارێزن، إعتماد بدەنە سەر خوا، ترس بەدڵ مەدەن ﴿لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ١٢٣﴾ لەسەر عاقبەتی سەبر و تحمّل و توکّل ﴿إِذۡ تَقُولُ لِلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ بۆ تقویە و تەشجیعیان و ئەهمیەت نەدان بە انحرافی منافقان ﴿أَلَن يَكۡفِيَكُمۡ أَن يُمِدَّكُمۡ رَبُّكُم بِثَلَٰثَةِ ءَالَٰفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ مُنزَلِينَ ١٢٤﴾ ئایا کفایەتی ئێوە ناکا، بەستان نی یە لە عنایەتی ئیلاهی کە إعانەتان بدا تەقویەتان بکا بە سێ هەزار مەلائیکەت بنێردرێنە سەر دوشمنتان (کأنە)ئەوانە بەپیادەیی بێن. خوا ئەفەرموێ ﴿بَلَىٰٓۚ﴾ ئەوە کافی یە ئەمما زێتریش هەیە ﴿إِن تَصۡبِرُواْ﴾ ثابت قەدەم بن ﴿وَتَتَّقُواْ﴾ لە مخالفە، لە ترس و بێهێزی ئەگەر قووەتی قەلبی خۆیان محافظة بکەن ﴿وَيَأۡتُوكُم مِّن فَوۡرِهِمۡ هَٰذَا﴾ بێن بۆ ئێوە بۆ سەر دوشمنەکانتان لەو ئانەدا یا لە حاڵی فەورانی ئەو قین و بغضێ کە هەیانە ﴿يُمۡدِدۡكُمۡ رَبُّكُم بِخَمۡسَةِ ءَالَٰفٖ مِّنَ ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ﴾ بەقەدەر أرکانی لەشکری عەرەب مقدمە و قلب و جناحین و کەمین گا ﴿مُسَوِّمِينَ ١٢٥﴾ وولاخی خۆیان بەرەڵلا کەن، جڵەویان باوێنە سەر ملان. جڵەو رێز بێنە مەیدان، صەفیان بدرن تا قەلب گاهیان رانەوەستن ﴿وَمَا جَعَلَهُ ٱللَّهُ﴾ وەعدی بەناردنی مەلائیکە نەدا، نەکرد ﴿إِلَّا بُشۡرَىٰ لَكُمۡ﴾ بەشارەت بۆ ئێوە بە نەسرەت و غەلەبە، مقصد لە ئیمداد نصرەتە، خوا وەعدی نصرەتی بەئێوە داوە (لاشك) ئەبێ، بەڵام خوا حەز ئەکا بە قووەت و سەعی و اتحادی خۆتان موەفقتان بکا ئەمە خۆیەتی، نە انتظاری ئیمداد لە لاڕا بکەن، خصوص لە روحانیانی غەیبی

ئەمە زۆر خراپە، جوولەکەیی یە قووەتی قەلبیان لە تابووت وەرئەگرت ئاخری کەوتنە قەبری زیللەت. ئەمما ئێمە لە جولەکەکانمان تێ پەڕاند، جەهالەتی موسڵمانان بەسایەی ئیمان بە کەرامەت گەیشتە دەرەجەیی لایان وابوو تۆپی (کەل)ی بەغدا خۆی ئەچێتە شەڕ، خۆی خۆی ئاگر ئەدا لەشکری دوشمن ئەشکێنێ. (ماشاء الله) لە کەراماتی حەزرەتی شێخ.

﴿وَلِتَطْمَئِنَّ قُلُوبُكُم بِهِۦ﴾ هێشتا حسیاتی قووەتی مادده لەسەر ئێوە هەیە بۆیە جەنابی حەق ئیمدادی خۆی تصور کرد بە ناردنی مەلائیکەت بە عەدەدی زۆر، سوارەو پیادە ﴿وَمَا ٱلنَّصْرُ إِلَّا مِنْ عِندِ ٱللَّهِ﴾ بە قووەتی ئیمان هەم دڵی صبر و متانەت و صلابت ئەوانەن مەلائیکەتی ڕاستی، ئەو روحانیەت و معنویاتە ئەبێتە وەصفی ذاتی نەفسی بۆ ئێوە لەشکری حازر و ئامادەیە ئەمە نەبێ ئیمدادی خارجی کەڵك ناگرێ! نابینن خوا ئەوەی کردە شەرت بۆ ناردنی مەلائیکەت.

(إن) شەرطی حقیقی و فطرییە: بەس ئێوە إعتمادتان لەسەر ئیمان و نەفسی خۆتان بێ بەو قووەتە ئەتوانن قووای مادی لەجێی خۆی سەرف بکەن، آلاتی حەربی با بگاتە نهایەتی قووەت و مەتانەت و شیددەت و سورعەت کە کەسێ نەبێ بە عیلم و فەن أستعمالی بکا هیچ نی یە زێدە بارگرانی یە.

﴿ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَكِيمِ ١٢٦﴾ بە قووەت و حیکمەتی خۆی تەسخیری قووای تەبیعەتی کردی یە، عیززەتی بێ حیکمەت ئیش تێکدەدا. قووەت نەکەوێتە ژێر إنتظامي عیلم وەك سێڵاو دنیا وێران ئەکا إستفادەی لێ ناکرێ، بە عیززەت و حیکمەتی خۆی غالبتان ئەکا بە عەلەبەیی نافع بۆ عیباد. ئێوە (خير الأمة)ن ئەبێ حەربیشتان بۆ نەفعی عالەم بێ و محقق بزانن عاقیبەت بۆ ئێوەیە لەسەر دوشمن غالب ئەبن. خوا ئەیان کا بە چوار قسم. اساساً دوو قسمن، قسمێك

اصلاً راساً محارین لەگەڵ ئێوە، قسمێك لە تەرەفێ هاتووە إلتحاقی بە ئەوان کردووە هەریەك لە مغلوبی ئەبن بەدوو قسم، نصرەتی ئێوە بۆیێ یە.

﴿لِيَقْطَعَ طَرَفًا مِّنَ الَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾ تەرەفێ لەو کافرانە ببڕێ مستأصلیان بکا بە هیلاکیان بدا مەحوو نابوود ببن. ﴿أَوْ يَكْبِتَهُمْ﴾ یا لەعاردیان ئەدا رەزیلیان ئەکا، دڵیان دەردەدار ئەکا (کأنه) عیللەتی (کبد)یان تووشی ئەبێ قطعاً ناتوانن حەرب بکەن، ئەمە بۆ ملحقات ئاخری لە (بني نضير و بني قريظة) دەردەکەوێ. ﴿فَيَنقَلِبُواْ خَآئِبِينَ ﴿١٢٧﴾﴾ خەسارەت مەند، مەئیوس لە ئەمەل.

﴿لَيْسَ لَكَ مِنَ الْأَمْرِ شَيْءٌ﴾ لەو ئەمرە حوکم عائدی ئێوە نی یە ئەمە دەبێتە تەحکیم هەرکەس بەحوکمی حەکەمی خۆیان رازی ئەبن. دوو قسمەکەی دی ﴿أَوْ يَتُوبَ عَلَيْهِمْ﴾ موسڵمان ئەبن تۆبە ئەکەن خودای تەعالا لێیان خۆش ئەبێ با سەد جار شەڕیان لەگەڵ تۆ کردبێ ئەوە أعظمی مقصدی تووە زۆر پێ خۆشحاڵ ئەبێ.

﴿أَوْ يُعَذِّبَهُمْ﴾ ئەوانە ئیمان ناهێنن، تۆبە ناکەن، خوا عەزابیان ئەدا لەدنیاو لە قیامەت مستحقن. ﴿فَإِنَّهُمْ ظَالِمُونَ ﴿١٢٨﴾﴾ واز ناهێنن لە زوڵم و تەجاووز لە حەد ﴿وَلِلَّهِ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ﴾ کێ توانای مقابلەی هەیە تەغییری حوکمی بدا إعتراضی لێ بگرێ ﴿يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ﴾ با لە وەقتێك دا (ألدّ)ی دوشمنانی پێغەمبەر بووبێ ﴿وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ﴾ با لە ئەقرەبی ئەقاریبانی بێ، خوا لەبەر کەس کەسی خۆش ناوێ، لەبەر کەس رقی لە کەس نابێتەوە، ئەهلی تەقوای خۆش ئەوێ (ولو) بعد الكفر بێ، ئەهلی زوڵم و کفری خۆش ناوێ (ولو) بعد الايمان بێ ﴿وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٩﴾﴾ غوفران و رەحمەتی ئەو عامە دەرحەق (برّ) و فاجر شەرتە خۆیان مەحروم نەکەن. لێرە جێی نی یە بڵێن ((لَيْسَ لَكَ مِنْ الأَمْرِ شَيْءٌ)). ئەمە مەعلومە لە چەند ئایات زانانـدرا، لێ

خۆش بوون و عەزاب دان صرف ئیشی خوایە تەوەهومی شرکەت ناچێ، بەلام لەپێشوو إخبارێکی غەیبی تیابوو مع الاسف مفسرەکانیش نەیان زانی هەرکەس بیێ بەیانی ئەکا، رەملێکی لێ ئەهاوێ، پاش تأملی زۆر ئێمە بەو نەوعەمان بەیان کرد لله الحمد. مادام ئیمانتان کە حەزرەتی باری رەحمەتی عامە ئێوەش رەحم بکەن، خاصە بە ئەوانەی زراعەت و فەلاحەت ئەکەن مەجبور ئەبن قەرز بکەن، ئێوە بە قەرزی حەسەنە دەستیان بگرن، ئیشیان پێك بێنن.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَأْكُلُواْ ٱلرِّبَوٰٓاْ أَضْعَٰفًا مُّضَٰعَفَةً﴾ ئێوە وەك بەنی إسرائیلی چ بەهانەتان بە دەستەوە نیە، لە قورئان لە حدیث، ئەوا پێغەمبەر خۆی بەر حەیاتە چی واتان پێ نالێ (ولو بە تأویل و تحریف) کە دنیا بۆ ئێوەیە خەلکی حەقی نیە بەهەر جۆرێ مالتان بێتە دەست بۆتان حەلالەو هەم ناتوانن وەك زەمانی جاهلیەت بلێن ربیاش وەك بیعە مباحەو بە وەسوەسەی ئیبلیس نەخەلەتێن بلێن بۆ جهاد مالێ کۆ ئەکەینەوە سەرفی ئەکەین فی سبیل الله ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ لە ربیاو سوابقی ﴿لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿١٣٠﴾ وَٱتَّقُواْ ٱلنَّارَ ٱلَّتِىٓ أُعِدَّتْ لِلْكَٰفِرِينَ ﴿١٣١﴾﴾ خۆتان بپارێزن لە أعمالی کافران تا نەچنە ناو ئاگرێ کە ئامادەکراوە بۆ کافران –من تشبه بقوم فهو منهم– ﴿وَأَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ﴾ –من حیث هو رسوله– إطاعەی رەسول إطاعەی مرسله ﴿وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغْفِرَةٍ مِّن رَّبِّكُمْ﴾ مسابقە بکەن بۆ ئەسبابی لێ خۆش بوون، پێ خۆش بوون لە تەرەف خوای خۆتان ﴿وَجَنَّةٍ عَرْضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلْأَرْضُ﴾ غار بدەن بۆ لای بەهەشتێ کە پانایی بەقەدەر پانایی ئاسمان و ئەرزە، تەنگ نی یە هەر جێی جوولەکەکانی تیا ببێتەوە یا ئیی دیانان. جێی هەموو عالەمی لێ ئەبێتەوە ئینسانی ئەوێ کە بۆی بچێ. یاخود ئەوەش مەزاتی قیمەتی ئاسمانان و ئەرزە وەك (ئەبو مسلم) ئەفەرموێ، حقیقە مەعنایی زۆر جوانە، ﴿أُعِدَّتْ

﴿لِلْمُتَّقِينَ ﴿١٣٣﴾﴾ مومکینە موسڵمان بە مسامحەی دوو قرانان ئەو بەهەشتە قیمەتدارە چەنگ بکەوێ. ﴿ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ﴾ لە وەقتی کەیف خۆشی و عاجزی، هەرزانی و گرانی، سلم و حرب، ساغی و ناساغی، جحێڵی و پیری، شین و شایی ﴿وَٱلْكَـٰظِمِينَ ٱلْغَيْظَ﴾ سەورەو شیدەتی رقی خۆیان حەپس ئەکەن و ئەیبەستن بە قووەتی صبر و تحمل. ئەسڵی (کظم) بەستنی زارکی کوندەی پڕە ﴿وَٱلْعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِ﴾ کە قودرەتیان بەسەر دوشمندا شکا عەفوی بکەن، قینیان لە زگ نەبێ، عەداوەتی آباء نەکەنە موجبی عەداوەتی خۆیان ، بەکفری سابق لەزەمانی ئیمان معاتبە و معاقبەیان نەکەن چۆن خوا عەفوویان ئەکا، ئەوانیش عەفوویان ئەکەن، سیئاتی زەمانی کفر بەدڵدا ناهێنن.

﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٣٤﴾﴾ ئەگەر حەزئەکەن خوا خۆشی بوێن چاکە بکەن ﴿وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا۟ فَـٰحِشَةً﴾ جوێن بەکەسێك بدەن خراپەیی لەحەقی بکا ﴿أَوْ ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ﴾ یاخود زوڵمی لە حەق نەفسی خۆی کردبێ، تەربیەی چاکەی نەدابێ، فێری خووی خراپی کردبێ. لەخووی ناشیرین ﴿ذَكَرُوا۟ ٱللَّهَ﴾ یادی خودا ئەکەن، تفکر لە صفاتی مقدسەی خوداو جەلال و عظمتی ئەکەن.

﴿فَٱسْتَغْفَرُوا۟ لِذُنُوبِهِمْ﴾ تەلەبی مەحوو ستری گوناهی خۆیان ئەکەن، هەر نەوعێ بێ لەبەر خراپی و پیسی گوناه لەخۆ ئەزانن. هەر ئەو لە گوناه خۆش ئەبێ، ئەسەری لەدڵان نایێڵێ. ﴿وَمَن يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ﴾ کەسێ وابزانێ غەیری خوا کەس عەفووی گوناهی پێ ئەکرێ گوناهکارێکە قابیلی عەفوو نییە.

﴿وَلَمْ يُصِرُّوا۟ عَلَىٰ مَا فَعَلُوا۟﴾ جارێ کردیان نای کەن بە دوو جار ﴿وَهُمْ

﴿يَعۡلَمُونَ ۝١٣٥﴾ ئەزانن ئەوی كرووپانە گوناهە، نەك گوناه بەخێر بزانن ئەوانە قابیلی تۆبە نین، ئەوجا بەو عیلمە متأثر ئەبن تەركی گوناه ئەكەن، ﴿أُوْلَٰٓئِكَ جَزَآؤُهُم﴾ ئەوانە جزاو پاداشتیان ﴿مَّغۡفِرَةٞ مِّن رَّبِّهِمۡ﴾ لە تەرەف خوا عەفو ئەكرێن ﴿وَجَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ گەلێ باغی كە لە ژێر دارەكانی جۆبار ئەڕوا ﴿خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ﴾ دەرناچن لەو بەهەشتانە ﴿وَنِعۡمَ أَجۡرُ ٱلۡعَٰمِلِينَ ۝١٣٦﴾ بەهەشت ئەجری باشە بۆ ئەوانەی عەمەلی باش بكەن.

دیارە ئەوەی ئیشی پێ پێك بێ كەڵكی بگرێ خاصە لەو نەوعە وەقتە ئەو دوو نەوعە موسڵمانەن. ئەو فاسق و فاجر و مخّاش و لعّان و زنّا و ریباخۆر، لە غەزا هەڵاتوو نەجارێ نە دوو، نامطیعی قوماندان، قین لەزگ، ثقیل تۆبە بكا كە هیچ كەڵكی پێوە نەما لەحاڵی یەئس و بێهێزی باس ناكەین یا بۆچەكبردە چەكبردەی موعتەزیلەو ئەهلی سوننەت و جەماعەت بێ شەڕ و دەعوای لەسەر بكەن ئاگایان لە ئەسڵی دوشمنی دین و دنیا نەمێنێ، لاشك ئەو نەوعە گوناهكارانە زەرەریان بۆ هەیئەتی اجتماعی وەتەن لەكافران زیاترە، واجبە لەسەر موسوڵمانان إزالەیان بكەن یاخوا هەزار جار لێیان خۆش بێ، بیان خاتە أعلی علّیێن لە خزمەت شێخی (أشعری) و شێخی (ماتُریدی). ﴿قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِكُمۡ سُنَنٞ﴾ گەلێ قواعد تێ پەڕی لەپێش ئێوە، (ثابِت) و (مُقرّر) بوو، (أسباب)ی (غالبیّ) و (مغلوبی)، (دوام) و (انقراض)، (نجات) و (هلاك) بۆ (أهل)ی (عبَر) زاندرا، (أثر)ی (إیمان)ی بە (قوّەت) و بێ (قوەت) (معلوم) بوو ﴿فَسِيرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ تەماشای (سیر)ی (أقوام)ی پێشی خۆتان بكەن ﴿فَٱنظُرُواْ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُكَذِّبِينَ ۝١٣٧﴾ (تفكّر) بكەن، بزانن (عاقبەت)ی ئەوانەی (تكذیب)ی پێغەمبەرانیان كردیە، چیان بەسەر هاتیە؟ (وكذا) ئەوانەی دەرگەی گوناهیان كردیتەوە، بەئومێدی (توبە) و (شفاعەت)، (رۆسا)ی (دین)

چۆن (إنتظام)یان تێك چوو؟! كارەكیان بەسەرهات، نە بەسەر (دیان)ان هات، نە بەسەر جوو ﴿هَٰذَا بَيَانٌ لِّلنَّاسِ وَهُدًى وَمَوْعِظَةٌ لِّلْمُتَّقِينَ ۝١٣٨﴾ (تقرّر)ی (سُنن) ئاشكرایە، بۆ هەموو كەس، (أمّا) هەموو كەس لە (روح)ی (وقایع) ئاگا وە گەلێ (حمل)ی ئەكەنە سەر (أمور)ی (غیبیّە)یە، كە (إكتساب)ی بۆ خەڵك ناكرێ، (أمّا) بۆ ئەوانەی (مُتّقی) بن، خۆ بپارێزن، بەچاوی (عبرەت) تەماشای (أحوال)ی (أمم) بكەن، چۆن (تشكّل)یان كرد؟ چۆن (غالب) بوون؟ (زیاد)یان كرد؟ چۆن راوەستان؟ لە (بَین)ی (ترقّی) و (تَدنّي)، چۆن پاش بلّندی ئەوی بوون؟ چۆن برانەوە؟ (قیامەت)یان لێرابوو، (سفیل) و سەرگەردان بوون، ئەبێتە (هدایەت) رێی راست ئەدۆزنەوە، (سلوك)ی ئەكەن، ئەی كەنە پەندی خۆیان، (كأنّە) (حوادثات)ی (زەمان)ە، (نصیحەت)یان ئەكا، ئەوانیش لەگوێی ئەگرن (عمل)ی پێ ئەكەن، لەسەر (تعالیٰ) و (عزّەت) (دوام)یان ئەبێ ﴿وَلَا تَهِنُوا وَلَا تَحْزَنُوا﴾ بە (انحراف)ی (مُنافق)آن، بە شكستەیەكە بەسەرتان داهات ﴿وَأَنتُمُ الْأَعْلَوْنَ﴾ئێوە بە (هیمّەت) لەوە بلّندترن، كە بێهێز بن، غەمگین بن ﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ۝١٣٩﴾ ئەگەر بە (حەقیقەت) (إیمان) دار بن، خۆتان بە (خوارق) و (ملائكە) هەڵنەخەڵەتێنن، شت بزانن، لەسەر (حالّ)ی (حقیقەت)ی خۆی ﴿إِن يَمْسَسْكُمْ قَرْحٌ﴾ ئەگەر برینێ لەئێوە بگا، مەترسن، (مأیوس) و بێهێز و (عاجز) مەبن ﴿فَقَدْ مَسَّ الْقَوْمَ قَرْحٌ مِّثْلُهُ﴾ ئەو (قوم)ی (معهود) كە لە (بدر) شكان، بریندار بوون، لە برینێ وەك برینی ئێوە، (مع هذا) (غیرەت)یان (زیاد) بوو، (حتّی لَذائذ)یان لەخۆ (حرام) كرد، تا (إنتقام)یان كردەوە، ئێوەش (علی الاقل) وابن با (وُجود)ی (وصف)ی (جهاد)ی ئێوە بۆ (إعلا)ی (دین)ی (حقّ)ە بۆ گوشادی رێی راستە ﴿وَتِلْكَ الْأَيَّامُ نُدَاوِلُهَا بَيْنَ النَّاسِ﴾ نە (ظفر) نە شكست، (خاصّ)ی (دەولەت)ێ، (ملّەت)ێ نیە، ئەو (أيّام) و (أوقات)ە، (جناب)ی (حق) ئەودەست و ئەم

دەستی پێ ئەکا، لە (بین)ی (إنسان)، (کافر)، (مؤمن)، (صالح)، (فاسق)، مەڵێن: "(مادام) (مسڵمان)ین، وە لە (خدمەت) (صاحب) (رسالەت)ین ئێمە هەر (غالب) ئەبین، (قط) (مغلوب) نابین." زۆر نەزیکە، پاش (فتح) و (ظفر)ی (بدر) ئەو (فکرە)یان بۆ پەیابوویێ، (ذاتاً) ئەو (نوع)ە خەیاڵاتە شکستی دا بە (مسڵمان)آن، (عبرەت)یان نەگرت، بەقسەی (خائن)آن فریتەبوون هەرچی بوو، دایانە (هیمّەت) و (کرامەت)، تا ئەوەمان بەسەرهات، کە (صحائف)ی (تأریخ)مان ڕەش بوو، ئەوەمان کرد، بۆ (نفع)ی ئێوە ﴿وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ الَّذِينَ ءَامَنُوا﴾ (إمان)ی بەڕاستی لە (شدائد) بەدەر ئەکەوێ، خوا (قبل الوقوع) ئەزانێ، (لكن) بە (إمتحان) بۆ هەموو کەس بەدەرئەکەوێ، کە ئەوەبوە، بۆ (أقوام)ی رابردوو ﴿وَيَتَّخِذَ مِنكُمْ شُهَدَاءَ﴾ (أُمنا) و (حُفّاظ) هەڵ بژێرێ، (إختیار)یان بکا، بۆ خۆی، ﴿وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ الظَّالِمِينَ ﴿١٤٠﴾﴾ ئەوەی لە (إیمان)یش (تجاوز) بکا، خوا خۆشی ناوێ، چونکە لە (حقّەت)دا ئەبێتە بێ (إیمانی) ئەوەی لە (حد) تێپەڕێ، وەك ئەوەیە نەگاتە (حد) ﴿وَلِيُمَحِّصَ اللَّهُ الَّذِينَ ءَامَنُوا﴾ قالیان بکاتەوە ﴿وَيَمْحَقَ الْكَافِرِينَ ﴿١٤١﴾﴾ ئەوانەی (ستر)ی (حق) ئەکەن، بەلاف و گەزاف خۆیان، لە (اقویا)ی (ملّەت)، (ملاذ)ی (أمّەت) پشت و پەناهی (دین) و (دەولەت)، خاوەنی (قُوّەت) و (قُدرەت) (صاحب)ی (هیمّەت) و (کرامەت)، مەردی مەیدان، شێری ژیان، شمشێری بوڕان، (حساب) ئەکەن، خوای (تعالی)ن (محو) و نابوودیان بکا لەساڵی بۆنباران، پێشی (واقعە) گەلێکم هاوارکرد، گوێیان نەدامێ. ئەیان گووت: (طیّارة) وەکو کۆلارەیە، (غایەت)ی جیقنەیەکی بەردایەوە، پاشان کە هات، یەك دوو بۆمبای بەردایەوە، تەق و شەق کەوتە ناو شار، (عالم) هاتە هەژان، ئەوانە بۆ کونان، وایان هەر ڕائەکرد، (بابانیم) تۆزی پێ ی نەدەشکاندن، کوردی ئەڵێ: "قسەی بەرناگردانێ لەکێ؟ تاوی بەرازی لەکێ؟!" ئایا ئێوە لەو (عبرەتە) نە(فکری)ن؟ ﴿أَمْ حَسِبْتُمْ أَن

تَدۡخُلُواْ ٱلۡجَنَّةَ ﴾؟ یا واتان (حساب) کرد، دەچنە بەهەشتیّ، (سَلَّمهُ السَّلام)، ئایا ئەو (آیەت)ەی (سورە)ی (بقرە)تان لەیاد چوو؟ ﴿وَلَمَّا يَعۡلَمِ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ جَٰهَدُواْ مِنكُمۡ ﴾ هێشتا خوا نەی زانیە، ئەوانەی (جهاد) و (سعی) و (غیرەت) کەشی ئەکەن، (تمیین) و (تفریق)ی نەکردیە، لەوانەی بیّ (سعی)ن، زۆر خۆیان ماندوو ناکەن، گورج ڕوو وەرئەگێڕن ﴿وَيَعۡلَمَ ٱلصَّٰبِرِينَ ١٤٢﴾ ئەوانەی (صابر)ن، بیانزانیّ، زیرا بە (حرب)ێك ئاشکرا نابیّ، (تحمّل) و (رسوخ)ی (قدم)یان دەرناکەویّ ﴿وَلَقَدۡ كُنتُمۡ تَمَنَّوۡنَ ٱلۡمَوۡتَ ﴾ ئارەزووی مردنتان ئەکرد، ئەتان گووت: "خۆزیا کوژرابایین، وەکوو ئەوانەی لە (بدر) کوژران" ﴿مِن قَبۡلِ أَن تَلۡقَوۡهُ ﴾ لەپێش ئەوە کە تووشی بن، (أهوال) و (شدائد)ی (حرب)تان نەدیبوو. کە (حرب)ی (طرابلس)ی (غرب) دامەزرا، لە (بین)ی (دەولّەت)ی (عثمانی) و (إیطالیا)، گەلیّ کەس لیّرە خۆیان (قەید) ئەکرد خۆیان ئەخواردەوە، لە (حسرەت)ان (قصد)یان هەبوو، لە کۆیەوە بە یەك (غار) هەلّ کوتنە سەر (رۆما)، کە (حربی) (عومی) داکەوت، (أحوال)ی (حرب)یان دیت، چیان ئەکرد؟ چۆن لە چۆل و (صحرا)، لە لادیّیان، لە شاخان خۆیان ئەشاردەوە چەندیان (ڕشوەت) دەدایە، (جەندرمان)، کە تووشیان بوون، نەیان گرن، کە (ڕووس) هاتە (ڕەواندوز) گەلیّ سەرسپی بە (مەترەق) ڕۆیشتن بۆ سەر لەشکری (ڕووس)، کە (صعیقە)ی تۆپ و تەقەی تەقینەوەیان گویّ لیّ بوو هەرکەس وەکی ڕێوی کلکی بەناو گەلّانی شۆڕ بۆوە، هەلّاتن، هاتنەوە ﴿فَقَدۡ رَأَيۡتُمُوهُ ﴾ بە (مُوافقە)ی (تمنّا) و ئارەزوی خۆتان ﴿وَأَنتُمۡ تَنظُرُونَ ١٤٣﴾ چاوساغ و بیّ (علّەت)، بەچاوی خۆتان دیتتان، ئەدی بۆ هەلّاتن؟ چونکە (خبر)تان بیست، کە پێغەمبەر کوژراوە ﴿وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ ﴾ (إنسان) بە (رسالەت) بە (ولایەت) بە خۆشەویستی لای خوای، لە (إنسان) ناشۆڕیّ،

(أحوال)ی (طبيعي) ناگۆڕێ، (شێخ) گوله تۆپ وەك تۆپه چەرمینی نان نانی ناگرێتەوه ئەمرێ وه (قابل)ه بکوژرێ ﴿قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِهِ ٱلرُّسُلُ﴾ تێپەڕین لەپێش ئەوی چەند پێغەمبەر، (بعض)ێ به کوشتن، (بعض)ێ به مردن. لەو (آيات)ی رابردوو نەتان بیست؟ که خوا (عتاب)ی له جووله‌کەکان گرت، به (قتل)ی (أنبيا) یان ﴿أَفَإِيْن مَّاتَ أَوْ قُتِلَ ٱنقَلَبْتُمْ عَلَىٰٓ أَعْقَٰبِكُمْ﴾؟ ئایا ئەگەر (وفات) بکا یا بکوژرێ، دەر(حال)ێ ئێوه ئەکشێنەوه؟ یا (غیرەت)تان (زیاد) ئەکا وه تۆڵەی ئەستێنن ﴿وَمَن يَنقَلِبْ عَلَىٰ عَقِبَيْهِ﴾ ئەوەی بگەڕێتەوه لەسەر هەردووپاژنەی، بێ (توقّف) و (تردّد)، (مِن غيْرِ أنْ يُقدِّمَ رِجلاً ويؤَخِّر أُخرى) ﴿فَلَن يَضُرَّ ٱللَّهَ شَيْـًٔا﴾ هیچ (ضرر) بەخوا ناگەیەنێ، بەڵام زۆر بێ (غیرەتی) و بێ نمەکی یه، ئەو سەرداره نازداره بکوژرێ، خۆی هەڵێ وه (نجات)ی (نفس)ی خۆی بدا، ﴿وَسَيَجْزِى ٱللَّهُ ٱلشَّٰكِرِينَ ﴿١٤٤﴾﴾ ئەوانەی ئەمەکدارو (وفا)دارن، پاش ئاغای خۆیان سەری خۆیان ناوێ، (روح)ی خۆیان بەخت ئەکەن خوا (جزا)یان ئەداتەوه ﴿وَمَا كَانَ لِنَفْسٍ أَن تَمُوتَ إِلَّا بِإِذْنِ ٱللَّهِ﴾ کەس نامرێ (إلاّ) به (إذن) و (رضى)ی خوای (من حيث الخلق والإيجاد)، هەموو کەس یەکسانه، بۆ کەس نیه، بێ (إذن)ی ئەو بمرێ، (إنسان) وەك (سائر)ی (حيوانات) (دائماً) (معرض)ی مردنه ﴿كِتَٰبًا مُّؤَجَّلًا﴾ (حيات)ی (كُلّ)ی (نفس)ێ له ئێوه یا (حيات)ی (دنيا)، (حيات)ێ (مقرّره)، (مؤجلة)، (محدوده) به (زەمان)ێ هەر ئەبڕێتەوه، با زۆریش درێژ بێ، هەزار ساڵ بژیه، (عاقبەت)ی هەر مردنه، (أمّا) وەك کوردی ئەڵێ: "کەم بژیه، کەڵ بژیه"، ژینی به (رذالەت) و (اسارەت) و (عُبوديەت)ی (عمرو) و (زيد)، چ خۆشیەکی تێدا نیه. ئەوانی (غیرەت) دارین، مردنی به (عزّەت) و (شرف)یان پێ خۆشتره له ژینی به (ذلّەت) و سووکایەتی ﴿وَمَن يُرِدْ ثَوَابَ ٱلدُّنْيَا﴾ ئەوی (ثواب)ی

(دنیا)ی ئەوێ، کە ژینێ (دنائەت)ی ﴿نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَا﴾ وەك کوردی ئەڵێ: "حیزی و سەلامەتی!" ﴿وَمَن يُرِدۡ ثَوَابَ ٱلۡأٓخِرَةِ﴾ ئەوی (ثواب) و (نعمەت)ی (قیامەت)ی بوێ ﴿نُؤۡتِهِۦ مِنۡهَاۚ وَسَنَجۡزِي ٱلشَّٰكِرِينَ ١٤٥﴾ ئەگەر لە (دنیا)ش نەبێ، لە (قیامەت) ئێمە (جزا)ی (شاکر)آن، وەفاداران، (حُقوق) پەروەردان ئەدەین ﴿وَكَأَيِّن مِّن نَّبِيّٖ﴾ چەند لە پێغەمبەرانی (عظام) (حرب)یان کردیە هیچیان، تەنها پێغەمبەری (سلم) نەبووین، ئەوی لەدەستی هاتبێ (حرب)ی کردوە، (حرب) (آخر الدّوا)یە وەك داغ کردن ﴿قَٰتَلَ مَعَهُۥ رِبِّيُّونَ كَثِيرٞ﴾ (ظاهر) وایە (ربّانیّون) بۆ (رُؤسا)ی (دین) و (مُعلّم)ی (شرائع) بێ، (رِبّیّون) (علما)ی (حرب) بن، (جمع)ێ زۆر لە (رجال)ی (مُدرّب) و (مُجرّب)، (إیمان) بە (قُوّەت) لە (خدمەت) پێغەمبەری (عصر)ی خۆیان، (شەڕ)یان لەگەڵ دوژمن کردیە، بەسەریش کەوتوون، بەژێریش کەوتوون ﴿فَمَا وَهَنُواْ لِمَآ أَصَابَهُمۡ﴾ سست نەبوون، لەبەر ئەوەی تووشیان هاتووە ﴿وَمَا ضَعُفُواْ﴾ نە لە (إعتقاد نە لە (سعی) بۆ (نیل)ی (ظفر) و (أخذ)ی (إنتقام)، (فتور)یان نەبوە، وچانیان نەدایە ﴿وَمَا ٱسۡتَكَانُواْۗ﴾ سەرشۆڕیان نەکردوە، بۆ دوژمن، لە (حرکە)ی دلێرانە، نەکەوتوونە (سکون)ی ترسنۆکی، ئێوە لەوان کەمترن؟ نا ، ئێوە (خیر)ی (أمّەت)ن، (قوم)ێ بە (شرف) و (عزّەت)ی (نفس) و (غیرەت)ن ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلصَّٰبِرِينَ ١٤٦﴾ (حَظ) ناکەن، خوا ئێوەی خۆش بوێ؟ ﴿وَمَا كَانَ قَوۡلَهُمۡ إِلَّآ أَن قَالُواْ﴾ لە (شِدّەت)ی (حرب) لەگەڵ دوژمنی (قوی)تر لەخۆیان گەلێ زۆرتر، قسە هیچ نەبوو، (إلاّ) ئەوە نەبێ ئەیان فەرموو: ﴿رَبَّنَا ٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا﴾ لەگوناهمان خۆش بە ﴿وَإِسۡرَافَنَا فِيٓ أَمۡرِنَا﴾ لە (تجاوز)مان ببوورە، (شأن) و (حال)ێ (عمداً) ئەگەر لە سنوور چووبینە دەرێ، (عفو)مان بکە، لەو

(سعی)و کۆششە، خۆیان بە (مُقصّر) ئەزانی ﴿وَثَبِّتۡ أَقۡدَامَنَا﴾ روو بە رووی دوشمن، بە (قوّەت)ی (إیمان) راوەستاومان کە، دوو لاقمان راگیر کە، لەجێ نەچن ﴿وَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ١٤٧﴾ (ذاتاً) (اخر)ی (دُعا)ی ئێوە لە (آخر)ی (سُور)ی (سابقە) ئەو (نوع)ە بوو ﴿فَـَٔاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ ثَوَابَ ٱلدُّنۡيَا﴾ خوای (تعالی) (أجر)ی (دنیا)ی پێ (کرم) کردن (غالب) بوون، (إستیلا)ی (دار) و (دیار)ی دوشمنیان کرد، ناوو ناوبانگیان دەرچوو، (مالّ)ێ زۆریان پێ برا ﴿وَحُسۡنَ ثَوَابِ ٱلۡأٓخِرَةِۗ﴾ (ثواب)ێکە، (ثواب)ی (دُنیا) لەسەر ئەو هەموو (قیمەت)ە، (نظر) بەوە (حُسن)ی نیە، (دائم)ە، (لاینقطع)ە، وە (ممکن)ە بڵێین: "ئەو (ثواب)ە (حسن)ە، لە (ثمرة)ی ئەو (ثواب)ی (دنیا)یە، (محصول)ی ئەو (تخمین) کرا، ئەوە (تقدیر)و (تصویر)ی (حُسن)ی ناکرێ، لام وایە ئەوە باشترە، چونکی (غلبە) لەسەر دوژمنی (دنیا) و (دین) (قیاس) لەهیچ (نعمەت) ناکرێ، (أمّا) ئەگەر (مُراد) پاتالّ و ماتالّ بێ، چی وا نیە بەجوان (حساب) بکرێ". ئەو (حُسن)ی (ثواب)ە، (جزا)ی (إحسان)یانە ﴿وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٤٨﴾ ئێوەش بەو جۆرە (إحسان) بکەن، تا خوا خۆشی بوێن. ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تُطِيعُواْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ ئەگەر (إطاعة)یان بکەن، بە (وسوسە)یان هەڵبخەڵەتێن ﴿يَرُدُّوكُمۡ عَلَىٰٓ أَعۡقَٰبِكُمۡ﴾ پاشەوپاش ئەتان گێڕنەوە، هەتا دێنەوە (أوّل)تان ﴿فَتَنقَلِبُواْ﴾ وەردەگەڕێن ﴿خَٰسِرِينَ ١٤٩﴾ (خێر)ی (دنیا) و (آخرەت)تان لەدەست دەڕوا ﴿بَلِ ٱللَّهُ مَوۡلَىٰكُمۡۖ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلنَّـٰصِرِينَ ١٥٠﴾ ئەو (کافر)انە (نصرەت)ی ئێوەیان پێ نادرێ، لە (أولیا) (حساب) نین، خوا (ولیّ) و (ناصر)ی ئێوەیە، ئەو چاترین (مُعین) و (ناصر)تانە (ذاتاً) خۆتان لە (اخر)ی (سُور)ی پێشی ووتتان: (أنتَ

مَوْلَاَنَا) (شُبه) مەکەن، (دُعا)تان (قبول)ە، (نصرەت) بۆ ئێوەیە ﴿سَنُلْقِي فِي قُلُوبِ الَّذِينَ كَفَرُوا الرُّعْبَ﴾ هەر (قوم)ێ بیەوێ (حَرب) بی، ئەبێ (غایەت)ەکی هەبێ ئەوەندەی (مقصود) بی، ئەوەندەی (میل)ی بە دڵ و (روح) لەگەڵ بێ، کە لە ئۆغری (نفس)و(نَفیس) (صرف) بکا، کە ئێستا (تعبیر)ی ئەدەنەوە، بە (مثل)ی (أعلی) و ئەو (غایەت)ە ئەبێ (غایە)ی هەموویان بێ، کە بە یەك (قوّەت) بۆ (تحصیل)ی تێ بکۆشن، (تفرقە)یان نەبی، (غایە)ی ئێوە (تحصیل)ی (رِضا)ی خودایە، بۆ (إعتلا)ی (بَشر) و ئازادی، لە (ذلّ)ی (عُبُودیّەت)ە، تا لەسەر ئەو (فکر)ە بن، (إختلاف)تان نابی، یەك (غایە) و یەك (حرکە) ئەبن، ئەوانی (کافر)ن، (مَثل)ی (أعلی)یان چیە؟ یەکە، دووە، هەزارە؟ (تحصیل)ی (رِضا)ی کێیە؟ بلّندکردنی کێیە؟ چونکی (آلە)یان (مختلفە)، (أفکار) و (آمال) و (غایە)شیان (مُتفرّقە)، (وەقت)ێ، کە دێ بەهۆش بێتەوە ئەڵێ: "ئەمە چی ئەکەین؟ بۆ کێی ئەکەین؟" ئەو (وەقت)ە (ایمان)یان بێ هێز ئەبی، (قوّەت)یان سست ئەبی، ترسی ئێوەیان پڕ دڵ دەبی، (جناب)ی (واحد)ی بێ (شریك) ترسیان ئەهاوێتە دڵی ﴿بِمَا أَشْرَكُوا بِاللَّهِ مَا لَمْ يُنَزِّلْ بِهِ سُلْطَانًا﴾ شتەکیان کردیتە (شریك)ی خوای، کە بە (واسطە)ی وی هیچ (قوەت) (نازل) ناکاتە ناو دڵی ئەوان، بێ (رَیب) (مغلوب) ئەبن ﴿وَمَأْوَاهُمُ النَّارُ وَبِئْسَ مَثْوَى الظَّالِمِينَ ﴿١٥١﴾﴾ ئاگری (حسرەت) و (خیبەت) لە (دنیا)، (نار)ی (جهنّم) لە (اخرەت)، نە (نُور)ی (مُقدّس) نە (مؤیّد)ی نە (روح القُدس) (نجات)یان نادا ﴿وَلَقَدْ صَدَقَكُمُ اللَّهُ وَعْدَهُ﴾ خوای (تعالی) (وعد)ی خۆی بۆ ئێوە گەیاندە جێ ﴿إِذْ تَحُسُّونَهُم بِإِذْنِهِ﴾ ئەتان سووتاندن، وەك سەرد و سەرمایە، کە گیا بسووتێنێ، ئەوی (صرف)یان کرد، بۆ (هلاك)ی ئێوە، (إصابە)ی خۆیان بوو

﴿حَتَّىٰٓ إِذَا فَشِلۡتُمۡ﴾ هەتا ئەو (وەقت)ەی كە ترسان ﴿وَتَنَٰزَعۡتُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِ﴾ لە (أمر)ی (رَسول)، (دائر) بە (حِفظ)ی (مَوقِع) ﴿وَعَصَيۡتُم﴾ لە (تنازع) تێ پەڕی، (مُخالفە)تان كرد، بە (طماع)ی پاتاڵ ﴿مِّنۢ بَعۡدِ مَآ أَرَىٰكُم مَّا تُحِبُّونَۚ﴾ خوا ئەوەی پێتان خۆش بوو نیشانی دان، لەپاش ئەوە (مخالفە)تان كرد ﴿مِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلدُّنۡيَا﴾ (غرض)یان لە (حرب) تالانە، پاتاڵ بەدەست كەوتنە، ئەو (میل)ە (قران)یان نایەڵێ، تالووكە ئەكەن، زوو بەدەست كەوێ، ئاگایان لە (عاقبەت) نامێنێ ﴿وَمِنكُم مَّن يُرِيدُ ٱلۡأٓخِرَةَۚ﴾ (مقصد)ی خودایە، چاوی لە (غنیمەت) نیە، تەماشای (نتیجە)ی حرب ئەكا، ﴿ثُمَّ صَرَفَكُمۡ عَنۡهُمۡ﴾ پاش ئەو (مخالفە)یە ئێوەی لەوان وەرگێڕا، ڕووتان كردە تالان ﴿لِيَبۡتَلِيَكُمۡۖ﴾ تا (إمتحان)تان بكا، بزانێ دێنەوە سەرخۆ، پێش (فَوات)ی (فُرصەت) یەك ئەگرنەوە؟ ئەگەڕێنەوە (موقع)ێ بۆتان داندرابوو، یان نا؟ ئەمەش نەبوو، (فَكان ماكانَ) ﴿وَلَقَدۡ عَفَا عَنكُمۡۗ﴾ زۆر (مُتندّم) بوون، خودا (عفو)ی كردن، (عبرەت)گیر بوون، بۆ جارێكیتر. ﴿وَٱللَّهُ ذُو فَضۡلٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٥٢﴾ وە (إلاّ) ئەو (مُخالفە) لەبەر (سُوء)ە (نتیجە)ی، ئەوە نەبوو كە (إغماض)ی لێ بكرێ، (قِیاس)ی لە (قَتل)یش نەدەكرا، أمّامُخالفە كە لە ڕووی (عِناد)و (شِقاق)ەوە نەبوو، طَمع فكری لێ تێك دان، وە (خیالّ)یان كرد شكستی دوژمن (قطعي)یە ﴿إِذۡ تُصۡعِدُونَ﴾ بۆ (إیمان) بە (فضل)ی (الهی) لە (حق) ئێوە، یادی ئەو (وەقت)ە بكەن، كە دووركەوتنەوە، وا هەلاتن و پەژارە بوون ﴿وَلَا تَلۡوُۥنَ عَلَىٰٓ أَحَدٖ﴾ لەسەر كەس ڕانەدەوەستان، ئاوڕتان لەكەس نەدەدایەوە، قەرسە هەڵێ، چارەسەرە، (بعض)ێك لە (أُحُد)یان خوێندوتەوە، زۆر جوانە، ئەوەندە ترسابوون، وا

هەڕاتان ئەکرد، پشت لە (موقع)ی (حرب)، لای (طرف)ی دوژمن، کە ئاوڕتان لە (أُحُد) کە (موقع)ی (شەڕ)ەکە بوو نەدایەوە ﴿وَٱلرَّسُولُ يَدۡعُوكُمۡ فِيٓ أُخۡرَىٰكُمۡ﴾ پێغەمبەر بانگی ئەکردن، لەدوای ئێوە، هەندە لێتان دوور نەبوو، گوێتان لەبانگی نەبێ، ئەی فەرموو: "(عباد)ی خوای بگەڕێنەوە بۆ لای من، وەرنەوە خۆتان بگرنەوە، (حملە)یە بۆ سەر دوژمن ببەنەوە". (خێر) کێ گوێی لێ یە، ﴿فَأَثَٰبَكُمۡ غَمَّۢا بِغَمّٖ﴾ (ثواب) و (أجر)ی ئەو کارە (خێر)ەی پێ گەیاندن، (غمّ)ی لەسەر (غمّ)ێ، (غمّ)ێ بە (سبب) (غمّ)ێ، (غمّ)ێکتان بۆ (مال) لەقیس چوون، (غمّ)ێ ئی شکست هاتنە سەر، (غەم)ەکتان دا بە دوژمن لە (بدر)، (غەم)تان بە (مُکافأت) وەرگرتەوە، خۆتان لەجیاتی دوژمن (أجر)تان دەدایە خۆ، ئەگەر (محض) (لطف)ی (إلهي) نەبێ، (عفو) (قابل) نیە، بۆیە خوا (عفو)ی کردن، تا ئەو (وقع)ە بکەنە (دەرس)ی (إعتبار) ﴿لِّكَيۡلَا تَحۡزَنُواْ عَلَىٰ مَا فَاتَكُمۡ﴾ لە (غنائم) ﴿وَلَا مَآ أَصَٰبَكُمۡۗ﴾ لە (عزیمەت) و شکست، بەجارێ هورە بەر مەدەن، خۆ بگرنەوە (مِنْ بَعد) بۆ (طمع) (شەڕ) مەکەن، تا تێ نەکەون ﴿وَٱللَّهُ خَبِيرُۢ بِمَا تَعۡمَلُونَ ١٥٣﴾ ئاگادارە بە (جُزئیّات) (أعمال)ی (ظاهری) و (باطنی) ﴿ثُمَّ أَنزَلَ عَلَيۡكُم مِّنۢ بَعۡدِ ٱلۡغَمِّ﴾ لەپاش ئەو (غەم) و (مصیبەت)ە، (جناب)ی (حق)، (لُطف)ێکی نواند، کە (غایەت) دوور بوو، لە (مقام)، نەدەهاتە (خاطر) و (خیال) بەسەر ئێوەی دا نارد ﴿أَمَنَةٗ نُّعَاسٗا﴾ خەوی (زمان)ی (أمن) و (راحەت) و بێترسی، ئەو خەوە ﴿يَغۡشَىٰ طَآئِفَةٗ مِّنكُمۡۖ﴾ (جماعەت)ێ لەئێوەی داگرتبوو، پرخ و هۆڕی خەویان بوو، لە (غایەت)ی (سکینە)بی (قلب) ﴿وَطَآئِفَةٞ قَدۡ أَهَمَّتۡهُمۡ أَنفُسُهُمۡ﴾ (نفس)یان لە (قلق) و (إضطراب) دابوو، ئەوانی هاویشتبوە (هم)، پەرۆشی کەسیان نەبون، هەر تەماشای خۆیان ئەکرد

﴿يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيۡرَ ٱلۡحَقِّ﴾ (ظن)یان ئەبرد لە (حق) (حضرت)ی (حق) بە شتێ نا(حق) ﴿ظَنَّ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِۖ﴾ بە (ظن) و گومانی (إسلامەتی) نەدەچوو، (عیناً) (ظنّ)ی (ایّام)ی (جاهلیّەت) و (کُفر) بوو ﴿يَقُولُونَ هَل لَّنَا مِنَ ٱلۡأَمۡرِ مِن شَيۡءٖۗ﴾ ئەیان گووت: "ئایا ئێمە هیچمان بەمستە؟" (ظاهراً) (عبارەت)ێ (مسلّمان)انەیان ئەنواند، قسەکە (حق) بوو، بۆیە ئەفەرمووێ ﴿قُلۡ إِنَّ ٱلۡأَمۡرَ كُلَّهُۥ لِلَّهِۗ﴾ (شؤونات)ی (عباد) هەمووی بۆ خوایە، کەس (تدوین) و (تدبیر)ی تیانیە، بە (کفر) و (ایمان) ناگۆڕێ ﴿يُخۡفُونَ فِيٓ أَنفُسِهِم﴾ لە (نفس)ی خۆیان بزری ئەکەن ﴿مَّا لَا يُبۡدُونَ لَكَۖ﴾ ئەوەی بۆ تۆی ئاشکرا ناکەن ﴿يَقُولُونَ﴾ لەدڵی خۆیان (مقصد)یان ئەوەیە ﴿لَوۡ كَانَ لَنَا مِنَ ٱلۡأَمۡرِ شَيۡءٞ مَّا قُتِلۡنَا هَٰهُنَاۗ﴾ ئەگەر لە (شأن)ی (حرب) چ (رأي)مان هەبا، یا ئەو (وعد)ەی غلبە بۆ مؤمنە درابووە ئێمە، هیچمان بۆ ببوایە، لە دەرەوەی شار نەدەکوژراین، ئێمە ئەو فلاکەتەمان بەسەر نەدەهات، ئەوانە ئەوانەن کە (فکر)ی (أُبیّە إبن سلول)یان (ترجیح) کردبوو، ئەیان گوت: "وەك ئەو گوتی، لەشاردا بماینایەوە، بۆیان دەرنەکەوتباین، ئەو (حالّ)ەمان بەسەر نەدەهات" ﴿قُل لَّوۡ كُنتُمۡ فِي بُيُوتِكُمۡ﴾ لەشاردا بمابانایەوە ﴿لَبَرَزَ ٱلَّذِينَ كُتِبَ عَلَيۡهِمُ ٱلۡقَتۡلُ﴾ ئەوانەی (قتل)یان لەسەر نووسرابوو، (یعنی) ئەوانەی نووسرابوو لەسەریان بتان کوژن، (تظاهر)یان ئەکرد، (هجوم)یان ئەهێنا سەر شار ﴿إِلَىٰ مَضَاجِعِهِمۡۖ﴾ ئەهاتنە سەر جێی ئەوانەی کوژراون، (غیر)ی (أتباع)ی (منافق)ەکان، کەس قورتار نەدەبوو. ئەو (تدبیر)ە (لاشك) لە (نفاق)ەوە بوو، ئەگەر (أهل)ی (مدینە) هەمووی یەك بان تەواو، باش بوو، (أمّا لاشك) ئەو (منافق)انە، (مقالید)ی شاریان (تسلیم) ئەکرد، (ذاتاً) پێش هاتنی پێغەمبەر بۆ (مدینە)، (ابن السّلول)

(مُرشّح) بوو بۆ (أمارەت)، وە هەر بۆیەش (إیمان)ی نەهێنا، وە (دائماً) لە تێکدانی ئیشی پێغەمبەری خەریك بوو، کەوابی نەچیتە گوێت کە پێغەمبەر (میل)ی (رأی)ی (رئیس المنافقین)ی هەبوو، چاك بوو ئەگەر لە دورەوە شکستیشی بوو، لێشتان کوژرا، زۆرتان ماون، وە خوا (إمتحان)تان ئەکا ﴿وَلِيَبْتَلِيَ ٱللَّهُ مَا فِي صُدُورِكُمْ﴾ (إختیار)ی ئەوەی لەدڵتاندایە ئەی کا، ئەوەی لە (تجربە) دەرچوو، جارێتر تووشی ئەو (نوع)ە ئیشە نابی، (ئێمە مەردی کارزارین، هەریەك (مقابل)ی هەزار (سوارین)، (قائدە)ی نیە ﴿وَلِيُمَحِّصَ مَا فِي قُلُوبِكُمْ﴾ ئەوەی لە دڵتاندایە خاوێنی بکا، ئەو (کلام)ە لەگەڵ ئەو (مسڵمان)انەیە پاش (هزیمەت) ئەو خرت و پرتەیان کەوتە دڵ ﴿وَٱللَّهُ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ١٥٤﴾ (تجربە) و (تمحیص) بۆ (ظهور)ە، وە (إلا) خوا ئەتوانێ پێغەمبەری تێ بگەیەنێ؛ (فلان) بۆ (شەڕ) دەست ئەدا، (فلان) دەست نادا، (لکن مُجب)ی (قیل) و (قال)ە، رێ هەیە بڵێن: "ئەوە (میل) و (محابا)یە لە (نفس الامر) وانیە، وە (معلوم)ە (إنسان) هەرچەند (إیمان)یشی بە (قوّەت) بێ کە (تجربە)کار نەبێ، (شەڕ)ی لەدەست نایە، (حاصڵ)ی (مقصد) ئەوەیە: (علم)ی (مسڵمان)ان، هەر (نظري) نەبێ، ببێتە (عملی) ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَلَّوْاْ مِنكُمْ يَوْمَ ٱلْتَقَى ٱلْجَمْعَانِ﴾ (جمع)ی پێغەمبەری (آخر زەمان) وە جمعی (أبو سفیان)، یا هەردوو (جمع)ی ئەوان، کە پێش و پاشی لەشکریان گرت، (توحید)ی (مساعی)یان بوو، ئەو (مسڵمان)انەی پشتیان دایە دوشمن و هەڵاتن، (حاشا) لەبەر بێ (إیمانی) نەبوو، (مسڵمان)ی تەواو بوون ﴿إِنَّمَا ٱسْتَزَلَّهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ بِبَعْضِ مَا كَسَبُواْ﴾ (سبب)ی (منحصر) بوو لە ئەوە کە (شیطان) (زلە)ی پێ کردن، لەجێ هەڵی قەندن، بە (واسطة)ی (بعض)ە شتێ، کە (سابقاً) کردبوویان ئەمانە بەتەواوی دۆستی (مُوافق) و (مُنافق) یان لێك نەدەکردەوە، گاهـ- گاهـ گوێیان ئەدا بەدنیهادان، (رأی) و (تدبیر)یان

بەڕاست ئەزانی، بۆیە لەو (مقام)ە بەقسەی دوژمن، ئەو (شیطان)انە هەڵخەڵەتان، لەجێ ڕاقەنان ﴿وَلَقَدۡ عَفَا ٱللَّهُ عَنۡهُمۡۗ﴾ بەڕاستی و دروستی خوا (عفو)ی کردن، چونکە (تجربە)یان دیت، (من بعد)بە (فراسەت)ێ (ظریف) (تفریق)ی قسەی (منافق)انە وە (خێر)خواهانە ئەکەن، جارێتر تووشی ئەو (نوع)ە (ذلّة)یە نابن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٞ ١٥٥﴾ ئێوەش قسەی سووکیان لە (حق) مەکەن، (طعن)یان لێ مەدەن، (خاصّە) (ملا)یە وەك (طوسی) وە (سائر)ی (مدرسە) نوشینی، بێ ئاگاهـ لە (أحوال)ی (رُوجیّە)، (غافل)ێ لە (أهوال)ی (معرکە)ی (قتال)، (أمر) و (ناهی) و (حاکم)ە لەسەر کاغەز، بەڵکوو (حاکم)ی (علی العالم)ە، بە (أوهام) و خیاڵ، زویان درێژی بکا، لە (حق) ئەو (نوع)ە کەسانە، زۆر بێ (معنا)یە، زۆر ناماقووڵی یە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَكُونُواْ كَٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ وەك ئەو (کافر)انە بێ (معرفەت) مەبن ﴿وَقَالُواْ لِإِخۡوَٰنِهِمۡ﴾ لە (نسب) لە (دین) لە (قوم) و (عشیرەت)ی خۆیان ﴿إِذَا ضَرَبُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ کە بە (سفر) ئەچوون، لەجێی خۆیان ئەڕۆیشتن بۆ جێیەك، (ملا)یەکان (توجیە)ی بەو (ارض)ە ئەکەن، چونکی (سەفر)یان لە (أرض) بوو، (بعض)ێ ئەڵێن: "(مقصد) لە (أرض)ی (برّ) نیە -کە ڕێی خۆمانە- بەڵکوو (ارض)ێکە، (شامل)ی (برّ)و (بحر)ە". (أمّا طیارە) نەبووە، لە (زەمان)ی ئەوان، (حتی) لە (زەمان)ی (سیّدی ئالووسی)ش نەبووە، وە (إلاّ توجیە)ێکیشیان بۆ (طیّارة) ئەدۆزیەوە، (سەفر)ی زەمین و ئاوێ، کە (دەورە)ی داوە، لە (هوا) (سەفر)ی بە (طیارە) (خطر)ی زۆرترە ﴿أَوۡ كَانُواْ﴾ برایەکانیان ﴿غُزّٗى﴾ (غازی)بوون لە (غزوە)دا بوون، دوور یا نزیك ﴿لَّوۡ كَانُواْ عِندَنَا﴾ ئەگەر لەلای ئێمە بوونایە، نەچوویانە (سەفر) و (غزوە) ﴿مَا مَاتُواْ وَمَا قُتِلُواْ﴾ نەدەمردن نەدەکوژران، ئەو (قطع) و (حزم)ە زۆر (أحمق)انەیە، بڵێین:

"(أجل) یەکە، یا هەزارە" (إعتراف) بە (صانع) بکرێ، یا (إنکار)، (حتّی طبیعیّون) ناتوانن ئەو قسە بە (حزم) بکەن، (نیهایەت) (ظن) و گومانی ئەچێ. ئەوانەی (تأمین)ی (حیات) ئەکەن، لە (عصر)ی ئێمە، لە (حوادثات) (أمین) نین، وەك (حاجی قادر) ئەڵێ:

(أمین) مەبە لە سبەینێ، ئەوەت بەسەر دێنێ
(حوادثات)ی (زەمان)ە، کە نایەتە (تخمین)ێ

﴿لِيَجۡعَلَ ٱللَّهُ ذَٰلِكَ حَسۡرَةٗ فِي قُلُوبِهِمۡۗ﴾ بۆ (خاطر)ی ئەو (فرض)و (تقدیر)ە بکاتە (حسرەت) و ئەندۆهێ (راسخ) و ڕۆچوو، لەدڵیاندا، ئەو (فرضیات)ە سەر ئەکێشێتە سەر (عطالەت)، (حیات)ێ تاڵ، دڵێ پڕ لە (خەتەرە) و (وسواس) (نیهایەت)ی (جنّەت)ە، ئێوە خۆتان بەو ماخولیایە مەخەنە (حسرەت) و ئەندۆەو نا(ڕاحەت)ی دڵ، بۆ ڕابردوو و شتی (واقع)، (لۆمە) کەڵکی نیە، بۆ (مستقبل) باشە، ئەوانەی دامەوو (شطرنج) و سەرترنجانێ ئەکەن، (حرکات)یان لە (فروض) و (تقدیر)ی (حرکات)ی یەکترە، (أرکان)ی (حرب) و پیلانی لەسەر ئەو (فرض) و (تقدیر)ەیە، ئەوانەی لە (أغلاط) (دەرس)ی (عبرەت) وەرئەگرن، (فرض) ئەکەن (وقفە)یە تر، (تأمّل)ی لێ ئەکەن، تا تووشی (غلط) نەبن، ئەو (نوع)ە (فرض)ە بەو گوێرەیە، بۆ دامەزراندنی ئیش و کار، زۆر وردە، (غفل)ێ زۆر زۆر تەواوی پێ ئەوێ (حدس)ێ بە (قوّەت)ی گەرەکە، (خُصوص) (مقابل)ی (داهیە)یە بێ، (سیاسی)یە بێ، (أستاذ)ی ئەو (علم)ە (تجارب)ە بێ، (علم)ی سەر کاغەز (فائدە)ی نیە ﴿وَٱللَّهُ يُحۡيِۦ وَيُمِيتُۗ﴾ ژیاندن، مراندن کاری خوایە، لە (حضر) لە (سەفر) (فرق)ی نیە گەلێ کەس لەسەر (سریر)ی (سلطنەت)، ناز بالیفی (استراحەت) مردووە، هەزاران لە (أمواج)ی (بحار) لەناو ئاگری (شەڕ) گولەبارانی شەست تیر، تەزرەکوتانی (بۆمبا) قورتار بووین، بە (سلامەتی) چوونەتەوە ماڵی خۆیان، بە دیداری (أهل) و (عیّال) شاد بووین.

﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ١٥٦﴾ ئێوەش ببنە (صاحب) (بصیرەت) قسەو (عمل)ی بێ (بصیرەت)انە مەكەن، ئاگادارین، (بصیرەت) بۆ دڵ وەك (بصر)ە بۆ چاو بۆ خودا (مقصود) (علم)ە، ئەو (إعتقاد)ی ئێوەیە، ئەوە لەكوێ؟ ئی (كافر)ەكان لەكوێ؟! ئێوە (ایمان)تان بەرۆژی (ضرا) هەیە ﴿وَلَئِن قُتِلۡتُمۡ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ لە (غزا) ﴿أَوۡ مُتُّمۡ﴾ یا بمرن بە هەرجۆرێ بێ، (نائل)ی (غفران)و (مرحمەت)ی (إلهی) ئەبن، وە (مۆكد) و (محقق)ە ﴿لَمَغۡفِرَةٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَرَحۡمَةٌ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ ١٥٧﴾ چاترە لەو (ماڵ)ەی كە ئەوانە (حریص)ن لەسەری، گری ئەكەنەوە نە خۆیان (خێر)ی لێ ئەبینن، نە كەس، كەوابێ بكوژرێن، لەرێی خوا بمرن بەو (ایمان)ە، باكتان چیە؟ ﴿وَلَئِن مُّتُّمۡ أَوۡ قُتِلۡتُمۡ﴾ بەهەر (وجە)ێ كوژران، خۆ كوژران (مُنحصر) نیە، لە (جهاد) ﴿لَإِلَى ٱللَّهِ تُحۡشَرُونَ ١٥٨﴾ هەركەس بە (جەزا)ی خۆی ئەگا، كەسێ ئەو (ایمان) و (أمل) و (عمل)ەی نەبێ (خسارەت)مەند ئەبێ، (لاشك) (رسول)ی (كبریاء) لە (وقفە)ی (أُحد) (متأثر) بوو، (میل)ی هەبوو، (شدّەت) بنوێنێ لە (حق) (فرار)یان، (خاصە) كەماندارەكان، (لكن جناب)ی (باری)، (عالم)ی (بالاسرار)، (حكیم)ی (علی الإطلاق)، لەو (مسئلە) (حكمەت)ەكی نواند، (إدارە)یەكی كرد، (سیاسەت) و (تدبیر)ێكی بۆ (حضرەت)ی (رسالەت) دانا، (مُخیّرُ العُقول)، لایەك: دڵداری پێغەمبەری (مُحترم) كردنی، (حلم) و (صبر)ی پێدانی، لایەك: (زجر) و (توبیخ)ێكی (رقیق)انە، (مۆثّر) لە (روح) و (نفس)، لایەك (قبول)ی (توبە) لە (انكسار)بە (أنكساری)ی (قلب) و (محجوبی) (تقویە)ی دڵیان بداتێ، (حاصل)ی(قَلم) ناتوانێ (شرح)و(إیظاح)ی بكا، ئەوەی (صاحب)(ذوق) بێ (دَرك)ی ئەكا، (حتّی لازم)ە، ئەو (وقفە)یە لەگەڵ ئەو (ایەت)ەی كە خوا ناردی بۆ (رسول)، بە (تدقیق) و (تحقیق) بكرێتە (كتێب)ێ (لطیف)، لە (مكاتب)ی (حربیە) بخوێندرێ، زیاتر قوماندانان (حفظ) و (ضبط)ی بكەن، تا

لە (زمان)ی (هزیمەت) بەکاریان بێ، بتوانن (ترتیب)ێ نوێ وە (تشکیل)ێ بە (قوّەت) لە (مُنهزم)ان بکەن، تەماشاکە بە (وجە)ێ (تفریع) لە (ما سبق) چی ئەفەرموێ؟ ﴿فَبِمَا رَحۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ لِنتَ لَهُمۡۖ﴾ وە (إلاّ) دڵت لە (حق)یان زۆر رەق بوو، رقت لێ یان هەڵسابوو، بەو (رەحمەت) و (عظیمە) لە (طرف) خوای، بۆ ئەوان نەرم بووی، بۆمان (بیان) کردی، رق خواردنەوە، (عفو)ی (صاحب زولّ)ان، چ (إحسان)ێکی هەیە؟! توو (رئیس)ی (أهل)ی (تقوی)ی، لە هەموو کەس زیاتر، (حظ) لە (إحسان) ئەکەی، ئەوەی (موجب)ی (محبّەت)ی (إلهی)یە (سبق)ی بۆ ئەکەی، وە لە (سائر)ی (ایات)ی تر، خوا (تسلّی)ی دای، (مُتسلّی) بووی ﴿وَلَوۡ كُنتَ فَظًّا﴾ ئەگەر (سيّءُ الخلق) و قسە زۆر ناخۆش و (کلام) هیشك بای ﴿غَلِيظَ ٱلۡقَلۡبِ﴾ دڵ ئەستوور و رەق، بێ (رقّەت) و (مرحمەت) بای ﴿لَٱنفَضُّواْ مِنۡ حَوۡلِكَۖ﴾ بڵاو ئەبوونەوە لە (دەورت) نەدەمان، پەراگەندە ئەبوون، ئەوانیش (خسارەت)مەند ئەبوون، (رسالەت) و (نُبُوّەت) و (سعی) چەند ساڵەت بەخۆڕایی ئەچوو ﴿فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ﴾ لە ئەوەی کردیان لە (حق) توو، (مُخالفە)یان کرد، (موقع)یان بەجێ هێشت، بانگت ئەکردن، (جواب)یان نەبوو، (حاصل)ی لە (حقوق)ی خۆت بیان بەخشە ﴿وَٱسۡتَغۡفِرۡ لَهُمۡ﴾ لە (حُقوق)ی خوای (طلب)ی لێ خۆش بوونیان بۆ بکە، تکاکار بە لە (خدمەت) خوداوەندی (عالم) ﴿وَشَاوِرۡهُمۡ فِي ٱلۡأَمۡرِۖ﴾ لە (شُؤونات)ی (عامّە) (مُشاورە)یان لەگەڵ بکە، پاش ئەو (وقفە)یە (دەرس)یان وەرگرتووە، ئەگەر ئەمجارەش (فشل)یان بوو، (لیاقەت)ی (مُشاورە)یان نیە، پاش (مشاورە) و (مُداولە)ی (أفكار)، وەك (كمال)ی توركی ئەڵێ: "لە لێکدانی افکاری بارقە، حق سقەت دەرئەچێ". کە (قرار) درا بە (إجماع) یا بە (أكثریەت)ی (ساحقە)، تووش (إمضا)ی بکە، (جزم)ی بەسەردا بێنە ﴿فَإِذَا عَزَمۡتَ فَتَوَكَّلۡ عَلَى ٱللَّهِۚ﴾ دڵت

بدە خوا، (إظهار)ی (عجز) بکە، (عالمُ الاسرار) هەر ئەوە، (بشر) هەرکەسێ بێ، (إحاطه) بەهەموو شت نادا، نابێ بە (رأی) خۆم (مغرور) بی، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلْمُتَوَكِّلِينَ ﴿١٥٩﴾﴾ چونکی تێ گەیشتوون (درجه)ی (فکر) و هۆشی خۆیان ئەزانن، (حقیقەت)ی (توکل)یش ئەزانن بە (خەیالات) و (أُمنیە)ی (بطال) و بەتالان، لێیان ناگۆڕێ، ئەوەی (عائد)ی خۆیانە، (إکمال)ی ئەکەن، لە ئەوەی (علم)یان پێ نیە، (إعتماد) ئەخەنە سەر خوا، (إلهام)ێ، (وحی)ێ، (فراسەت)ێ، (زیاد) کرم بکا (نواقص)ێ ئەگەر هەبێ، (إکمال)ی بکا، وەك (فلاح) هەموو (قوّەت)ی خۆی (صرف) ئەکا، لە کشت و کێڵ، وە (توکل) ئەکا، لەسەر (کرم)ی خوا، بۆ باران و شین کردن و بێ (افاتی) و (حفظ) لە سووتان، وە سەپان بەدەست کەوتن –کە (الآن) زۆر سەخڵەتین بۆ سەپان- نە (ملائکه)، نە جنۆکە، نە (شێخ)ەفەندی، نە (قُطب)ی (عالم) کەس بە فەریادمان نایەت.

﴿إِن يَنصُرْكُمُ ٱللَّهُ فَلَا غَالِبَ لَكُمْ﴾ ئەگەر (نصرەت)تان بدا خوای (تعالى)، کەس نیە دەسەڵاتی بەسەر ئێوەدا ببێ، بتان شکێنی، (إشارە) بۆ ڕێی نەبوونی (غلبه) (علیکم) نافەرموێ، (کأنه) ئەفەرموێ: "کەس لە (مُقابلە)تان نیە، با بە (قوّەت)و (قُدرەت)یش بن" ﴿وَإِن يَخْذُلْكُمْ﴾ ئەگەر یاردەمیتان نەدا ﴿فَمَن ذَا ٱلَّذِي يَنصُرُكُم مِّنۢ بَعْدِهِۦ﴾؟ کێ هەیە، (نصرەت)تان بدا، (غالب)تان بکا؟ لەپاش یاریدە نەکردنی خوا! (منافق)ەکان؟ (رؤسا)ی (قریش)؟ (إسرائیلی)؟ (حاشا، ثُمَّ حاشا) کەوابێ بە (غیر)ی ڕێککەوتن و (إتحاد)و (سعی) بۆ (تلاقی) چ چارەتان نیە ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ﴿١٦٠﴾﴾ کەسی ترتان نەماوە، خۆیان و خوایان بەس، خۆزێ (مُتعزلی) و (اشاعرە) و (صوفیە)، لە (تدبیر) و (سیاسەت)ی (قران) (فکری) بان، ئەوجا ئەمانزانی (خلاف) ئەکەن، یا ئەوانیش (إتّحاد) ئەکەن؟ لەسەر

(فاسق)انی (تۆبە)نەکەر (شەڕ) لەگەڵ یەك ئەکەن، یا (شەڕ) لەگەڵ دوژمنی (دین) ئەکەن؟ بەبێ (اسباب) و (عدد) و (عُدد) و (إتفاق)، ئەتوانن ڕوو لە (مەیدان)ی (حرب) بکەن؟

(محلّ)ی (عفو)، (محلّ)ی (جزا)، (محلّ)ی (لیّنەت) وە (محلّ)ی (شدّەت) لەیەك جودان، خوداو پێغەمبەر چاکی (تفریق) ئەکەن، ئەی (مسلّمان)انی (عفو)کراوینە، (أمان) سەد (أمان) (خیاڵ)ی (فاسد) لە (حق) (رسول)ی (أعظم) نەکەن، ئەو (عفو)ە (حمل) نەکەنە سەر (سیاسەت)ی درۆزنانی (حُقود)انی بەدنیهادان، بەڕاستی و دروستی بزانن ﴿وَمَا كَانَ لِنَبِيٍّ﴾ نەك هەر (حضرەت)ی (محمّد)(صلی الله علیه وسلم)، هیچ (نبی)، (فضل) لە (رسول) ﴿أَن يَغُلَّۚ﴾ (غشّ) و (خیانەت)ی هەبی، (عفو)ی (رسالەت) پەناە، (عن صمیم القلب)ە، بەتەواوی یە، دڵی پاکە لە (حق) نێوە، وە (حاشا) ئەگەر (خیانەت) لە (غنیمەت) بکا ﴿وَمَن يَغۡلُلۡ﴾ هەرکەسی بێ ﴿يَأۡتِ بِمَا غَلَّ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ﴾ لەگەڵ (غشّ) و (خیانەت)ی خۆی دێ، ڕۆژی (جزا) ﴿ثُمَّ تُوَفَّىٰ كُلُّ نَفۡسٖ مَّا كَسَبَتۡ﴾ هەرکەس (جزا)ی (أثر)ی (غشّ)ی خۆی ئەبینی، (وکذا، سائر)ە (أعمال)ی (کسبیّە) ﴿وَهُمۡ لَا يُظۡلَمُونَ ١٦١﴾ گوناهکاریش بەتەواوی (جزا)ی (سیّئات)ی خۆی ئەبینی، موژدەی لێ بێ (غدر)ی لێ ناکرێ ﴿أَفَمَنِ ٱتَّبَعَ رِضۡوَٰنَ ٱللَّهِ﴾ ئەو کەسەی لە هەموو کات و کاری (رضا)ی خوای بوێ ﴿كَمَنۢ بَآءَ بِسَخَطٖ مِّنَ ٱللَّهِ﴾؟ وەك ئەو کەسەیە، کە ئەوەی خوا پێی ناخۆشە بیکا، خۆی بکاتە (مُستحقّ)ی (کرهان)دن لە (طرف) خوای؟ کەوابی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) چۆن (غُلول) ئەکا؟ (مُؤمن) چۆن دادەنیشی، وە (رسول)ی (أکرم) (صلی الله علیه وسلم) بچی بۆ (حرب)؟ (زلّە)یەکی لێ (صادر) بوو، چۆن (تۆبە) ناکا، وەبەتەواوی (إصلاح) نابی؟ (قابل)ە؟! خێر ﴿وَمَأۡوَىٰهُ

جَهَنَّمُ﴾ کەسێ لەگەڵ (سُخط) و (غضب)ی خوا بگەڕێتەوە، بۆ کوێ ئەڕوا؟ (أنّه) ئەوانە ئاگرن، ئەبێ بچنە (مخزن)ی ئاگر، ﴿وَبِئۡسَ ٱلۡمَصِيرُ ١٦٢﴾ (مکان)ی ناخۆش، یا گەڕانەوە ناخۆش ﴿هُمۡ﴾ ئەوانەی (تابع)ی (رضوان)ی خوان ﴿دَرَجَٰتٌ﴾ (صاحب)ی پایەپایەی (مقامات)ی بڵند بڵندن، یا خۆیان بە (إعتبار)ی أنواعی (طاعات) بە (زێد)ە (إخلاص) (فرق)یان هەیە، (بالمقابلە) ئەوانی (مقابل)ن (دركات)ن، نەوێت، ئەوانیش نەوی و نەویتریان هەیە ﴿عِندَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ بَصِيرُۢ بِمَا يَعۡمَلُونَ ١٦٣﴾ بۆیە ئەتوانی (إمتیان)یان بکا، هەرکەس (مرتبە)ی خۆی، هەرکەس (مأوی) و (مرجع)ی خۆی ﴿لَقَدۡ مَنَّ ٱللَّهُ﴾ (بالفعل) (منّەت)و (إحسان)ی خوای هاتەجێ ﴿عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ ئەگەرچی ئەو (منّەت)ە (عُظمی)یە لەسەر هەموو (عالم)ە، (أما مُؤمن فائدە)یان لێ دیت ﴿إِذۡ بَعَثَ فِيهِمۡ﴾ ئەگەر (تخصیص) بکرێ بە (مؤمن)ی (عرەب)، لێرە باسی نیە، زێرا ئەو (وەقت)ە، (إسلامیەت) (إنتشار)ی نەکردبوو، (حتّی) لە (بین)ی ئەوان (فضل) لە (سائر)ی (أقوام) ﴿رَسُولٗا﴾ (أمّا) چ (رسول)؟ (رسول)ێ (عظیم القدر)، (جلیل الشأن) (عالی همّەت)، پاك (فطرەت)، نەرم و (حلیم)، زوبان شیرین، دڵ بە (رقّەت) ﴿مِّنۡ أَنفُسِهِمۡ﴾ ئەوە (آیەت)ێکە (فوق)ی (کُلّ)ی (آیەت)ە، بە (خاطر) و (خیاڵ)ی کەس دانەدەهات، (أنّه) تازە ئەو پێغەمبەرە ناردراوە، وە (إیمان)یان پێ هێناوە ﴿يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَ ﴾ (أکوانی) ـ (قُرانی) ﴿وَيُزَكِّيهِمۡ﴾ (بالفعل) پاکیان ئەکاتەوە، پاکی کردنەوە بۆیە پیسی هەڵناگرن، ئەگەر (عارض)ێ بوو، (إزالە)ی ئەکەن، بە (صابون)ی (توبە) و (ندامەت)، ئەی شۆن، ئەو چڵکە لائەبەن ﴿وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلۡكِتَٰبَ

﴿وَٱلۡحِكۡمَةَ﴾ بە (دائمی) لە هەر (مواطن)ێ بەگوێرەی زەمین و (زەمان) (علم) و (حکمەت)یان ئەداتێ، لە (تهذیب)ی (أخلاق) و (تدبیر)ی (منزل)، لە سیاسەت (خاصّة)، (فَنّ)ی (حرب)، (تنظیم)ی لەشکری (مُتّحد) لە پەراگەندەکان ﴿وَإِن كَانُواْ مِن قَبۡلُ لَفِي ضَلَٰلٖ مُّبِينٍ ١٦٤﴾ بە (نوع)ێ لە گومراهی ڕۆچوو بوون، کە (ظاهراً) (قابل) نەبوو (قبول)ی ئەو (تربیە)یە بکەن، نابینن تا (راسخ)ترن، درەنگتر (إیمان) ئەهێنن (رەحمەت) پاك ئەبنەوە، (حال)اش (سواد)ی (أعظم)یان (إبا) ئەکا لە نەبینی وەك کوێران، بەجارێ ڕۆچووین، (أصلاً) وەری ناگرن، (تعلم) ناکەن، لە گومراهیدا ئەمرن، لەسەر ئەو (ایمان) و (تعلم)ە ﴿أَوَلَمَّآ أَصَٰبَتۡكُم مُّصِيبَةٞ﴾ ئایا لەو (حین)ەی کە (بلا)یەکتان تووش بوو ﴿قَدۡ أَصَبۡتُم مِّثۡلَيۡهَا﴾ (سابقاً) (نائل)ی دووچەندانەکی ئەو (مُصیبەت)ە بوون بە (بدر)، بە سەرکەوتن و تالانتان گرت ﴿قُلۡتُمۡ أَنَّىٰ هَٰذَاۖ﴾؟ گوتتان: " ئەوە لەکوێ؟ لەچی بوو، تووشمان هات؟" لە (زمان)ی (قلّەت) و (ذلّەت) بەسەرکەوتین، لە (زمان)ی (کثرَەت) و (عزّەت) بەبن کەوتین، ئایا ئێوە (سبب)ی ئەوە نازانن؟ بەخوا ئەیزانن، خۆتانی لێ (غلط) ئەکەن ﴿قُلۡ هُوَ مِنۡ عِندِ أَنفُسِكُمۡۗ﴾ (احوال)ی (رُوحیە)ی خۆتان، خۆتان چاتری ئەزانن، لە (بدر) (مُتّحدُ الفکر) و (قوّەت) بوون، بەسەرکەوتن، (ولو) بە (عَدد) کەم بوون، لێرە (مُختلِف) بوون، وە لە (إعتقاد) کەمێ (خلل)تان هێنا، بە ئەوە (نوعاً ما) (إغترار)ەکتان بۆ پەیا بوویوو، (رسول) ناکوژرێ، بەلکو نامرێ، لەشکرێك (صاحب)ی (وحی) تیابێ، ناشکێ، (قوم)ێك بە (ملائکەت)ان (إمداد) درابن، (إمداد) ئەدرێن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ١٦٥﴾ (قُدرەت) و (قُوّەت)ی ئەو (مُنْحَصِر) نیە، (شامل)ە، تەنها بۆ (قوم)ێك نیە، بە (إیمان) و (کُفر) (تَقیید) ناکرێ، (عُموم)ی (قُدرەت)ی (الهی) بکەنە چرای (هدایەت)، مەی کەنە (باعث)ی (کفر) و (ضلال) و (کسالەت) و (جَهالَت)، کەسێ

(إیمان)ی بەڕاستی هەبێ، بەخودایە (قدیر) ئەبێ خۆی بكا بە (صاحب)ی (قدرەت) و (مُكنەت)، نەك وەك گاپەرستان (عاجز) و (رەذیل)، (حق) وایە، (تفاوت)ی (عبد) بە (تفاوت)ی (معبود) بێ، بوتپەرست كە لە بەرد بەرەژێر بی، خواپەرست ئەبی لە هەموو كەس بەرەژێر بی، بەلاف و گەزاف نا، بە (فعل) بە (صفەت) بە (صنعەت)، بە (علم) خۆی بكا، بە ئاوێنەی (صفات)ی (باری) ﴿وَمَآ أَصَٰبَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡتَقَى ٱلۡجَمۡعَانِ فَبِإِذۡنِ ٱللَّهِ﴾ بە (إرادە) و (رضا)ی خوا بوو، بۆ (تجربە) و (إمتحان) بوو، قاڵ بوونەوە ﴿وَلِيَعۡلَمَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٦٦﴾ تەواو ئاشكرا ببن ﴿وَلِيَعۡلَمَ ٱلَّذِينَ نَافَقُواْۚ﴾ (أیمان)ە (مُزخرفە)كەیان بە دەربكەوی، تێكەڵاو نەبن، لەگەڵ (مؤمن)ی (صادق)، بۆیە (لِیَعْلَمَ)ەی هێنایەوە، وە بە (إسم)ی (فاعل)ی (أدی) نەكردن، تا بۆیان لەیەك (زەمان) بە (لَفظ) و (عبارەت) دەركەوی ﴿وَقِيلَ لَهُمۡ﴾ كە دوژمن هاتن —(قُبیل الحرب)— پێیان گوترا ﴿تَعَالَوۡاْ قَٰتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَوِ ٱدۡفَعُواْۖ﴾ (قاعدە)ی (حرب)ە، ئەبی لەشكر دوو (قسم) بێ، یەكێك (بالفعل) (شەڕ) بكا، یەكێك (قُوة الظُهر) بی، (لدی الأیجاب) ئەویش (تعرُض) ئەكا، یاخود (حرب) دوو (نوع)ە: (عسكر) یا (مُتَعَرّض)ە یا (مُدافِع)ە، (حرب) (كرّ) و (فرّ)ە، (الان، مُهاجم)ە دوژمن (مُدافع)ە، نەختی تر ئەگۆڕێ، (مُدافع) ئەبی بە (مُتعرّض)، (مُتعرّض) ئەبی بە (مُدافع) ئێوە یەكێكیان (إختیار) بكەن.

﴿قَالُواْ لَوۡ نَعۡلَمُ قِتَالٗا﴾ ئەگەر بەهەر (نوع)ێ (أصول)ی (شەڕ)مان زانیبا ﴿لَّٱتَّبَعۡنَٰكُمۡۗ﴾ دوای ئێوە ئەكەوتین، یا (مُتعرّض) ئەبووین، یا (مُدافع) ﴿هُمۡ﴾ ئەو (جواب)دەرانە ﴿لِلۡكُفۡرِ يَوۡمَئِذٍ أَقۡرَبُ مِنۡهُمۡ لِلۡإِيمَٰنِۚ﴾ بۆ (كُفر)ێ نەزیكتر بوون، لەخۆیان بۆ (إیمان) كەوابێ (میل)ی (كافر)ەكانیان بە (شدّەت)تر بوو، لە (میل)یان بۆ لای (أهل)ی (إیمان)، (طبعاً) ئومێدیان بە (كافر)ەكان هەبوو، لەگەڵیان رێك بكەون، (أمارەت)یان چەنگ كەوی، یاخود

(مُجیب)ەکان لە (کُفر)ێ نەزیکتر بوون، لە (سائل)ەکان لە (إیمان)، چونکە (سائل)ەکان (مُتّصل) بوون بە (إیمان) (بین)یان نەبوو، کەوابێ ئەوانە (عریق) بوون لە (کُفر)، بۆیە ئەو ڕۆژە، پەردەی (نفاق)یان دڕاند، (ما في الضمیر)یان دەرکەوت ﴿يَقُولُونَ بِأَفْوَٰهِهِم مَّا لَيْسَ فِي قُلُوبِهِمْۚ﴾ (أمّا) ئەوە خۆڕایی‌یە، ئەو ڕۆژە دڕاندیانن لەو (جواب)ەش ئەگەرچی (مُنافقی) ئەکەن، (شەڕ)یش ئەزانن، (مُتابعە)شتان ناکەن، هەر بە زوبان ئەڵێن (مُوافق)ی (حقّ) و (حقیقەت) نیە ﴿وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يَكْتُمُونَ ١٦٧﴾ ئێوە شتێك ئەزانن، (أمّا) خوا زێتر ئەزانی، ئەیزانی ئەگەر بۆیان بخونجابا، (إلتحاق)ی دوشمنیان ئەکرد، ئەبوونە (مُحارب) لەگەڵ ئێوە ﴿ٱلَّذِينَ قَالُواْ لِإِخْوَٰنِهِمْ﴾ ئەوانەی ووتیان لە (حق) خزمانی خۆیان، کە لە (خدمەت) پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) چووبوونە دەرێ، بۆ (شەڕ) ﴿وَقَعَدُواْ﴾ ئەوان دانیشتن، نەچوون ﴿لَوْ أَطَاعُونَا﴾ ئەگەر ئەو برایانە (إطاعە)ی ئێمەیان کردبایە، دانیشتبان، نەچووبان بۆ (حرب) ﴿مَا قُتِلُواْۗ﴾ نەدەکوژران ﴿قُلْ﴾ (علی تقدیر التسلیم) ﴿فَٱدْرَءُواْ عَنْ أَنفُسِكُمُ ٱلْمَوْتَ﴾ (دفع)ی مردن لە (نفس)ی خۆتان بکەن ﴿إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ١٦٨﴾ ئەوا لە (قتل) (نجات) بوو، خۆ لە مردن (نجات) نابێ، بەو (ذلّەت)ە نەکوژران، قورتار بوون، لای پیاوی بە(غیرەت) لەمردن ناخۆشترە، ئەو چەند ڕۆژی (حیات)ە با بڕوا لە ڕێی (شرف)، کەوابێ ئەو قسانەش لەسووی (نفاق)ەوە ئەکەن، تا خۆتان بە (مُدبّر)بێ (صائب النظر) بنوێنن، تا خەڵکی بە (تجربە)دیدەتان بزانێ چاکتر (وثوق)تان پێ بکا، ئەوجا (مسلّمان)یش زیاتر لەباڵ یەك بهێننە دەر ﴿وَلَا تَحْسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمْوَٰتًاۢ﴾ وا (حساب) مەکە، ئەوانەی لە ڕێ ی خودا کوژران، مردوون، ژینی ڕاستی بۆ ئەوانە، ئەوانەی (عُمر) بەحیزی ڕائەبوێرن، بە (حقّەت) مردی ئەوانن ﴿بَلْ أَحْيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمْ يُرْزَقُونَ ١٦٩﴾ وا تێ

مەگەن، بەڵکوو ئەوانە زندوون، لای خوای خۆیان، (حیات)ێ بە (شُبه)ە وەك لە (تعارف)دا ئەڵێن: (فلان) کەس مردوە یەکێ شارەزا ئەڵێ: نا، (بل حيٌّ يُرزَقُ) (إشاره) بۆ (صحّەت) و (عافیەت)، وە ئەو (رزق)ەی ئەیاندرێتێ، هەر خوا ئەزانێ چیە؟ ﴿فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ﴾ (کیف) خۆش بەو (شهادەت)ە، کە خوا لە (فضل)ی خۆی پێی (کرم) کردن، کوژرانێ بە (قُصور) نەبوو، لە (أدا)ی (خدمەت) بوو، بەخۆڕایی نەچوو، بوە (باعث)ی (حیات)ی (أُمّەت) ﴿وَيَسۡتَبۡشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمۡ يَلۡحَقُواْ بِهِم مِّنۡ خَلۡفِهِمۡ﴾ (کیف)خۆشن بە (بَقا)ی ئەوانەی مانەوە، نەگەیشتنە ئەوان بەکوژران، بە (کمال)ی (عزّ) و (شرف) ئەژیەن ﴿أَلَّا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ١٧٠﴾ لە دوژمن ترسیان لەسەر نیە لەبەر (فَوات)ی (أمل)، (حزین) و غمناك بین ﴿يَسۡتَبۡشِرُونَ بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ﴾ خۆیان و خوا ئەزانن چیە؟ ﴿وَفَضۡلٖ﴾ زێدەیی، کە (تقدیر) ناکرێ لە (حُسبان) دانەبوو ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يُضِيعُ أَجۡرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ١٧١﴾ (فرق)ی مامی پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) و (أجنبی) نیە، تەماشای (أیمان) و (عمل)ی چاکە ئەکا. خوای (تعالی) (أجر)ی ئەو (إیمان)دارانە بە خۆڕا نادا ﴿ٱلَّذِينَ﴾ ئەو (مؤمن)انەی ئەوتۆ، کە ﴿ٱسۡتَجَابُواْ لِلَّهِ وَٱلرَّسُولِ﴾ (أمر)ی خواو پێغەمبەریان (قبول) کرد، بە دڵ و گیان ﴿مِنۢ بَعۡدِ مَآ أَصَابَهُمُ ٱلۡقَرۡحُۚ﴾ (ابو سفیان) لە (وەقت)ی گەڕانەوە لە (حرب)ی (أُحُد) بانگی کرد: "(یا مُحمّد)" (صلی الله علیه وسلم) (میعاد)مان (موسم)ی (بدر) بێ لەساڵی (آتي) ئەگەر (حظ) ئەکەی"، پێغەمبەر (قبول)ی کرد، پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لە (میعاد) (تشریف)ی چووە دەر، لە (مدینە) بۆ (موعد)، تا گەیشتە (حمراء الأسد) کە هەشت (میل) دوورە لە (مدینە)، (مَعبد)ی (خُزاعی) هێشتا (إیمان)ی نەهێنابوو، (أمّا) (خُزاعە) (مُسلم) و (غیر)ی (مُسلم)یان لەگەڵ پێغەمبەر (صلی

الله علیه وسلم) (خالص) بوون، لەو (وەقت)ە بەلای پێغەمبەردا(صلی الله علیه وسلم) تێپەڕی، (عرض)ی کرد: "(والله) زۆرمان پێناخۆش بوو، ئەو (مُصیبەت)ە کە تووشی یارانی توو بوو، وە زۆر خۆش (حاڵ) بووین، لەسەر (سلامەتی) توو" ڕۆیی بۆ لای (مکە)، لە (موقع)ێ کە پێی ئەڵێن (رَوحاء) تووشی (ابوسفیان) بوو، بەو (فکر)ە کە ئەمجارە بەجارێ (مسڵمان)ان ببڕنەوە، (أبوسفیان) (خبرات)ی پرسی لە (معبد)، گووتی: "(محمّد) و یارانی (جماعەت)ێ ئەوەندە زۆرن، کە (مثل)ی ئەوەم نەدیتوە، هاتوونە دەر، لە (مدینە) لە (حق) ئێوە، ئەوەندە بەڕقن، چی وام نەدیوە ! " (خلاصە) لە قسەی (مَعبد) (أبوسفیان) و لەشکری ترسیان لە (قلب)ی نیشت، جڵەویان باداوە لای (مکّە)، چەند سوارێك لە (عشیرەت)ی (عَبدالقیس)، بۆ لای (مدینە) ئەهاتن، بەلای (أبوسفیان) تێپەڕین، ووتی: "ئەچنە کوێ؟" ووتیان: "(مدینە)" ووتی: "بۆچی؟" ووتیان: "بۆ (زاد) ووتی: "کە چوونە (مدینە)، (خبر) بدەنە (محمّد) و یارانی، وە بەهاتنی ئێمە و (کثرەت)ی لەشکر، بیان ترسێنن" ئەوانیش هاتن، گەلێ ترسیان پێدان، (اصلاً تأثیر)ی لێ نەکردن، لە (خدمەت) پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) چوون بۆ(مَوعد)، لەپاش ئەو برین و شکستەی لە (اُحُد) کە بەسەریان هاتبوو ﴿لِلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ مِنْهُمْ وَٱتَّقَوْا۟ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٢﴾﴾ بۆ ئەو کەسانەی چاکەیان کردوە، لە ئەوان، وە (تَقوی)ی خوایان کردوە، (أجر)ێکی گەورەی هەیە، ئەوانیش کێن؟ ﴿ٱلَّذِينَ قَالَ لَهُمُ ٱلنَّاسُ﴾ لەمانەش (ڕوایەت) (مُختلفە)، (تعیین) (لازم) نیە ﴿إِنَّ ٱلنَّاسَ﴾ (قُریش) گەلێ لە (قبائل)ی (عرەب) ﴿قَدْ جَمَعُوا۟ لَكُمْ﴾ گردبووینەوە بۆ (شەڕ) لەگەڵ ئێوە ﴿فَٱخْشَوْهُمْ﴾ لێ یان بترسن، مەچنەدەر، لە دەرەوەی (مدینە) شکان، ئەمجارە دوور بڕۆن (محو) ئەبنەوە، چەند (وسوسە)یان دان، گوێیان نەدانێ ﴿فَزَادَهُمْ إِيمَـٰنًا﴾ قسەی ئەوانە (ایمان)ی (مسڵمان)ەکانی بە (قُوّەت)تر کرد

﴿وَقَالُواْ حَسۡبُنَا ٱللَّهُ﴾ ئەیان فەرموو: "خوا (کافی)یە بۆ ئێوە ﴿وَ﴾ ئەیان ووت: ﴿وَنِعۡمَ ٱلۡوَكِيلُ ١٧٣﴾ (أنّە) جیاوەز جیاوەز ئەو (کلام)ەیان ئەفەرموو: (حسبُنا الله)، (نعم الوکیل)، یاخود (مجموع)ی (حسبنا الله ونعم الوکیل)یان ئەفەرموو، کە (واو)ی سەر (ونعم)ە لە (کلام)ی ئەواندا بێ، ئیش و کاری خۆمان (تفویض) ئەو کردوە، (زمام)ی (إدارە)مان لەدەست ئەوە (اعتماد) و (تَوکّل)مان بە (لُطف) و (وَعد)ی ئەوە، ئەویش (وکیل)ێکی (غایەت)چاکە، (أصلاً) درێغی (عنایەت) لەئێمە ناکا، ئەوی چاکە، بۆمان ئەکا، پێمان ئەکا. ئەو (مسلّمان)ە (مُتوکّل)انە، بە (کمال)ی (شوق) و (شطارەت) لە (خدمەت) (حضرەت)ی (رسالەت) چوونەدەر، (ابوسفیان) لەترسان گەڕایەوە ﴿فَٱنقَلَبُواْ﴾ (مسلّمان)ەکان ﴿بِنِعۡمَةٖ مِّنَ ٱللَّهِ﴾ لەگەڵ (نعمەت)ێ زۆر گەورە ﴿وَفَضۡلٖ﴾ قازانج، لە (تجارەت) و (معاملە) کە لە ڕێ یە چەنگیان کەوت، بەڵام (تفسیر)ی (نعمەت) بە (سلامەتی) (فضل) بەناوی (شرف) یا (کَرم)ێ (إلهی) گەلێ (مُناسب) ترە ﴿لَّمۡ يَمۡسَسۡهُمۡ سُوٓءٞ﴾ هیچ شتی خراپیان تووش نەبوو ﴿وَٱتَّبَعُواْ رِضۡوَٰنَ ٱللَّهِۗ﴾ (مقصود)یان (صِرف) (رَضا)ی خودا بوو ﴿وَٱللَّهُ ذُو فَضۡلٍ عَظِيمٍ ١٧٤﴾ لە (فضل)ی بێ پایانی خوداوەندی (عظیم الشأن) ئەخوازین کە (مسلّمان)ان لەپاش ئەو (حرج) و شکستەی کە چەند ساڵە بەسەریاندا هاتوە ڕە دادێت، دەست لە (شقاق) و (خلاف)ی خۆیان هەڵ بگرن، وا (فرض) بکەن ئەمرۆ(أحکام) لە (صاحب)ی (دین) وەرئەگرن، (نائل)ی (عفو)ی خودا بووین. پێغەمبەر (صَرف)ی (نَطر)ی لێ کردین، ئەوانیش یەك (فِکر) و یەك (قُووەت) (جمعیەت)ێ (مُتّحد)ی وا، بەقسەی (مُفسد)ان ناگۆڕێن، ڕوو لە (رؤسا)ی (فساد) وەرئەگێڕن، (بَقیّة)ی (ملّەت) و (وطن) (حفظ) ئەکەن، بۆ (إعادە)ی (مجد) و (شرف) تێ ئەکۆشن، (نائل)ی (نعمەت)ی (إلهی) وە (فضل)ی نا (مُتناهی) ئەبن ﴿إِنَّمَا ذَٰلِكُمُ﴾ (خطاب)ە

لەگەڵ ئەو (مسڵمان)انەی کە لە قسەی (وفد)ی (عبدی قیس)ی ترسیان لێ پەیا بوو بوو. لەگەڵ ئەوانە نیە، کە (ایمان)یان پێ (زیاد) بوو، ئەو (القائات)ەی کە کردیان ﴿ٱلشَّيْطَٰنُ يُخَوِّفُ أَوْلِيَآءَهُۥ﴾ (شیطان)، (إبلیس) بە (تبلیس) و (تزوین)ێ (شاعر)انە (أولیا)ی خۆی ئەترسێنێ، (خاصّةً) بەناوی (دین) بێنە پێش، پێشی هەموو کەس (ملا) و (شێخ)ان هەڵ ئەخەڵەتێن، ئەگەر خوانەخواستا ئێوە هەموو چوون، کێ ئەو (دین)ە (حفظ) ئەکا؟ ئەو (هدایەت) و (إرشاد)ە هەمووی بە (هَدَر) ئەچێ، ئەوانیش بەدڵ (إعتماد)ی ئەدەنە سەر، بەڵکو بە (إلهام) و (وحی) (إلهی) تێ ئەگەن ﴿فَلَا تَخَافُوهُمْ﴾ لەو خەڵکە مەترسن، گوێ مەدەنە (تسویلات)ی (إبلیس) ﴿وَخَافُونِ﴾ خوا ئەفەرموێ: "لەمن بترسن، لێك و رێك و پێك بن، (أوامر)ی من بەجێ بهێنن" ﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٥﴾﴾ بەڕاستی و دروستی و بێ (غلّ) و (غش) ﴿وَلَا يَحْزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِى ٱلْكُفْرِ﴾ با (عاجز)ت نەکا، ئەوانەی لەناو (کفر) و (ضلال)، (سعی) و پێشڕەوی ئەکەن. بۆ (کُفر)، بۆ تێکدانی ئیش و کارت، بۆ وەرگێڕانەوەی (مسڵمان)ان، بۆ (منع)ی (عالم) لە (إیمان)، (لاشك) ئەوانە (أبالیس)ەی (أهل)ی (کتاب)ن، (مەڕەد)ەی (شیاطین الإنس)ن (تسویلات)ی (مُنافق)انی (عەرەب)، (شدّەت)ی (بُغض)ی (قُریش) و (سائر)ی (عشائر) و (قبائل)، لە (طَرف) ئەوانەیە، کەوابی (فی) لەجێی خۆیەتی بە (معنی) (إلی) نیە، (حقّاً) بەجێیە، پێغەمبەر(صلی الله علیه وسلم) لەدەستیان (عاجز) بی، وە خواش (نهی) بفەرموێ ﴿إِنَّهُمْ لَن يَضُرُّوا۟ ٱللَّهَ شَيْـًٔا﴾ ئەوانە هیچ، (أبداً) (ضرر) بەخوا ناگەیەنن، (أنّهُ سعی) ئەوان، لە (ضرر)دان بەئێوە (سعی)یە لە (ضرر)دان بەخوا ﴿يُرِيدُ ٱللَّهُ أَلَّا يَجْعَلَ لَهُمْ حَظًّا فِى ٱلْءَاخِرَةِ﴾ (إرادە)ی خوا وایە، هیچ (نصیب)یان نەداتێ لە (قیامەت) بۆیە (إمهال)یان ئەکا، وە ئەوهایان لەدوا ئەدا ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٦﴾﴾ (مأیوس)ن لە (رحمەت)ی خوا، بەڵام لە

(عذاب) و (عقاب)ی خوای، بەشەکی زۆر گەورەیان بۆ هەیە ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ٱشۡتَرَوُاْ ٱلۡكُفۡرَ بِٱلۡإِيمَٰنِ﴾ لەجیاتی (ایمان) (کفر)یان (إختیار) کردیە، یا ئەوانەی (مسارع)ی (إلی الکُفر)ن ﴿لَن يَضُرُّواْ ٱللَّهَ شَيۡـٔٗا﴾ (أبداً) هیچ (ضرر) بەخوا ناگەیەنن، ئەمانەی پێشوو کە (ضرر) نەگەیەنن، ئەمانە هیچ بۆیە (حاجەت) بە (تأکید)ی (عبارەت)ی پێشوو نیە ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ١٧٧﴾ بەئێشە، (أمّا) (عذاب)ی ئەمانە لە (عظمەت)دا ناگاتە (عذاب)ی (أئمّە)کانیان ﴿وَلَا يَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓاْ﴾ (مُسارع) و(غیر)ی (مُسارع) ﴿أَنَّمَا نُمۡلِي لَهُمۡ خَيۡرٞ لِّأَنفُسِهِمۡۚ﴾ وا تێ نەگەن، ئەوەی ئێمە بۆیان ئەنووسین لە (طول)ی (عُمر) و (إمهال)یان لە (کُفر)، چاکە یا چاترە، بۆ (ذات)ی ئەوان، یا (روح)ی ئەوان، زۆر خراپە، (نفس) (تزکیە) ناکەن، (غافل) و (مغرور) ئەبن، (إقدام) لەسەر گوناهان زیاتر ئەکەن ﴿إِنَّمَا نُمۡلِي لَهُمۡ لِيَزۡدَادُوٓاْ إِثۡمٗاۚ﴾ (طول)ی (حیات)یان ئەدەینێ، بێ (بەلا)، بەس (خاطر) ئەوەی گوناهان (زیاد) بکەن لە گوناهان (زیاد) بکەن، تاوەکو لە (اخرەت) (نصیب)یان نەمێنێ.

ئەمڕۆ ئەوە لە (بین)ی (مسلّمان) و (غیر)ی (مسلّمان) بوویتە (فکرە)یەك ئەوەی (بەلا)یەکی بێتە سەر، ئەڵێن: "ئەوە خوا خۆشی ناوێ، خوا رقی لێ ئەبێتەوە، بۆ (خاطر)ی (شێخ)ێ یا قەشەیە یا (مالم)ێ" ئەوەی بێ دەرد و (بەلا) بژیە، قەڵەو بێ و مل ئەستووری، قونکە هەوجاری (ماڵ) و (دەوڵەت)ی زۆربی، ئەڵێن: "ئەوە خوا ئەیەوێ، لەبەر (خاطر)ی ئەو (ذوات)ە (مُقدّس)ە، (کرم)ی لەگەڵ ئەکا "گەلێ قەشە لەو (اخر)ە ئەیان ووت: "دیارە (دین)ی ئێمە (حقّ)ە، چونکی (دول)ی (ئاوروپا) کە (مسیحی)ن، بەسەر (دُول)ی (مسلّمان)اندا، (غالب) بووین، ئەگەر (دین)ی (مسلّمان)ان (حق) بوایە، (مغلوب) نەدەبوون". (مع أنّە) (غلبە)ی (ئاوروپایی) بە (علم) بوو، نەك (مسیحیەتی)، ئەگەر لەسەر (مسیحیەتی) بمابوونایەوە، تا (ابد)

سەرنەئەکەوتن، بەو قسە پڕوپووچانە (عالم) ماڵ وێران بووە، گوناه لەسەر گونا (زیاد) ئەکەن، (أصلاً) ترسی خواو ڕۆژی (جزا)یان نیە ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّهِينٌ ﴿١٧٨﴾﴾ (مُقابل)ی ئەو (غُرور)ە بۆ وان هەیە، لە (اخرەت) (عذاب)ێ (ڕەزیل) کوننده، ئەوە بۆ (کافر)ان، (أمّا) بۆ ئێوە وانیە خوا (إمهال) تان ناکا، (إمتحان)تان ئەکا، بە (بەلا)و (مُصیبەت)، تاکوو پاك و پیس بەدەربکەوێ.

﴿مَّا كَانَ اللَّهُ لِيَذَرَ الْمُؤْمِنِينَ﴾ لێتان بگەڕێ ﴿عَلَىٰ مَا أَنتُمْ عَلَيْهِ﴾ لە(کیفیات)ی (خفیّە) ﴿حَتَّىٰ يَمِيزَ الْخَبِيثَ مِنَ الطَّيِّبِ﴾ پیس جودا بکاتەوە لەپاك ئەوانەی لە دڵدا (غلّ) و (غش)یان هەیە، هەڵاوێردرێن، (أنّە) (سائل)ێ ئەڵێ: "(عجباً) ئەوە (ممکن) نەدەبوو، کە خوای (تعالی) بێ (حرب) و (بەلا) و (إمتحان) (بیان)ی بکا ئەوە بە (غشّ)ە، ئەوە بی (غشّ)ە؟! (جواب) ئەفەرموێ: ﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُطْلِعَكُمْ عَلَى الْغَيْبِ﴾ ئەوە نابی، خوا ئێوە ئاگادار ناکا، لەسەر (ما في الضّمیر) ﴿وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَجْتَبِي مِن رُّسُلِهِ مَن يَشَاءُ﴾ کەسێك (أختیار) ئەکا، لە (بین)ی (رُسُل) بە (فکر) و (عمل)، لە (تجربە) و (إمتحان)، پیس و پاکی پێ لێك ئەکاتەوە، تا کەس قسەی نەمێنێ، نەڵێ: "ئەوە (إدّعا)یە، (فرق)ی ئەم و ئەو چیە؟" ﴿فَآمِنُوا بِاللَّهِ وَرُسُلِهِ﴾ هەموویان، بێ (تفریق)ی (أعاظم)ی (رُسل) وەك (جناب)ی (رسالەت) پەناه(صلی الله علیه وسلم)، (قوم)ی خۆیان (إمتحان) کردووە، ساغ و چرۆکیان بەدەرخستوە، بە ساغەکان –با کەمیش بووبن– ئیشیان پێکهاتوە ﴿وَإِن تُؤْمِنُوا﴾ ئەگەر (إیمان) بهێنن ﴿وَتَتَّقُوا﴾ بە (إیمان) هێنان (مغرور) نەبن ﴿فَلَكُمْ أَجْرٌ عَظِيمٌ ﴿١٧٩﴾﴾ (أمّا) بڵێن: "ئێمە (إیمان)دارین لای خوا نازدارین، بە (کیف)ی خۆمان ئەکەین، خوا ئیشمان بۆ ئەکا". بێ (شك) (خسر الدُّنیا والاخرە ت) ئەبن ﴿وَلَا يَحْسَبَنَّ الَّذِينَ يَبْخَلُونَ بِمَا

ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ﴾ وا تێ مەگەن، ئەوانەی ماڵداران و (بخیلی) ئەکەن بەو (ماڵ)ەی، کە خوا لە (فضل)ی خۆی پـێی داون ﴿هُوَ خَيۡرٗا لَّهُمۖ﴾ ئـەو (بُخـل) و (ثقیلی)یە چاکە یا چاترە، لە (إحسان) و بەخشین بۆ ئەوان، ئەوانیش (مغرور) نـەبن بڵـێن: "خـوا ئێمـەی خـۆش ئـەوێ، ئـەو هـەموو ماڵـەی داوەتـە ئێمـە، نەیداوەتە خەڵکی، ئەگەر پێی خۆش بوایە، ئەوانی دەوڵەمەند ئەکرد، (مادام) خوا پێی (کرم) نەکردینە، ئێمەش نایانـدەینێ" ﴿بَلۡ هُوَ شَرّٞ لَّهُمۡۖ سَيُطَوَّقُونَ مَا بَخِلُواْ بِهِۦ﴾ ئـەو (مـاڵ)ەی (إدخـار)یـان کردیـە، (بخالـەت)یـان پـێ کردیـە، ئەگێڕدرێ بە (طـوق) ﴿يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ﴾ ڕۆژی واپەسین، (یعنی) (وبـال)ی (مـا بخلوا بـە)ی یـان ئەخـسترێتە ئەسـتۆ، وەك کـوردی ئـەڵێ: "تۆباڵـت بـە ملـم" (شاعر) لە (حق) ئەوانە ئەڵێ:

مالی خودرا خود نەخوردی (طوق) شد زو گەردنەت
مەردەهارا زیندەکەردی، ئافەرین بەرموردەنەت

﴿وَلِلَّهِ مِيرَٰثُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ﴾ (میراث)ی ئاسمان و (أرض)ان ئی خوایـە، نای خۆی، نای بەخشی، چی لێ ئەکەی؟ کە کەڵکت نەگرێ، لـە (قامـەت) ببـێ بە (طوق)، (حقیقەً مُوجب)ی (حسرەت) و (ندامـەت)ە، ئـێرە جـێی (زەکـات) نیە، ڕێی (جهاد)ە، وە جێی (بُخل) بە (بیان)ی (أوصاف)ی (نبـوی)ش نیـە، (خاصەً تفسیر)ی (فضل) بە (تورات) لە (غایەت) دووری یـە ﴿وَٱللَّهُ بِمَا تَعۡمَلُونَ﴾ ئەی (مسڵمان)ینە ﴿خَبِيرٞ ١٨٠﴾ خوای (تعالی)ن بـەوەی ئـەی کـەن ئاگـادارە، ئێوەش ئاگاداری (حاڵ)ی خۆتان بن، (بُخل) مەکـەن، (لـدی الإیجـاب) لەسـەرو (ماڵ) هەڕوونە دەر ﴿لَّقَدۡ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوۡلَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ﴾ لە (أهل)ی (کتاب) ﴿إِنَّ ٱللَّهَ فَقِيرٞ وَنَحۡنُ أَغۡنِيَآءُۘ﴾ کە (تکلیف)یـان لێ ئـەکرا، بـە (إنفـاق)ی (فی سبیل الله) ئەوەندە (بخیل) بوون، لە (حُبّ)ی (مـاڵ) ئـەو (نـوع)ە (هَـذیان)انـەیان ئـەکرد

﴿سَنَكۡتُبُ مَا قَالُواْ﴾ بە (تحقیق) ئەی نووسین، لە (دەفتەر)ی (أعمال)یان (ثبت)ی ئەکەین ﴿وَقَتۡلَهُمُ ٱلۡأَنۢبِيَآءَ بِغَيۡرِ حَقّٖ﴾ ئەوەش ئەنووسین، (قتل)ی (أنبیا) یان (قط) بە (حق) نابی، لە (فرض)ی (محال) ئەگەر (مُستوجب)ی (قتل) بوون، (قصاص) ئەکرێن، ئەمە (عین)ی (معدلەت)ی (إلهی)یە (إغماض) لە (رسول)ی خۆی ناکا ﴿وَنَقُولُ ذُوقُواْ عَذَابَ ٱلۡحَرِيقِ ١٨١﴾ وە پێیان ئەڵێین: "بچێژن (عذاب)ی سووتەنی، بسووتێن، بە (مُقابل)ی (حُبّ)ی (مالّ)، کە جەرگ و هەناوتانی سووتاندبوو، سەبارەت بەوە (کُفریّات)تان لە (حق) خوای ئەگووت، وە (أنبیا)تان ئەکوشت". ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەو (عذاب)ە ﴿بِمَا قَدَّمَتۡ أَيۡدِيكُمۡ﴾ بەو (أعمال)ەی کە دەستی ئێوە پێشی خستبوو، دەستی خۆتان بەست، لە (إنفاق)ی (خیر)، بەرەڵاتان کرد لە (شەڕ) ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيۡسَ بِظَلَّامٖ لِّلۡعَبِيدِ ١٨٢﴾ وە بە ئەوەی کە خودا هیچ (ظلم) لە (خدمەت)کاران ناکا، ئێوەش (خدمەت)تان نەکرد، کە ئەوەی پاداش بێ، وەری بگرن، (بناءاً علیە) بەتەواوی (جزا)ی (لایەق) و (موافق) ئەبینن.

(ملا)یان زۆر هەرایان لەو (مقام)ە هەیە، ئایا بۆ خودا دروستە، بێ گوناه (عبد)ی خۆی (عذاب) بدا، یان نا؟ ئەو ئەڵێ: "دروستە" ئەم ئەڵێ: "نابێ" ئەو باسە، لای من زۆر بێ (معنا)یە، ئەگەر (نظریة)ی (شێخی أشعری) (نظر) بە (مقام)ی (اُلوهیّەت) بی، باشە، کە (دائرە)ی (تصرّفات)ی (کبریائی) تەنگ نەکرێ، (لکن أتباع)ی ئیش لەئیش تێ ئەپەڕێنن، وە(نظر) بە(مقام)ی (تشریعی) و (تزکیە) دیارە (جوان)ی نیە ﴿ٱلَّذِينَ﴾ ئەوانەی رابردوو ئەوانەن ﴿قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ عَهِدَ إِلَيۡنَآ﴾ ئەیان گوت: "خوای (تعالی) (عهد) و (میثاق)ی داوەتە ئێمە، (أمر)ی پێ کردووین ﴿أَلَّا نُؤۡمِنَ لِرَسُولٍ﴾ هەرکەسێ (دەعوا)ی (رسالەت) بکا ﴿حَتَّىٰ يَأۡتِيَنَا بِقُرۡبَانٖ تَأۡكُلُهُ ٱلنَّارُ﴾ وا

(مشهور)ە ئەوە (علامـەت)ی (صِدْق)ی (مُـدّعی) (رسالەت) بـوە، (قوربـان)ی ئەکرد، ئەگەر ئـاگرێ هاتبـا، لـەئاسمان هـەڵی لووشـیبا، ئـەیان ووت: "راسـت ئەکا"، وە (إلاّ) ئەیان ووت: "درۆ ئەکا"، ئەوە لـە (دیـن)ی (رسـول)ی (خـاتم) نیە، (أمّا) ئـەوەی لـە (تـورات)ی (مُقدّس)یـان بەدەرئەکـەوێ ئەوەیـە: ئەگـەر کەسێك گوناهی کردبا، بۆ (کفّارەت) (قوربـانی)یـەکی (تقـدیم) ئـەکرد، لـەپاش کوژرانــەوە، پارچەپارچـە ئـەکرا، ئـەیان سـووتاند، ئـەوەش لــە (دیــن)ی (إسـلام)دانیـە، (علـی کـلّ) ئـەیان کـردە بەهانـە، بـۆ (إیمـان) نـەهێنان، بـە (حضرەت)ی (محمّد) (صلی الله علیه وسلم)، (أمّا) ئەوەش (عهد) نیە، مەگـەر (دوام)ی (حُکـم)ی (تـورات)یـان لایـە پـەیمان (حِساب) بـێ ﴿قُلْ قَدْ جَآءَكُمْ رُسُلٌ﴾ (جمـع)ێ، نـەك یـەك و دوو ﴿مِّن قَبْلِى﴾ لـەپێش مـن، لـەخۆتان ﴿بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَبِٱلَّذِى قُلْتُمْ﴾ بـەو (مُعجـزات) و بـە ئـەوەی ئێـوە وتتـان ﴿فَلِمَ قَتَلْتُمُوهُمْ﴾ (فـضل) لـە (غیمـان) ﴿إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٨٣﴾﴾ ئەگـەر راسـت ئەکەن لە (إدّعا)ی ئەو (عهد)ە.

ئەگـەر (قـول) بـە (مَفهـود)ی (مُخالفـە)ی (حَتّـی) نـەکرێ، ئـەو (جـواب)ە هەڵناسـتێ ﴿فَإِن كَذَّبُوكَ﴾ سـەخڵەت مەبـە، (أهمیـەت)ی مـەدەرێ ﴿فَقَدْ كُذِّبَ رُسُلٌ مِّن قَبْلِكَ﴾ (حتّی) (بعض)ەکیان کوشتن، (أمّا) خـوا تـوو (حِفـظ) ئـەکا، دەسـەلاتیان بەسـەر تـوودا ناشـکێ ﴿جَآءُو بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِ﴾ بـە (معجزات)ی ئاشکرا، وە (کُتُب)ی (حِکـم) و (مـواعِظ) و (زواجِـر) ﴿وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُنِيرِ ﴿١٨٤﴾﴾ بە (کتێب)ێ کە دڵ و (عقل)ێ ڕووناك ئەکا، (ظلمـات)ی (شـکوك) ئەبا، (تفسیر)ی بە (قورئـان) لام وەیـە (مِـنْ قَبْلِـكَ) لێ ناگـەڕێ، ئەگەرچی لـە هەموو (کُتب) (خێر)ترە، دیارە (تکذیب)ی (رُسل) بوویتە (عادەت) لای ئەوانە، کـەوابێ تـوو بـە (تکـذیب)یـان عـاجز مەبـە، ﴿كُلُّ نَفْسٍ ذَآئِقَةُ ٱلْمَوْتِ﴾ ئـەو

(حیات)ە ئەبڕێتەوە، (إنسان) چەند بژیە، هەر ئەمرێ، بە (مالْ) (نجات)ی نابی، (مؤمن)و (کافر)، (مُکَذِّب) و (مُکَذَّب)، (مُصدِّق) و (مُصدَّق) یەکسانن، کەس (إمتیان)ی (فطری) نەدراوەتی، دلْ بە (دُنیا)و (حُبّ)ی (مالْ) مەبەستن، بە (حُبّ)ی (دُنیا) خۆ لە خوا رووڕەش مەکەن، زۆر بێ (معنا)یە، وە گەلێ (حُکما) خەریك بوون، بۆ (إدامە)ی (حیات)، لام وەیە (مأیوس) بوون، (مُخترِع)ی (شهیر) (یأس)ی دانێ ﴿وَإِنَّمَا تُوَفَّوْنَ أُجُورَكُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ﴾ لەرۆژی (قیامەت) (أجر)ی خۆتان بەتەواوی وەرئەگرن، (غدر)تان لێ ناکرێ ﴿فَمَن زُحْزِحَ عَنِ النَّارِ﴾ ئەوەی دوور دەخرێتەوە لەئاگری (جهنّم) ﴿وَأُدْخِلَ الْجَنَّةَ فَقَدْ فَازَ﴾ قورتار بوە، (نائل)ی (سعادەت)، لە (فوق)ی ئەوە، ئەوی بیی لە (فضل)ە ﴿وَمَا الْحَيَاةُ الدُّنْيَا إِلَّا مَتَاعُ الْغُرُورِ ﴿١٨٥﴾﴾ کووتالێکە، مالێکە، عەمبارە پۆ، وەك (تەلەفۆن)، کە (نوع)ە قوماشێکە لە (نهایەت)ی چرووکی، وە (غایەت) جوانە، (مُشتری) پۆی هەلْ ئەخەلەتێ، ئەوەی پێ ی بدا، لەقیسی ئەچێ، (خسارەت)مەند ئەو کەسەیە، (دەولەت)ی پایەداری (اخرەت) بدا بەو (مالە) (مُزخرف)ە، (نفس)ی (حیات)ی (دُنیا) (حقیقە) وایە، (حیات)ێکە پڕ (تعب) و ناخۆشی، نەخۆشی، تالْ و ژالْ، (حتّی) (مُعَرّي) ئەلێ: "ئەوەی لەسەرەمەرگ ئاوزینگان ئەدات، ئەوە تالایی (حیات)ە، قەی ئەکاتەوە". دەردە دیدەیەکی وایە، دەرمانی مردنە، ئەوی (أحمق) نەبی، پۆی هەلناخەلەتێ، بە (حُبّ)ی پابەند نابی (خاصّە) ئەوانەی لایان وایە، کە (حیاە)ی (اخرەت) هەمووی خۆشی و (سعادەت)ە (خاصّە) ئەوانە، ئەبوایە (أصلاً) (إلتفات) بە (حیات)ی (دنیا) نەکەن، (دائماً) ئارەزووی مەرگ بکەن، (مالْ)ی (دُنیا) کۆنەکەنەوە، ئەوەی هەیانە، بیتەخشن و بیبەخشن ﴿لَتُبْلَوُنَّ﴾ ئەی (مسلْمان)ینە، بە ئەوەندە قورتار نابن، ﷺ لەو (حرب)ە تووشتان بوو، (من بعد)یش (إختبار) ئەکرێن ﴿فِي أَمْوَالِكُمْ﴾ (خسارەت)تان

لێ ئەکەوێ دڵ لەدوای بەردەن، بۆ پاتاڵ (شەڕ) مەکەن ﴿وَأَنفُسِكُمْ﴾ لێتان ئەکوژرێ، ئەمرن، نەخۆش ئەبن، بەڵکوو ئەکەونە (أسارەت)یش ﴿وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ گوێتان لێ ئەبێ، لە (طرف) ئەوانەی (کتاب)یان دراوەتێ لەپێش ئێوە، (عُلما)ی (بنی إسرائیل) ﴿وَمِنَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوٓا۟﴾ وە لە ئەوانەی (شریك)بۆخوا پەیدا دەکەن لە (عەرەب) و (غەیر)ە (عەرەب)، (ثَنَوي) و (وَثَني) ﴿أَذًى كَثِيرًا﴾ قسەی ناخۆش، (طعن) لە (دین)تان، لە پێغەمبەرتان لە (کتاب)تان ئەدەن، (حالاً) ئەمە (دوام) ئەکا، (مُبشّرین)ی (مسیحی) (قُصور)ناکەن– (علی الإطلاق)، (تکرار)ی ئەو قسە چرووکانە ئەکەن، کە هەزار ساڵ پێش ئەوڕۆ گوتراوە، وە (جواب)ی درایتەوە، (إفترای)یان نایەتە (حساب) ﴿وَإِن تَصْبِرُوا۟﴾ ئەگەر (صبر) بکەن، لەسەر ئەو (شدائد)و (بلا)و (أذیّەت)ە ﴿وَتَتَّقُوا۟﴾ خۆبپارێزن لە (کید)یان ﴿فَإِنَّ ذَٰلِكَ﴾ ئەو بێژراوە، لە (صَبر) و (تَقوی) ﴿مِنْ عَزْمِ ٱلْأُمُورِ ﴿١٨٦﴾﴾ لەو کارانەیە، کە مەردانی (عالی همّەت) (قرار)ی لەسەر بدەن، (قرار)ی لەسەر بگرن، (آنە) (جناب)ی (حق) (میثاق)ی وەرگرت لە (أصحاب)ی گوزین، کە (ثابت) بن لە (مُقابل)ی (شدائد) وە پەرهێزکارین، (إشارە) ئەکا، بۆ نەشکاندنی ﴿وَإِذْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَـٰقَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَـٰبَ﴾ (ظاهر)ە لە (بنی إسرائیل)، (شامل)ی هەموو (أهل)ی (کتاب)ە، لە هەر (ملّەت)ێ بی ﴿لَتُبَيِّنُنَّهُۥ لِلنَّاسِ﴾ ئەوەی لە (کتێب)ەکەدایە، بۆ خەڵکی (بیان)ی بکەن ﴿وَلَا تَكْتُمُونَهُۥ﴾ هیچی بزر نەکەن (عهد)یان بەجێ نەهێنا ﴿فَنَبَذُوهُ وَرَآءَ ظُهُورِهِمْ﴾ زۆر نەچوو، فڕێ یاندا پشتی خۆیان، (إلتفات)یشیان نەکردێ، کوردی ئەڵێ: "هاویشتیە پشت گوێ یان" ﴿وَٱشْتَرَوْا۟ بِهِۦ ثَمَنًا قَلِيلًا﴾

ئەوە پیشەی بەد(أصل)انە، (خاصّةً) کە برسی بن ﴿فَبِئۡسَ مَا يَشۡتَرُونَ ١٨٧﴾ شتی پیس و خراپە، بەدە، ئەوەی ئەی کڕن بە (آیات)ی (کتاب)ی (إلهی)، ئێوە نەکەن وابن، ئەو (کتێب)ەی خوا ناردوویەتی بۆ ئێوە، (بَیان)ی بکەن بۆ (عالم)، هیچی مەشارنەوە، یەك (حُکم)ی (ألهي) بە هەموو (دُنیا) مەفرۆشن، هەرچەند (طعن) و (عَیب) و (عار)ی تیابیّ، بۆ ئێوە، (آیات) مەگۆڕن، (حتّی مِن حَیثُ المعنی) (مقصد)ی (إلهی) چیە، تیّ ی بگەن، (عمل)ی پیّ بکەن ﴿لَا تَحۡسَبَنَّ﴾ (یا رسول)ی گوزین ﴿ٱلَّذِينَ يَفۡرَحُونَ بِمَآ أَتَواْ﴾ وامەزانە ئەوانەی (کیف) خۆش ئەبن ، بەوەی پیّ یان (کَرَمْ) کراوە ﴿وَّيُحِبُّونَ أَن يُحۡمَدُواْ بِمَا لَمۡ يَفۡعَلُواْ﴾ پیّ یان خۆشە، (مدح) بکرێن بە شتیّ کە نەیان کردووە، (بخیل) زۆری (کَیف) پیّ دیّ (مدح)ی بکەن، بە (سخا)، (تدریس) ناکا، (کیف)ی دیّ بلّێن: "(ماشاء الله) شەوو ڕۆژ خەریکی (دەرس)ە". (تحریف)ی (کلام)ی خودا ئەکا، زۆر خۆشنوودە بلّێن: "(أمین)ی خودایە، (عماد)ی (دین)ە، (حافظ)ی (کلام)ی خوایە". ئەو (نوع)ە کەسە لە هەموو (ملّەت)ان زۆرن، ﴿فَلَا تَحۡسَبَنَّهُم بِمَفَازَةٖ مِّنَ ٱلۡعَذَابِۖ﴾ (حساب) مەکە ئەوانە (نجات)یان و قورتار ببن لە (عذاب)یّ (معلوم) ﴿وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ١٨٨﴾ (عذاب)یّ نایەتە (تقریر)، ئەوەندی نەبیّ، ئاگریّ زۆر بەئێشە ﴿وَلِلَّهِ مُلۡكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۗ﴾ پەکی بە (کفر)ی کەس ناکەوی، بە (أیمان)ی کەس قانزاجی پیّ ناکا ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ١٨٩﴾ (غنی)یە، (عالم) (إحتیاجی) بە ئەو هەیە، ، لەهیچ شت (عاجز) نیە، ئەتوانیّ (عذاب)یّ (الیمی) (الی الابد) بە ئەوانە بچێژیّ ﴿إِنَّ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ لە (إیجاد)ی ئاسمان و (أرض)، (عُلویّات) و (سُفلیّات) ﴿وَٱخۡتِلَٰفِ ٱلَّيۡلِ وَٱلنَّهَارِ﴾ کە لە (أثر)ی (وضع)ی ڕۆژ و زەمینە، (نورانیەت)ی

ئـەم (کشـافـەت)ی ئـەو ﴿لَأٓيَٰتٖ لِّأُوْلِي ٱلۡأَلۡبَٰبِ ١٩٠﴾ (أیـات)ێ (لا تُعـد ولا تُحصی)ی تیایە، بۆ ئەوانەی (صاحب) (عقل) بـن، پووچـەڵ نـەبن، ئەوانـە لـە (أیات)ی (عدیدە) ئەزانن (خالق)ی ئەوانە، لە (نهایەت)ی (غنـا) و (کبریـائی) و (علـم) و (قُـدرەت) و (رأی)یـە، (خـصوص) کەسـێ ئـەمڕۆ، شـتێ لـە (علـم)ی (طبیعەت) و (کیمیا) و (تشریح الابدان) و (فلك) بزانێ، ئەزانێ خوا چی (خلـق) کردوە، (عجایبات)ی وای تیایە، کە بە (خیال)ی (أوّلین)دا نـەهاتووە و ئـەزانی (سـعەت)ی (مُلـك)ی خـوای (عبـارەت) نیـە، لـە سـێزدە (کُـرە)ی وەك قەپێلکەپیازی بەسەریەکدا هاتوە، وە ئەزانێ (منظومة)ی (شمس)ی ئێمـە، بـە هەموو (سیّارات) و (أقمار)ی، (جُزء)ێ (مُحقّر)ە، لـە (منظومـات)ێ (لا تُعدُّ ولا تُحصی)ی، (شَمس) و (سیّارات) و (أقمار)ی دی ﴿ٱلَّذِينَ﴾ (ساحب)ێ هوش و (فکر)ێ ئەوتۆ ﴿يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمٗا وَقُعُودٗا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمۡ﴾ یادی خودا ئەکەن بە (حضور)ی (قلب)، (ذکر)ی ئەکەن بە (صفات)ی، بە (أفعال)ی شوناسـیان پـێ ی ئەبی، لێ ی (غافل) نـابن، لـە (حـال)ی راوەسـتان، دانیـشتن، سەرتەنیـشت ﴿وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلۡقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ﴾ چیە؟ چۆنە؟ چی تیایـە؟ (تفکّـر)ی تێ ئەکەن بە (نظر)، ئەگەنە (غور)ی، ئەزانن ئەو (صُنـع)ە (مُـتْقَن) و (مُحکـم)ە بەخوایە ئەکرێ، (علیم) و (قدیر) و (عزیز) و (حکیم) و (مُدبِّر) و (مُسخِّر) بی بۆ ئـەو (قُـوا)ی (هائلـە)-(بالخاصّـە)- ئـەوەی ئـەوڕۆ (کـشف) کرایـە، (مُحیّـر العُقول)ە (أوائل) ئەیان ووت: "ئافتاب سەد و شەست و شـەش هـەزار هەنـد و (کسور)ەکـی (ارض)ە" (حُکمـا)ی (عـصر) ئـەڵێن: "یـەك ملیـۆن و دووسـەد و پەنجا هەزار هەندێ (أرض)ە، (گەلاوێژ) سێ ئەوەندەی (أفتـاب)ە". (قـوّە)ی کارەبا،(رادیوم)،(أعصاب)ی(مُتفکِّر) سست ئەکا! ئەی(ألهی)(قَـوِیّ) و (مـتین) ئـەوە چ (قُـوەت)ە، چ (خارِقـة)یـە؟ ﴿رَبَّنَا مَا خَلَقۡتَ هَٰذَا بَٰطِلٗا﴾ خوداوەنـدا ئەمەت بەخۆڕایی (خلق) نەکردوە، بێ هوودەو بێ (فائدە) نیە، (لاشك) ئەوەی

(إستفادە) بکا لە (خلق)ی ئاسمان و زەمین بە (عِلم) و (عَمل) (أهل)ی (علم)ە لە( بَشر)، (حیات)ی (بَشری) کە (مَبدأ)ی (عِلم)یەتی (الان)، (مُوقّت)ە، چەندی ئەژیە-(نظر)- لە (حرکات)ی (فلکیّات) و (خواصّ)ی (بسائط) و (مرکّبات) و(تحریر)ی (عُلوم) و(فُنون) و (إختراع)ی (الات) و (أدوات) ئەکات-کەچی ئەمرێ وەك کەر بۆگەن ئەبی، ئەرزێ، ئەو (حیات)ە ئەگەر بە (هَدَر) بڕوا، (خلق)ی (سائر)ی (موجودات) پووچە، (لِهذا إیقان) ئەکەین، ئەبێ (بشر) تووشی (حیات)ێکی (أبدی) ببی، (خلق)ی (حیات) لەو (نقص)ە (نَجات) بدرێ کە (جِمادات) بەو (کَمال)ە، بێ ئەبێ (أحیا) (أکمل) بی، ئەزانی ئەو (خالق)ە (عظیم الشّأن)ە، (قابِل) نیە (عِصیان) بکرێ، (طبیعەت) بەو (طُغیان)ەی کە هەیەتی، بۆ ئەو (مُسخّرە)، (إنسان) بەو (ضِعف)ە چۆن (مُسخّر) نابی، کەسێك لە (جهل) و نەزانی (عصیان) بکا، شایانی (عذاب)ە، بۆیە ئەڵێن: ﴿سُبۡحَٰنَكَ﴾ (ألِهي) تۆ (مُنزَّە)ی لە (نقص) ئەبی ئەم (حیات)ە (إکمال) بکەی ﴿فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ١٩١﴾ لە (عذاب)ی ئاگرمان بپارێزی، (حفظ)مان بکەی، (أوّل) لە (نار)ی (جَهل) دووەم لە ئاگری (جهنّم) ﴿رَبَّنَآ إِنَّكَ مَن تُدۡخِلِ ٱلنَّارَ فَقَدۡ أَخۡزَيۡتَهُۥۖ﴾ خوداوەندا توو ئەگەر کەسێك بهاویە ئاگری، بەراستی (إهانەت) کردووە، (حقّاً) ئاگری (جهل) بۆ (نفس)ی (ناطقە) لەئاگری (حسّی) ناخۆشترە، (لکن) ئاگای لێ نیە ﴿وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنۡ أَنصَارٖ ١٩٢﴾ بۆ (ظالم)انی (مُتجاوِز) لە (حدود)ان، هیچ کەس (نصرەت)دەر و یاوەری نیە، نە بەکەس (هدایەت) ئەدرێن، نە بەکەس لە ئاگر (نجات)یان ئەبن، ﴿رَّبَّنَآ إِنَّنَا سَمِعۡنَا مُنَادِيٗا يُنَادِي لِلۡإِيمَٰنِ﴾ پەروەردگارا، ئێمە گوێمان لێ بوو، بیستمان بانگی (مُنادی)، بانگی ئەکرد، بۆ (إیمان)، ئەوانە ئەمانەن: لەرێ ی (فکر) و (نظر) (إیمان)یان بەخوا بووە، لەبەر (کمال) خۆیان بە (ناقص) زانانەوە، (حس)یان کردووە، کە (إحتیاج)یان بە (مرشد)ێك هەیە، وەك (بَعض) و (أهل)ی (عَقل) نەبوو ون، بڵێن: "(عقل) لە

(نُبـوَّەت) (أسـتفتا) پـەیا ئـەکا" ئـەو (مُنـادی)یـە (رسـول)ە، بـۆ ئەوانـەی (حاضر)ی (زمان)ی (رسالەت) پـەناه بـن، بـەڵام بـۆ ئێمـە (قـرآن)ە، ئـەویش (لازم)ە کەسێ (نِدا)ی پیٚ بکا، خۆی هەوار ناکا. ئـەو (مُنـادی)یـە (نـدا) ئـەکا ﴿أَنْ ءَامِنُواْ بِرَبِّكُمْ﴾ (إیمان) بە پەروەردیگاری خۆتان بهێنن، ئـەو خوایـەی کـە ئێوەی (خلق) کردووە، بەخێوی کردوون، (تربیە)ی داون ﴿فَـَٔامَنَّاۚ﴾ (بلا تَوَقُّفْ )بیٚ (طلب)ی (خارِقە)و (شواذ)، (ذاتـاً) (مُعجـزە) وەك (شـێخ ابـو علـی سـینا) ئەفەرمویٚ: "بـۆ (جَلـب)ی (عَـوام)ە، رام کردنیانـە، بـۆ (تعلـیم) و (تربیـە) بـۆ (خواص) (علم) (مُعجزە)یە" (علم) (مُعجزە)یە (نافع)ەی بـە (ثمرة)یـە، ئـەمرۆ تەماشـا بکـەن، (علـم) چـی ئـەکا؟ چ (آثـار)ێك لـە (قُـدرەت)ی پـەروەردگار، بەدەرئەخا، کەی (معجزە)و (خـوارق) ئەمـەی کـردوە؟ ئـەو (فوائـد)ەی داوە؟ ئەو (نَـوع)ە (أهـل)ی (لُـبّ) و (إیمـان)ە، لەسـەر ئـەو (حـاڵ)ە، (دُعـا) ئەکـەن ئەپارێنـەوە ﴿رَبَّنَا﴾ پـەروەردیگاری ئێمـە ﴿فَٱغۡفِرۡ لَنَا ذُنُوبَنَا﴾ لێمـان خـۆش ببە، گوناهمـان بزربکـە، (أثـر)ی نـەمێنیٚ ﴿وَكَفِّرۡ عَنَّا سَيِّـَٔاتِنَا﴾ (أعمـال)ی ناپەسـندمان (إسـقاط) بکـە، تووشـی (مُجـازات)مـان مەکـە ﴿وَتَوَفَّنَا مَعَ ٱلۡأَبۡرَارِ ١٩٣﴾ لەگەڵ پیاوی چاکانمان بمرێنە، بە (إیمان)یٚ (کامل) بیٚ گوناهو (سیِّئات) لە(دنیا) بچینەدەر ﴿رَبَّنَا وَءَاتِنَا مَا وَعَدتَّنَا عَلَىٰ رُسُلِكَ﴾ پەروەردیگاری ئێمە پێمان (إحسان) بکە، ئەوەی (وەعدەت) پیٚ داوین لە زوبانی پێغەمبەران، چ (عائد) بە (دُنیا)، چ (عائد) بـە (أخـرەت) ﴿وَلَا تُخۡزِنَا يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ﴾ ئابڕوومـان مەبە، (ڕەزیل)مان مەکە، لە ڕۆژی (قیامەت)، ئەمانـە زۆر لـە (نفـاق) ترسـاون، زەندەقیان لە (شرك)ی (خفی) چووە، کە (ریا)یە، (قابل)ە (إنسان) (عـەیب)یٚ بەخۆی (شك) بەریٚ، (عَـالِمُ ٱلسِّرِّ وَٱلۡأَخۡفَـى) ئاشـکرای بکـا، (حیـا)ی پـیٚ ببـا، ﴿إِنَّكَ لَا تُخۡلِفُ ٱلۡمِيعَادَ ١٩٤﴾ ئەزانن (خُلق)ی (وعد) (ممکن) نیە، (مقـصود)یـان

ئەوەیە، لەو گرۆهانە (حساب) بکرێن، کە (وەعدە)یان لەگەڵ دراوە، وە (ممکن)ە، (عبارەت) بێ لە زیندوو بوونەوە، لە (قیامەت) بۆ (حساب).

(أهل)ی (عِلم) (إتّفاق)یان هەیە، درۆ لە (وەعدە) بەچاکە، بۆخوا (مُحال)ە، (رەزیلی)یە، (نقص)ە، خوا (مُقدّس)ە لە کەمایەتی، (خلاف)یان هەیە لە (خُلف)ی (وعید)، (یعنی) بەشتی (خراپ)، (جَمهور) لایان (محال)ە (بعض)ێک (تجویز)یان داوە، (شێخی عربی) لە (فُصوص) زۆری (تَقویە) کردوە.

رۆژێ (عرض)ی (شێخ علی فندی)م کرد: "ئێوە چی ئەفەرموون، لە (خُلف)ی (وعید)؟" فەرمووی: "(سبحان الله) کەسێك خۆی بە (عبد)ی خوا بزانێ (إدّعا)ی (أدب)ی (مع الله) بکا، (مسئله)یەك (عنوان)ی (خُلف) بی چۆن (نسبەت)ی بۆ خودا ئەدا؟" من ئەڵێم: "ئەگەر تەماشای (قهر) و (غلبە)ی بکەی، هەردوولای (جائز)ە، (لاَ يُسْأَل عمَّا يَفْعَلُ) ئەگەر تەماشای (هدایەت) و (عدالەت)ی بکەی، هیچیان (جائز) نیە، وە (تفرقە)ی (نظر)، (تفرقە)یە" ﴿فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ﴾ خوای (تعالی)، خوای ئەوان (دُعا)ی ئەوانی (قبول) کرد، بۆ(خاطر)ی خۆیان بی (شُفعا) و (توسّط)ی ئەم و ئەو ﴿أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم﴾ پیّ ی فەرموون بەدروستی: "من بەخۆڕایی نابەم، کردەوەی کارزاریّ لەئێوە" ئەو کار پەردازە ﴿مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ﴾ (فرق)ی نێر و مێ نیە، ژن (رُکن)یّ (عظیم)ە، لە گەڵێ (غزا) هونەریاتیان کردوە، کە (مُوجب)ی (رضا)ی خوابی، ژنیش (عامِل)ە، وەك پیاو، وە بۆ (اساس)ی (تربیە) لە (فَوق)ی پیاوە، (معدن)ە، کانی یە، (مُربّی)یە، گەلێ جار ئەڵێم: "(دقّەت) بکەن هەر (عەشیرەت)ێك ئازابن و جەنگ أوەر، ئەوە ژنیان ئازان، دڵ (قوی)ن و بە(غیرەت)ن، هەر (عشیرەت)یّ حیز بن و ترسنۆك، ئەوە ژنیان بەترسن دڵ (ضعیف)ن، بیّ (غیرەت)ن"، وە لە (مجالس) (عرض)ی برادەران ئەکەم: "کورد بیّ دایکن، ژن لای ئەوان بیّ (قدر)ە، ژنەکان بنەلۆکن، بیّ (عزّەت) و (حُرمەت) بوو ون، بۆیە (کورد) نابنە (إنسان)، هەزار (ناصح)ی وەك من،

(شاعر)ی وەکی (حاجی قادر)، بۆ (تربیه)ی (قوم)، نابێ بـە دایکێکـی.چاك".
﴿بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖۖ﴾ هەردوولا لە یەکین، ئـەبێ لـە (أعمـال) و (مُکافـات) وەك یەك بن، ئەوە وایە، بۆ هەموو (علی السّوا)یە، بەلاّم (بعض)ێ لەگەڵ (بعض)ێ فرقیان هەم بە (نـسب)، وە شـتێ وا نـا ﴿فَٱلَّذِينَ هَاجَرُواْ﴾ ئەوانـەی (تـرك)ی (دار) و (دیـار)یـان کردیـە، بـۆ (نـصرەت)ی (دیـن) ﴿وَأُخۡرِجُواْ مِن دِيَٰرِهِمۡ﴾ (خاصّهً) ئەوانەی دەرکراون لە مەفتەنی خۆیان ﴿وَأُوذُواْ فِي سَبِيلِي﴾ (أذیـەت) دراون، لەرِێ ی مـن ﴿وَقَٰتَلُواْ﴾ (شـەر)یـان کـرد ﴿وَقُتِلُواْ﴾ کـوژران، لێ یـان کـوژرا ﴿لَأُكَفِّرَنَّ عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ﴾ بـەجارێ (محـو) و (إزالـە)ی (قبـایح)یـان ئەکەم، نە لە (دُنیا)، نە لە (عُقبـا) (أثـر)ی نـەمینێ، (ولـو) (ضـرر)یـش (عـام) بـووبێ، وەك (فـرار)ی (سـابق) و (تـرك)ی (موقـع)، (لکـن خـدمات)یـان هەیـە، (حقّ)ی ئەمەکیان هەیـە ﴿وَلَأُدۡخِلَنَّهُمۡ جَنَّٰتٖ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ﴾ ئـەو بەهەشتەی وا ﴿ثَوَابٗا مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۚ﴾ (عطا)یەکە لـە (طـرف) خـوا، لـە (وصـف)ی ئەو (ثواب)ە، زوبانی (مدح) لاڵە ﴿وَٱللَّهُ عِندَهُۥ حُسۡنُ ٱلثَّوَابِ ١٩٥﴾ بێ (نقص)، بێ (کـدر)، بـێ (مـنّ) و (أذی) بـێ (إنقطـاع) ﴿لَا يَغُرَّنَّكَ تَقَلُّبُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِي ٱلۡبِلَٰدِ ١٩٦﴾ (إنعام)ی (إلهی) لە (دنیـا) (عـامّ)ە، وە بـۆ ئەوانـەی (إیمـان)یـان بەخوا و بەرۆژی (قیامـەت) نیـە زۆرتـرە، زێـرا ئـەوان بـە (غـیر)ی (دنیـا) هـیچ (أمـل)یـان نیـە، ئەگـەر (ایمـان)یـشیان بـە (قیامـەت) هـەبێ، بـە (أُمنیـە)ی (شفاعەت) و (نسبەت)ی (أبا)یان (إعتنا)یان پێ نەماوە، بۆیـە (دائماً جـولان) ئەکەن، لەو شار بۆ ئەو شار، لەو (مملکەت) بۆ ئەو (مملکـەت)، بـە (تجـارەت) بە (قومار) بە (حیلە)، (أموال) کۆئەکەنەوە وا ئەبێ (غیرەت)ی (قومیەت)یان، (إتحـاد)یـان ئـەکا، بـە (حـرب)یـش (إسـتیلا) ئەکـەن، خـوا ئەفـەرموێ: "تـۆ نەخەڵەتێنێ، (جولان) و هات و چووی ئەوانەی (کُفر)یان کردیە، لە (مملکەت)،

نەڵێ ی: "ئەوانە، ئەگەر بێ (نصیر) و یاوەرن، بێ (حظ) و (نصیب)ن، بۆ وایە؟" ﴿مَتَٰعٞ قَلِيلٞ﴾ (تَقَلُّب) و (تَغَلُّب)ی ئەوانە (متاع)ێکی کەمە، (ماڵ)ێ کەم (قیمەت)ە (عمّا قریب) ئەبڕێتەوە، ئەگەر (مسلمان)ان بۆ (صلاح)ی (دین) و (دنیا) تێ بکۆشن، بە قسەی (رۆسا)ی (خائن) نەکەن، ئەمرۆ (دُنیا)یە، سبەی (قیامەت)، گوریسی (طمع)ی راخستوە، ئەڵێ ی: نامرێ! (توکل) بکە سەر خوا، خوا (رزّاق)ە، کەس (رزق)ی کەس ناخوا، (تقسیم)ی خوا براوەتەوە، بەو فێڵاویانە لە (کسابەت) سست نەبان، دەوڵەمەند ئەبوون، بە رێك و پێکی ئەیان توانی، (منع)ی (تجاوزات)ی (أجانب) بکەن، لە (تجارەت) لە (حرب) بیان شکێنن، ئەو (متاع)ە کەمەشیان، لە (أجانب) ئەکردە، قوزەقورت و سندان ﴿ثُمَّ مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُۚ وَبِئۡسَ ٱلۡمِهَادُ ١٩٧﴾ ئەو (مقام) و (مرجع) و جێگای (مُهیّا) کراوە، بۆ (کافر)ان ﴿لَٰكِنِ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوۡاْ رَبَّهُمۡ﴾ بە (حقّ)ی (تقوی) (إیمان)یان ببێ، هەر ئەو (مالك)ی رۆژی (جزا)یە ﴿لَهُمۡ جَنَّٰتٞ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَا﴾ قەد دەرناچن، ئەو بەهەشتە خۆشەی نا (مُتناهی)یەی ﴿نُزُلٗا مِّنۡ عِندِ ٱللَّهِۗ﴾ (نُزُل) بەدوو (ضمّة) بە (منزل) وە بەشتێ (حاضر) کرابێ، بۆ میوان، لە (أن)ی (نُزُول)ی (تقدیم) بکرێ، وە بە (طعام)ێ بە (بَرکەت)، وە بە(فضل) و (عطا) و (برکەت) ئەڵێن، هەمووی جوانە، (خاصّةً) (معنی)ی دووەم ﴿وَمَا عِندَ ٱللَّهِ خَيۡرٞ لِّلۡأَبۡرَارِ ١٩٨﴾ ئەو (وقت)ە ئەزاندرێ، کە خوا لە بەهەشت، بە (أهل)ی (تقوی)و (إحسان) (کرم) ئەکا ﴿وَإِنَّ مِنۡ أَهۡلِ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ (یهود) و (نصاری)، با (نجاشی)ش یەکێك بی لەوان، (طبیعی) ئەو (أُمّەت)ە (عظیم)انە یەك (نسق) نابن، (دوام) لەسەر (کُفر) و (سیئات) ناکەن ﴿لَمَن يُؤۡمِنُ بِٱللَّهِ﴾ بە (إیمان)ێ (مُکمل)، (مُطابق) و (موافق) ﴿وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُمۡ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِمۡ خَٰشِعِينَ لِلَّهِ﴾ بەدڵ ئەترسن لەخوا

الأكبر)" وەرئەگیرێ، وەپێی ئەڵێن: "(جهاد)ی (أكبر)" بەڵێ: وایە، ئەگەر پاش (جهاد)ی (أصغر) بێ، (مجاهدە)ی (نفس)، (جهاد)ی (أكبر)ە، ئەوانەی لە (غزا) دێنەوە، یا(غالب)ن، یا(مغلوب)ن، لە هەردوو (حاڵ) (مجاهدە)ی (نفس)ی پێ ئەوێ، تاكو نە (مغرور) بن، نە (مأيوس)، (حاصلی) (مجاهدە)ی (نفس) لە هەموو (حال)آند، (لازم)ە، (جهاد)ی (بالنفس والمال)، دیارە هیچ (حظ)ی (نفس)ی تیا نیە، وەئەوەی خەریكی ئیشی گەورە بێ، ئەبێ دەست لە سەرو (ماڵ) هەڵ بگرێ، (نفس)و (نفیس) (صرف) بكا، وە(إلاّ) (محال)ە بگاتە (مقصود): كەندەر بن (مرحلە)، سەر باختەن (أول) (قدم) أست ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ تَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ﴾ (توفّى) یا (ماضی)یە، یا (مضارع)ە (تتوفّى)یە، (ت)ێ یەكەی لێ فڕێداوە، (توفّى) شت وەگرتنەتیە بە تەواوی، (جمهور) ئەفەرموون: "(توفّى)ی (ملائكەت)، (عبارەت)ە لە (قبض)ی (روح)ی ئەوان كەسانەی، كە (ملائكەت) (روح)یان كێشاون، یا ئەیان كێشن ﴿ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ﴾ ئەو كەسانەش (ظلم)یان لە (نفس)ی خۆیان كردوە، كە لە (دار الحرب)دا ماون، (قبول)ی (ذلّەت)و (حقارەت)یان كردوە، لای (حقير) (ممكن)ە (حمل) بكرێتە سەر (توفّى) (حساب) لە ڕۆژی (جزا)، لە هەنگامی (محاسبە)، پێیان ئەڵێن، (سؤال)یان لێ ئەكەن ﴿قَالُوا۟﴾ (ملائكەت)ەكان، (إستفهام)یان لێ ئەكەن، لە رووی (توبیخ) ﴿فِيمَ كُنتُمْ﴾ لە چ (حاڵ)دا بوون بۆ لە ناو دوژمنی (دین)دا مانەوە، (هجرەت)تان نەكرد؟ وەك برادەرەكانی (دینی)ی، (دین) بە (قوّەت)و (محبّ)ی (حُرّيّەت) ﴿قَالُوا۟﴾ لە (جواب)دا ﴿كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِى ٱلْأَرْضِ﴾ بێ هێز كرابووین، لە (طرف)ی دوشمنی (دینی) وە(إلاّ) لە (قوّەت)ی (أيمان)مان (قُصور)مان نەبوو، لەبەر ئەوە نەمان ئەتوانی (هجرەت) بكەین ﴿قَالُوٓا۟﴾ لە (تكذيب)یان ﴿أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ ٱللَّهِ وَٰسِعَةً﴾ (عجباً) (أرض)ی خوا فراوان نەبوو

﴿فَتُهَاجِرُواْ فِيهَاۚ﴾ (حبس) کرابوون؟ ڕێتـان لێ گیرابـوو؟ هەریـەك لـە ڕێ هـەبوو، ئەویشتان لێ (سدّ) کرابـوو؟ (حاشا) (أرض)ێ (واسع)، ڕێیـەکراوە، خۆتـان خۆتـان بـێ دەسـەلأت کردبـوو، بـە (أسـارەت)و (عُبودیّـەت) (راضـی) بـوون ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ مَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُۖ﴾ ئەوانـە (مـسکن)یـان (جهـنّم)ە ﴿وَسَآءَتْ مَصِيرًا ٩٧﴾ (جهنّم) (مـأوی)یـە خراپـە، نافـەرموێ: "(خالـدین فیهـا)" دیـارە (أیمـان) بـە خۆڕایی ناڕوا، بەلأم ئەوەندەی بزانە، کەسێ (إشتراك)ی نەکردبی، با (وجود)ی لە ناو دوژمن دابی، (إحتیاج)ی بە (کلفەت)ی (هجـرەت) نەبووبێتـە (معـذرەت) وە(مـأوی)یـان (جهـنّم) بـی، ئەوانـەی (إشـتراك)یـان (بوجـە مـن الوجـوە)ی نەکردوە، وەلـەناو (مـسلّمان)آن دابـوون، (جـزا)ی ئەوانـە لـەوە نیـە قـسەی لێ بکـرێ ﴿إِلَّا ٱلْمُسْتَضْعَفِينَ﴾ بەڕاسـتی ﴿مِنَ ٱلرِّجَالِ وَٱلنِّسَآءِ وَٱلْوِلْدَٰنِ﴾ لام وایـە (إستثنای) ژن و مندالأن، (إشارە)یە کە ئەو پیاوە بێ هێزانە، لـە ڕیـزەی ژن و مندالأن بن، لە بێ (تحمّل)ی (مشاقّ)ی(هجرەت)، وە(إلاّ) (ولدان) —بێ (شُبە)— (داخل)ی (حساب) نیە، وە(أول)ی (ایەت) قسە لەو پیاوانەیە، کە بە بەهانەیـە (واهـی) (هجـرەت)یـان نـەکردووە، (زمخـشری) ئـەڵێ: (مُـراد) بـە (ولـدان) (مُراهق)ن" (سیّد رشید)یش (توجیە)ی بـۆ (ولـدان) ئـەکا (أمـا) لـە (عبـارەت) دوورە، وەهیچیان (توجیە) بـۆ ژنـان ناکـەن، (أنـە) ئـەوان (لازم)ی (هجـرەت) بکەن، (لکن) ئەگەر وابا (لازم) بوو (إستثنای) (عجـوزە) بکـرێ ﴿لَا يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلَا يَهْتَدُونَ سَبِيلًا ٩٨﴾ هـیچ (حیلـە)و فێڵیـان پـێ نـاکرێ، هـیچ ڕێـی دەرناکەن، (لاشـك) ئەوانـە (بوجـە مـن الوجـوە) (تکلیـف)ی (هجـرەت)یـان لێ ناکرێ ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ﴾ ئەو بی چارانە ﴿عَسَى ٱللَّهُ أَن يَعْفُوَ عَنْهُمْۚ﴾ (عفو)ی (إلهی) لـە ئەوانـەی کـە (معـذرەت)ی (حقیقـی)یـان هەیـە، وە(سـابقاً) (جنـاب)ی (حـق)، (طلب)ی (جهاد)ی لە (مسلّمان)آن کردبوو، بۆ (نجات) دانی ئەو بێ چـارەو بـێ

هێزانە وەلەو بابەتەدا، هیچ گوناهیان نیە، (داخل)ی (باب)ی (عسی) بن، (فکیف) بە (حال)ی ئەوانەی بێ (معذرەت)ن؟ ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَفُوًّا غَفُورًا ﴿٩٩﴾﴾ (لاشك) ئەو (عسی)یە، بۆ ئەوان لە (مقام)ی (تحقّق)ە ﴿وَمَن يُهَاجِرْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ يَجِدْ فِي ٱلْأَرْضِ مُرَٰغَمًا كَثِيرًا وَسَعَةً﴾ ئەوەی لە ڕێی خوا، (هجرەت) بکا، لە (أرض)، تووشی(حال)ێ زۆر نەرم و خۆش وفراوان ئەبی، کە لووتی دوژمنانی بە خۆڵ ببێ، ئەمە (مختار)ی (سیّد رشید)ە، (فی الحقیقه مُهاجر)ەکان، لە(أنصار)ان (رضی)ی خوایان لێ بی، (عطف)و نەوازشکیکیان دیت، (فوق التصوّر)، (حتی)ئی وایان هەبوو دووژنی هەبوو، بە برادەری (مهاجر) ئەفەرموو: "کامت ئەوێ بۆت (طلاق) بدەم، پاشان مارەی بکە" یاخود ئەوەی (هجرەت) بکا، تووشی (إضطراب)و (زەحمەت)و بێ ئارایش و (راحەت)ی ئەبی، کەسێ نەڵێ: :من ئەوسا (هجرەت)، کە (أصلاً) تووشی ناسازی نەبم" (أصل)ی (سفر) بێ (مشقّەت) نابی، (فکیف)ی (هجرەت) لە (دار)و (دیار)، لە ناو دوژمن، بەناو دوژمن؟ واش ئەبی ناگاتە (دیار)ی (مقصود) ﴿وَمَن يَخْرُجْ مِنۢ بَيْتِهِۦ مُهَاجِرًا إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾ ئەوەی بچێتە دەرێ لە (ماڵ)ی خۆی بە (مهاجری) بۆ لای خواو پێغەمبەری خوای ﴿ثُمَّ يُدْرِكْهُ ٱلْمَوْتُ﴾ با نەگاتە (خدمەت رسول) ﴿فَقَدْ وَقَعَ أَجْرُهُۥ عَلَى ٱللَّهِ﴾ (أجر)و (ثواب)ی ئەو کەسە، ئەکەوێتە، سەر خوا، وەك لە (حدیث) ئەفەرموێ: ".(إنّما الأعمالُ بالنیّات وإنّما لکلِّ إمریٔ ما نَوی... إلی آخره)" ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴿١٠٠﴾﴾ ئەوەی بۆ خوا (کان)ە بێ لە (صفات)، (یکون) وە، (أزلاً و أبداً) ناگۆڕێ، وەك (سابقاً) (عرض)م کردن، (سیّد رشید) لێرە ئەفەرموێ: "ئەو (آیات)ە، ئەوەندە پێکەوە نووساون، (فرجە)یەکی نیە، بۆ (سبب) (نزول)" (أمّا بعض)ە (مسلمان) وەك: (ضَمَرَ)ەی (بن)ی (جندب) وەك، (خالد)ی (بن)ی (حرام)، وەك (أکثم)ی (بن)ی (صَیف)ی لە (أثنا)ی

(هجرەت)دا، مردن، ئەو (ایەت)ە (شامل)ی ئەوان بوو، هەریەك وای گومان ئەبرد، کە لە (حق) یەکێ لەوانە، (ایەت) (نزول)ی کردوە، ئەو (وەقت)ە (هجرەت) زۆر بە (فائدە) بوو، بۆ ئەوان (نجات) لە (ذلّەت)و (عذاب)و (حقارەت)، بۆ (هەیئەت)ی (عُمومی)، (تقویە)و (إفشا)ی (مظالم)ی (قُریش)، (لاشك) (مُوجب)ی (تنفیر)ی دڵی (عالم) ئەبوو، ئەفەرموون: "(بعد الفتح) (هجرەت) نەماوە" بەڵێ بۆ(زەمان)ی پێغەمبەر وایە، (أما) دوای ئەو، بە (زەمان)ێ (حالێ) گۆڕا، دوشمن (إستیلا)ی (بلاد)ی (مسلّمان)ی‌نی کرد، گەلێ تووشی (عذاب)و (حقارەت) بوون، خۆلە (زەمان)ی ئێمە قسەی لێ ناکرێ (سواد)ی (أعظم) لە (مسلّمان)آن، لە ژێر (حکم)ی (أنگلیز)و (فرەنسە)و (رووس)دان، (حتّی) لە (زەمان)ێك، (سیاسی)ی (أنگلیز) ووتیان: "(ملك)ی ئێمە (خلیفە)یە" زێرا ئەوەندە (مسلّمان)ی لە ژێر (إدارە)ی ئەون، لە ژێر (إدارە)ی پادشاهی (إسلام) نین، وەگەلەکیان ئەڵێن: "(دولّەت)ی (أنگلیز) (أکبر دولەت)ی (إسلامی)یە" بەڵێ ئەمڕۆ (دین)و (خلافەت) —بەڵکوو(خوا)— (ملعبە)یەکی (سیاسی)یە بەدەست (سیاسیّون)آنەوە، لە (ناپلیون) (نقل) ئەکەن، ئەی ووت: "من (أیمان)م بە (أدیان) نیە، لە (مصر) (مسلّمان) بووم، لێرە (کاثولیك)م بچمە (قدس)، بۆ (خاطر) جوولەکان، (تعظیم)ی (هیکل)ی (سلیمان) ئەکەم" (شەڕ)ی ئەوانە (علاج) ناکرێ، مەگەر بە (سیاسی)یە وەکی ئەوان، ئەمەش لە (دین)ی (إسلام)دا نیە، یەکێك لە (سیاسیّون)ی (إیطالی) وتبووی: "وائەبیە مەردی (سیاسی)، بۆ (نیل)ی (مقصد) (دین)و (شرف)و (عهد)و پەیمان بهاوێتە ژێر پێ" ئەو (وەقت)ە گەلێ لە ئاروپایی یەکان (ذمّ)یان ئەکرد، (أما) ئێستا هەموو ئەوهان وە لەبەر نامەردی یە (إفتخار) ئەکەن، چونکی لەو رووەوە قانزاجیان کرد ﴿وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي ٱلْأَرْضِ﴾ بۆ (جهاد)، یا بۆ (غیر)ی (جهاد)، لە (خدمەت) پێغەمبەر بن، یان نا، بۆیە نافەرموێ: "(فی سبیل الله)" ﴿فَلَيْسَ عَلَيْكُمْ جُنَاحٌ﴾ (مضایقە)، (میل) لە (حق)، لەسەر ئێوە نیە

﴿أَن تَقْصُرُوا۟ مِنَ ٱلصَّلَوٰةِ﴾ لـە نوێـژ کـورت بکەنـەوە، لـە (هیئـەت)ی یـا لـە (أرکان)ی، یاله هەردووکی، بـە گوێرەی زەمـین و (زەمـان) ﴿إِنْ خِفْتُمْ أَن يَفْتِنَكُمُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟﴾ ئـەوە بـۆ ئەوانەیـە، کـە بـۆ (حـرب) بـچن، (أرض) بکوتنـەوە، (فتنــە)یــان بــە (إیــذا) فــەرمووە ﴿إِنَّ ٱلْكَٰفِرِينَ كَانُوا۟ لَكُمْ عَدُوًّا مُّبِينًا ﴿١٠١﴾﴾ دوژمنایەتیان ئاشکرایە، (إنتظار)ی (فرصەت) ئەکەن، زۆر (حظ) ئەکەن، ئێوە بە نوێژ خەریك بن، وەئەوان دەستی خۆیان بوەشێنن، (مخفی) نـەبی، (ظـاهر) وایە، ئەو (شرط)ە (قیـد) بـی بـۆ (حُکـم)ی (سـابق)، بۆیـە (بعـض)ە (أهـل)ی (علم) لایان وایە، ئەگەر (خوف) نەبی، (قصر) نابی، (لکن) لـە (روح المعـانی) ئەفەرموێ: "(جواب)ی ئەو (شرطه) (محذوف)ە، (یعنی) ئەگەر ترسان، دوژمن (تعرض)تان بۆ بکەن، بە شتێ، کەلەلاتان (مکروه) و ناخۆش بێ، لە (قتال) یا لە (غیر)ی (قتال) هیچتان لەسەر نیە، کە نوێژ کورت بکەنەوە، (ومـع هـذا)ش، گەلێکیان ئەفەرموون: "(أصـلاً) نوێـژ دوو (رکاعـەت) دوو (رکاعـەت) بـوو، بـۆ (مسافر) لەسەر (أصل) مایەوە، بۆ (حضری)، (غیر)ی نوێژی سبەینێ (مغرب) یەك، ئـەوانیتر دوو (رکاعـەت) دوو (رکاعـەت)یـان لێ (زیـاد) کـرا" نـازانم ئـەوە لەگـەڵ (عبـارت)ی (قـرآن) چـۆن رێـك ئەکـەوێ؟ (ذاتـاً) کـە ئـیش هاتـە سـەر (روایـات) مـن (مُعطّـل) ئـەبم، خـوا ئـەزانێ هـیچ (کیـف)م بـە چـەکبەردە چەکبەردەیان نایە، ئەوەی (حظ)ی لەم (منازعـات)ەیە، تەماشـای (تفسیر)ی (سیّد)ی (آلووسی)و (سیّد رشید) بکـا ﴿وَإِذَا كُنتَ فِيهِمْ﴾ لـەناو (مـسافر)انـدا بووی ﴿فَأَقَمْتَ لَهُمُ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ نوێژت بۆیان کرد، (یعنی) بووی بە (إمام)یان، بە (جماعەت) نوێژێ تەواوتان کرد، بە (إعتبار)ی (زەمان)، با تەواو نـەبێ، بـە (نظر) نوێژی (حضری) بێ (خطر)، یاخود (قامـەت)ت کـرد، بـۆ نوێـژ، (یعنـی) بانگت کردن، بۆ (أدا)ی نوێـژ بـە (جماعـەت) ئـەم (معنـا)یـە (مختـار)ی (سـیّد

رشید)ە، ﴿فَلْتَقُمْ طَآئِفَةٌ مِّنْهُم مَّعَكَ﴾ ببن بە دوو (طائفه)، یەکێکیان لەگەڵ توو راوەستن، لە (إبتدا)وە (إقتدا) بکەن ﴿وَلْيَأْخُذُوٓا۟ أَسْلِحَتَهُمْ﴾ با(طائفه)کەی تر لە(حراسەت)دا بی، بەلاّم (زێدە) (احتراس) (لازم)ە، ﴿فَإِذَا سَجَدُوا۟﴾ ئەو (طائفه) کە (سجده)یان برد لەگەڵ توو ﴿فَلْيَكُونُوا۟ مِن وَرَآئِكُمْ﴾ (طائفه)کەی تر، لە دوای ئێوە بن، ئاگاداری بکەن ﴿وَلْتَأْتِ طَآئِفَةٌ أُخْرَىٰ﴾ ئەوەی بۆ (حراسەت) وەستا بوون ﴿لَمْ يُصَلُّوا۟﴾ لەبەر (حراسەت) ﴿فَلْيُصَلُّوا۟ مَعَكَ﴾ لەگەڵ توو نوێژ بکەن ﴿وَلْيَأْخُذُوا۟ حِذْرَهُمْ وَأَسْلِحَتَهُمْ﴾ ئەڵێن: "ئەوا (داخل)ی نوێژ بووین، (أسلحه) فڕی ئەدەین، (آنه) تازە (أمر)یان ئەکاتی، بە چەك هەڵ گرتن ﴿وَدَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟﴾ (تمنّی) ئەکەن، (حظ) ئەکەن، ﴿لَوْ تَغْفُلُونَ عَنْ أَسْلِحَتِكُمْ﴾ ئێوە (غافل) ببن لە چەکی خۆتان ﴿وَأَمْتِعَتِكُمْ﴾ (لوازم)ی (سفر)، (یعنی) ئاگاداری (أمتعه)ی (سفر)یش بکەن، لێ ی (غافل) مەبن ﴿فَيَمِيلُونَ عَلَيْكُم مَّيْلَةً وَٰحِدَةً﴾ بە یەکبار (حمل)تان بکەنە سەر ﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ﴾ (بأس) لەسەر ئێوە نیە ﴿إِن كَانَ بِكُمْ أَذًى مِّن مَّطَرٍ أَوْ كُنتُم مَّرْضَىٰٓ﴾ لە (وەقت)ی باران، (إنسان) (لباس)ی تەڕ ئەبی، گران ئەبی، چەکیش هەڵبگری، زیاتر ئەکەوێتە (مشقّت) لە هەستان و دانیشتن، لە (وەقت)ی باران یا ئەگەر نەخۆش بوون، بە برین یا (غیر)ی برین ﴿أَن تَضَعُوٓا۟ أَسْلِحَتَكُمْ﴾ چەکتان دابنێن ﴿وَخُذُوا۟ حِذْرَكُمْ﴾ ئاگادار بن لە خۆتان (غافل) مەبن، دیارە ئەو بارانە (غیر)ی بارانی ولاّتی ئێمەیە، ئەمساڵ لە (أواخر) (شعبان) تا ئەمڕۆ کە یانزدەی (ذی القعده)یە، (متمادیاً) ئەباری (بَعضاً كأفواهِ القِرَب) دێتە خوارێ، کەس ناوێرێ، سەر لە کون بێنێتەدەر چ

جایە (شەڕ) کردن، وەچەك هەڵ گرتن؟! (أما) لەو (حاڵ)ەشدا، ئەبێ (مسڵمان) بە(حذر) بن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ أَعَدَّ لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا ﴿١٠٢﴾﴾ خودای (تعالی) دایناوە، بۆ ئەو (کافر)انە، (عذاب)ێك، کە پێی(رەزیل)و سووك (مُحقّر) ببن، بەو (شرط)ە، ئێوە بەبێ (مُبالاتی) لە (کیس) خۆتانی نەدەن وەدوور نیە بڵێین: "خوای (تعالی)، بە (صلات)ی (خوف)، (عذاب)ێ (مُهین) داناوە، بۆ (کافر)ەکان" (لاشك) ترس و هەراسیان ئەکەوێتە (قلب)، ئەڵێن: "ئەگەر ئەوانە زۆر بە (قوّەت) نەبن، بە (نصف)ی (عسکر) نەتوانن (مُقابلە)ی ئێمە بکەن، لە هەنگامی جەنگ و (جدال) ناتوانن بە (جماعەت) نوێژ بکەن" لام وایە (سیّد ی آلووسی) لە (نکتە)ی ئەو قسە نەگەیشتوە، بۆیە ئەفەرموێ: "(ولا یخفی بُعدُهُ)" ئەو قسە دوورە (وعلی کلّ حال) (مقصود) لەم (عذاب)ە، (عذاب)ی (آخرەت) نیە، (عبارەت)ی (دائر) بە (کیفیّەت)ی نوێژی ترس (مُختصر)ە، (حقاً) زۆر (مُناسب)ە نە (مجال)ی (تطویل)ی (صلات)ە، نە جێی (تفصیل)ی (عبارەت)ە، (حتی) (إعتنا)ی بە (إحتراز) و (إحتراس) لە نوێژ زیاترە، کەس بە (خیال)ی دا نەئەهات، (مادام) ئێمە بۆ خوا نوێژ ئەکەین، با دوو سێ (دقیقە) خوا ئاگاداریمان بکا، یا(صاحب)ی (شریعەت) بە (قوّە)ی (إعجاز) رایان بگری، لە(حملە)یان بخا، (سیّدین) ئەفەرموون: "شازدە (وجە)یان بۆ (صلاةُ الخوف) (نقل) کردوە" لای (أبنُ قیّم) (أصول)ی (صلاة الخوف) شەشە، زیاتری لا (ثابت) نەبوە، وەئەو قسە لای (حافظ أبنُ حجر) (مُعتمد)ە، (سیّد رشید) شەش حەوت (نوع)ی (ذکر) کردوە، (سیّدی آلووسی)یش (تفصیل)ێ (مناسب)ی هەیە، ئێمە (مختصراً) دوو (نوع)یان (ذکر) ئەکەین: یەکیکیان (بنا) لەسەر ئەمە، کە (صلاة الخوف)ن یەك (رکاعەت)ە، (طائفە)یەك (إقتدا)یان بە پێغەمبەر کرد، (طائفە)کەی تر لە (مقابل)ی دوشمن راوەستان، پاش (سجدە)و (تحیّات) خوێندن، (سلام)یان دایەوە، پێغەمبەر لەو (مدّە)دا، راوەستا، ئەو (طائفە) رۆیشتن، بۆ (وجە)ی

(عدوّ)، ئەوانیتر هاتن، (إقتدا)یان بە پێغەمبەر کرد، یەك (رکاعەت)یان لەگەڵ ئەو کرد هەموو بەیەکەوە (سلام)یان دایەوە، (وجە)ی دووەم: (مبنی)یە لەسەر ئەمە کە (صلات)ی (مسافر) لە دوو (رکاعەت) کەمتر نابێ، ئەفەرموون: "(طائفە)ی (أول) پاش ئەوەی (مفارقە)یان کرد، (رکعەت)ێکیان سەر بەخۆ کرد، لەو (مُدّە)دا (إمام)ی (رُسل) بە پێوە وەستا، کە ئەمانە (سلام)یان دایەوە، ئەونیتر هاتن (إقتدا)یان کرد، پاش (سجدە)، (حضرەت)ی (رسول) دانیشت لە (جلسە)ی (تحیّات)، تا ئەوانە (رکعەت)ێکی تریان تەواو کرد، لەگەڵ (إمام) (سلام)یان دایەوە، (باقی) (وُجُوە) لە (کُتُب)ی (تفسیر) و (حَدیث)و (فقە) (بیان) کراوە ﴿فَإِذَا قَضَيۡتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ بەو جۆرەی (بیان) کرا، ئەگەرچی (رُوات)و (أئمە)ی (إجتهاد) لە (وُجُوە)و (ترجیح) (مُختلف)ن ﴿فَٱذۡكُرُواْ ٱللَّهَ قِيَٰمٗا وَقُعُودٗا وَعَلَىٰ جُنُوبِكُمۡۚ﴾ لە (ذکر)ی خوا (غافل) مەبن، (حرکات)و (سکنات)تان، بۆ خواو بە یادی خوا بێ ﴿فَإِذَا ٱطۡمَأۡنَنتُمۡ﴾ دڵتان (قرار)ی گرت، ترس نەما، کەوتنە (أمنیّەت) ﴿فَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَۚ﴾ بە تەواوی، (أرکان)و (هیئات)و (أبعاد)و (سُنن)ی ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ كَانَتۡ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ كِتَٰبٗا مَّوۡقُوتٗا ١٠٣﴾ نوێژ لەسەر (إیمان) داران چەسپاوە (صاحب)ی (وەقت)ە، (وەقت)ی (مُعیّن)ە، (مُطلَقە) (مُنْتَشِرە) نیە، (وقتیە)یە (معیّنە)یە، بە گوێرەی (وەقت، لازم الأدا)یە (مادام الآمکان) ئەبێ بیکەن، (حقیقە مُحاربە)ی (أیّام)ی (سعادەت)و (زمان)ی دوای ئەو، نوێژ بە هەر جۆرێ بوایە، (ممکن) بوو، وەئەکرا، (لکن) (حرب)ی (زمان)ی ئێمە، زۆر (هائل)ە چ بۆ (أفراد)، چ بۆ (قوماندان)، بە (غیر)ی (دقّەت)و نیگاهداری (حرکات)ی (خصم) چیتریان پێ ناکرێ، لە هەر (طرف) لە یەك (ساحە)ی (حرب)، چارسەد، پێنج سەد، (عورادە)، (هەوان)، تۆپی (سریع) ئاتەش، هەزار شەست تیر، (تعبیە) ئەکرێ،

لە (بعض)ە جێ –وەك (چەناق قلعە)، لە (بحر)ەوە، (دونانما)، پڕ لە (عسكر)ی بێ شومار، لە (هوا) (طیّارە)، (شرابنێل)، وە لە هەمووی (مُصیبەت) تر (لُغم)ی دوژمن، لە (طرف) خۆی بۆ ژێر (ئۆردوو)ی (مقابل)ی، وەك كەهرێز، (أرض) ئەكۆڵێ، پڕی ئەكا، لە باروت و ساچمە، لەناكاو ئاگری ئەدا، بە (آن)ێك (ئۆردوو)ێك ژێر بەرەو ژوور ئەكا، ئێمە كە بارانی (طیّارە)مان دیت، لە شاری (كۆیە)، (بعض)ە (بۆمبا) بەبەرد، یا بە جێیە رەق ئەكەوت، (شهقە)یەكی وای لێ ئەهات، لە (فوق)ی (صاعقە)ی هەوری (مُتراكم)ی بە (قُوّەت)، لەو (آن)ەدا، (دەهشەت)ێ (إستیلا)ی (إنسان)ی ئەكرد، (إنسان) ئاگای لە مردنیش نەدەما، لەو (نوع)ە (حرب)انە نوێژ چۆن ئەكرێ؟! ئەوی نوێژ لەسەر ئەو (محارب)انە (فرض) بكا، (مقصد)ی ئەوەیە، لای خوا گوناهباریان بكا، (مع أنە) (عسكر)ی بێ چارە، (روح)ی لەسەر دەست داناوە، لە رێی خودا بەختی ئەكا، لەو (وەقت)ەدا، (خدمەت) لەوە گەورەتر ئەبی ﴿وَلَا تَهِنُوا۟ فِى ٱبْتِغَآءِ ٱلْقَوْمِ ۖ﴾ ئێوە سست مەبن، سستی مەكەن، لە (طلب)ی ئەو (قوم)ە، كە (مُحارب)ن لەگەڵ ئێوە، نە بە (إشتغال) بە نوێژو رۆژوو (سائر)ی (عبادات)، نە بە (جبانەت)، نە لەبەر (تحمّل)ی ئێش ﴿إِن تَكُونُوا۟ تَأْلَمُونَ فَإِنَّهُمْ يَأْلَمُونَ كَمَا تَأْلَمُونَ ۖ﴾ وەلەبەر بێ (إشتغال)ی بە (عبادەت) لێتان (غافل) نابن، ئەوان لە ئاسن و بەرد نین، وەك ئێوەن، ئێشیان پێ ئەگا، وەك ئێوە ئێشتان پێ ئەگات ﴿وَتَرْجُونَ مِنَ ٱللَّهِ مَا لَا يَرْجُونَ ۗ﴾ ئومێدتان هەیە، لە (خدمەت) خوا، بەوەی ئەوان ئومێدیان نیە، ئومێتان بە (رضوان)و (مغفرەت)و بەهەشتی خوایە ئەو (ایەت)ەش زۆر (مُنتظم)ە لەگەڵ پێشەوە، (حاجەت) بە (سبب)ی (نزول) ناكا، وەتێگەیشتنی (معنا)ی پەكی لەسەر (بیان)ی (سبب)ی (نزول) نەكەوتوە ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ١٠٤﴾ ئێوەش بە (مُقتضا)ی (علم)و (حكمەت) رەفتار بكەن، زۆر دوورە، لە (علم)و (حكمەت)

ئەوان لەرێی (طاغوت)ەجان إفشانی بکەن، (بلا وَهَن) و (فُتور) تێ بکۆشن، ئێوە لە رێی خوا سستی بنوێنن، ئەوان (تحمَل)ی (آلام)و (مشاق) بکەن، ئێوە نەی کەن ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ﴾ (قرآن)ی (کریم) ﴿بِٱلۡحَقِّ﴾ (أجْلی دلیل) لەسەر (حقیّەتی) (قرآن) (رعایەت)ی (أحوال)و (أوقات)ە، بێ (میل)و (محابا)یە ﴿لِتَحۡكُمَ﴾ (حکم)ی (إیجابی)و (سلبی)و (قضائی) ﴿بَيۡنَ ٱلنَّاسِ﴾ بێ (تفریق) لە (بین)ی خزم و بێگانە، (مؤمن)و (مُنافق)، (مُصدّق)و (مُکذّب) ﴿بِمَآ أَرَىٰكَ ٱللَّهُۚ﴾ بەوەی کە خوا نیشانی تووی داوە، کە (حقّ)و (عدالەت)ە، وەك (سابقاً) فەرمووی: "(رسول) بۆیە ناردراوە، کە بە (إذن)ی خوا (إطاعە) بکرێ، وە(رسول)یش (مأمور)ە، کە بە (عدالەت) (حُکم) بکا" (لاشك) (إتمام)ی (صلات) لە (أمنیّەت)و (تخفیف)ی لە (سفر)، لە (وەقت)ی (خوف)، لە (تمامی)ی (عدالەت)ە ﴿وَلَا تَكُن لِّلۡخَآئِنِينَ خَصِيمٗا ١٠٥﴾ (ولو) لە (أُمور)ی (حربی)ش بە (إفشا)ی (أسرار) (خیانەت)یان کردبی، مەبە دوژمنی ئەوان، بە(نوع)ێ (معاذ الله)، (نوعاً إنحراف) لە (عدالەت) بکەی، (مُفسّر)ەکانی تر ئەفەرموون: "لەسەر ئەوان (دفاع)و (خصام) مەکە، لەگەڵ (أبریا)یان" (فاْختَر لنَفسكَ ما يَحلو" ﴿وَٱسۡتَغۡفِرِ ٱللَّهَۖ﴾ لە (میل)ێك، لە (خاطر)ێك، بە دڵی (مبارك) تا (عُبور) بکا، لە (صفوەت)ی (قلبی) نەوەشێتەوە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ١٠٦﴾ هەرکەسێ (ندامەت)و پەشیمانی بکێشێ خوا(تجاوز)ی لێ ئەکات ﴿وَلَا تُجَٰدِلۡ عَنِ ٱلَّذِينَ يَخۡتَانُونَ أَنفُسَهُمۡۚ﴾ (ولَوْ أقرب الناس أليك)ە بێ، کەسێ لەو (نوع)ی (وەقت)ە (خیانەت) لەگەڵ (قوم)ی خۆی بکا، (خیانەت) لەگەڵ خۆی ئەکا ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُحِبُّ مَن كَانَ خَوَّانًا أَثِيمٗا ١٠٧﴾ خوای (تعالی) کەسێکی (خائن)و زۆر رۆچووبی، لە گوناە، خۆشی ناوێ، تووش خۆشت

نەوێ، وە(مدافعە)ی لەسەر مەکە ﴿ يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱلنَّاسِ ﴾ ئەو (خائن)انە خۆیان بزر ئەکەن لە (إنسان)آن، ئەتوانن فێڵیان لێ بکەن، (خیانەت)ی خۆیان داپۆشن ﴿وَلَا يَسْتَخْفُونَ مِنَ ٱللَّهِ ﴾ خۆیان پێ بزر ناکرێ لە خوا، ئەو (نوع)ە کەسانە لە هەموو (زەمان)ێك زۆرن، (خصوصاً) ئەوانەی (إنتساب)یان لەگەڵ (طریقەت)آن هەیە، لە مەیانی (إنسان)آن (نوع)ێکن، لە (خُلوەت) (نوع)ێ ترن:

چون بە (خُلوەت) میرەسەند، (إنکار)ی دیگەر میکونەند

(حال)یش وایە ﴿وَهُوَ﴾ خوای (تعالی) ﴿مَعَهُمْ﴾ لەگەڵ ئەوانە، ئاگای لێ یانە ﴿إِذْ يُبَيِّتُونَ﴾ (وەقت)ی کە (جزم) دێنن بە شەو ﴿مَا لَا يَرْضَىٰ مِنَ ٱلْقَوْلِ ۚ﴾ (غیر)ی ئەو (قول)ە، کەتوو ئەی فەرمووی، وە ئەو (قول)ە کە لە (خدمەت)ت ئەی لێن ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا يَعْمَلُونَ مُحِيطًا ﴿١٠٨﴾﴾ (عمل)ی (ظاهری)و (باطنی) ئەوان لە خوا بزر نابێ، بە هیچ (وجه) (أسرار)ی ئەوان لە (علم)ی (مُحیط)ی (کبریائی) دەرناچی ﴿ هَٰٓأَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ جَٰدَلْتُمْ عَنْهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ﴾ ئێوە ئەی ئەوانەی کە (مدافعە) ئەکەن لەسەر ئەو (خائن)آنە، ئەوا (مُجادلە)تان کرد، لە (خدمەت) پێغەمبەر یا ئەم و ئەو لە (دنیا) ﴿فَمَن يُجَٰدِلُ ٱللَّهَ عَنْهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴾ کێ لە (طرف) ئەوان، لە (طرف) داری ئەوان، (مجادلە) لەگەڵ خوا ئەکا، چۆن (خیانەت)ی ئەوان لە خوا بزر ئەکەن؟ ئەو (ایەت)ە (شاهد)ە، کە (حضرەت)ی (رسول) (مجادلە)ی لە بری ئەوان نەکردوە، وە(لا تُجادلوا)ی پێشەوە (تعریض)ە ﴿أَم مَّن يَكُونُ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا ﴿١٠٩﴾﴾ ئەگەر (محامی)یان (أیّام)ی ئێمە، (أیمان)یان بە رۆژی (جزا) هەبا، (قط) بۆ (خائن)آن (أوقاتی)یان نە ئەکرد، بزانین لە رۆژی (قیامەت) چۆن هەمووی (وەکیلی)یان بۆ ئەکەن؟ ﴿ وَمَن يَعْمَلْ سُوٓءًا ﴾ خراپە بکا، دەر(حق) خەلکی ﴿أَوْ يَظْلِمْ

نَفۡسَهُۥ﴾ (مُجادله)و(مُدافعه)و (مُحامیەتی) عمرو و (زید) بۆئەو کەلك ناگرێ ﴿ثُمَّ يَسۡتَغۡفِرِ ٱللَّهَ﴾ چارە (إستغفار)و (تۆبە)یە ﴿يَجِدِ ٱللَّهَ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ١١٠﴾ (لازم)ە، (قبل الفوات) چارەسازی خۆی بکا، خۆی لە (رەحمەتی) خوا (محروم) نەکا ﴿وَمَن يَكۡسِبۡ إِثۡمٗا﴾ ئەوەی گوناهێ بکا ﴿فَإِنَّمَا يَكۡسِبُهُۥ عَلَىٰ نَفۡسِهِۦۚ﴾ ئۆبالی لەسەر خۆیەتی (نفس)ی خۆی (ملوّث) ئەکا ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ١١١﴾ (إستکمال)ی (نفس) بە (علم)و (فضائل)ی (خلاق)و (محاسن)ی (أعمال)، (مُقرّب)ی (إنسان)ەلە خوای (علیم) و (حکیم)، (إنسان) ئەوەیە (نفس)ی خۆی لە (دنائەت) و (خسّەت) (محافظه) بکا ﴿وَمَن يَكۡسِبۡ خَطِيٓـَٔةً﴾ گوناهێ کچکە ﴿أَوۡ إِثۡمٗا﴾ گوناهێ گەورە ﴿ثُمَّ يَرۡمِ بِهِۦ بَرِيٓـٔٗا﴾ دوایە بیهاوێتە کەسێ بێ (خطا)و گوناه ﴿فَقَدِ ٱحۡتَمَلَ بُهۡتَٰنٗا﴾ لە خۆی بار کردوە، شتێ، کە (إنسان) لە بیستنی (حیرەت) ئەی گرێ، چۆن ئەو (جسارەت)ە ئەکا؟ ﴿وَإِثۡمٗا مُّبِينٗا ١١٢﴾ گوناهی بوختانی هوەیدا، (دنائەت)ێ وایە، هەندە ئەگوترێ: کە گوناهێ ئاشکرایە، (حتیّ) ئەگەر گوناهێ کچکەش بێ، بەو (واسطه)ە ئەو (إسناد)ە، ئەبێتە گوناهێکی گەورەو (بیّن) ﴿وَلَوۡلَا فَضۡلُ ٱللَّهِ عَلَيۡكَ وَرَحۡمَتُهُۥ﴾ ئەگەر (فضل)و (رەحمەت)ی خوا لەسەر توو، نەبی، نەبایە، بە (وحی) گەلێ (خفایا)و (منویّات)ی (خائن)آنی، بۆ توو دەرنەخستایە ﴿لَهَمَّت طَّآئِفَةٞ مِّنۡهُمۡ﴾ لە (طرف) دارانی (خائن)آن ﴿أَن يُضِلُّوكَ﴾ (حقیقەت) لە توو بزر بکەن، (اما) لە ترسی ئاشکرا بوونی ئەو (همّە)، نەیان کرد، (یعنی) (همّ)یشیان نەکرد، ج جایە (تشبّث)ی پێ بکەن؟ (أَبُو البقا) (جواب)ێکی، بۆ (لولا) (مُقدّر) کردوە، من لە (رسول)ی (هادی)

شەرم ئەکەم (ذکر)ی بکەم، وە(منشأ)ی (غفلەت)ە، لەو (نکتە)ی کە ئێمە (إشارە)مان بۆ کرد، ﴿وَمَا يُضِلُّونَ إِلَّآ أَنفُسَهُمْ﴾ (حاشا) کەس بتوانێ، ڕێ لە تۆ بگۆڕێ ئەگەر کەسێ ئەو (همّە) بکا، خۆی گومراه ئەکاو بەس ﴿وَمَا يَضُرُّونَكَ مِن شَيْءٍ﴾ بە هەر (نوع)ە (خیانەت)ێ بێنە پێش لەگەڵ تۆ، (أدنى) (ضرر)ێ بەتوو ناکەیەنن، لام وایە (أبو مسلم) لەبەر ئەو (جملە)یە، (تفسیر) (إضلال) بە (إهلاك) ئەکا ﴿وَأَنزَلَ ٱللَّهُ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَعَلَّمَكَ مَا لَمْ تَكُن تَعْلَمُ﴾ لا پاش ئەوەی، توو بوویە (مَهْبَط)ی (وحی) (إلهی)، (منبع)ی (علم)و (حکمەت)، کێ ئەتوانێ تۆ (إضلال) بکا؟ (حق)ت لێ بگۆڕێ؟ وە(ألبتە) (إعتنات) ببێ، لە (شەڕ)ی ئەوانە (حفظ)ت ئەکا، کە هیچ(ضرر)ت لە ئەوانەوە پێ نەکات ﴿وَكَانَ فَضْلُ ٱللَّهِ عَلَيْكَ عَظِيمًا ١١٣﴾ (سوابق)ی (فضل)و (عنایەت)ی خوا، (شاهد)ە لەسەر (لواحق)ی، ئەو (فضل)ە، دەربارەی توو، (دائم)ە ناگۆڕێ، (زوال)ی نابێ، لەو (تقریر)و (تفسیر)ە، دەرئەکەوی کە ئەو (آیات)ە لە (غایەت)ی (إتّصال) دایە، لەگەڵ (آیات)ی (سابقە)ی وە(مُفسّر)ەکان چەند (وقایع)یان (نقل) فەرمووە، گێڕاویانە بە (أسباب)ی (نزول)، منیش (على سبيل الأختصار) (بیان)یان ئەکەم، دوای (تفسیر) ﴿لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَىٰهُمْ﴾ ئەوانەی کە (یبیّتونَ مالا یَرضی من القَوْل) لەگەڵ یەك فسکە فسکیان ئەکرد، گۆی یا بۆ (مُصالحە)ی (عامّە) (تدبیر)و (مُشاوەر)ە ئەکەن، (جناب)ی (حق) ئەفەرموێ: "(خُلوەت)و قسە بە دزیەکانیان، زۆری هیچ (خێر)و (فائدە)ی تیا نیە"، بێ (خێر)ی (نجوا)یان، لە بێ (خێر)ی خۆیانە کە (میل)یان لە (خێر)و چاکە نیە، بۆیە ئەفەرموێ: ﴿إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ﴾ (کأنە) ئەفەرموێ: "(خێر) لەو (خُلوە) کردنە نیە، (إلّا) کەسێکی (أمر) بکا، بە (صدقە) یا بە چاکە" دوور نیە، لەو گروهە کەسێ

ببێ (أمر) بکا، بە پەخشین، یا بە شتێ چاك ﴿أَوْ إِصْلَٰحٍ بَيْنَ ٱلنَّاسِ﴾ (طرف) داری (سلم) بی، (ولو سیاسة) بێ؟ وەك (سیاسیّون)ی (أيّام)ی ئێمە، لە پاش ئەوە، ﷺ (إستیلا)ی (دنیا)یان کرد، چەند (تاج)و تەختیان سەرنگوون کرد، (نائل)ی (مراد) خۆیان بوون، بوون بە (طرف) داری (صُلح)و (مُسالمە)ن ئەڵێن: "هەموو (بشر) یەك (عائلە)یە، ئەبێ هەر کەس بۆ (مصالح)ی (بنی) (نوع)ی خۆی، بێ (تفریق)ی (دین)و خوێن و (دم)، (سعی) بکا" (أمّا صولجان)ی (سیادەت)ی (برّ)و (بحر)و (هوا) هەر لە دەست ئەودابی، ئەو (هذیانات)ە، (مع الأسف) (تأثیر) لە (مسلّمان)آن ئەکا، دەماریان ئەمرێ، (طاقەت)ی باڵە فڕکەیان نامینێ، ئەوجا بە تەواوی (إستیلا)یان لەسەر ئەکرێ، بەلآم (قابل)ە، لە (بشر)دا –(نادراً)– (بعض)ە (أشخاص) هەبی، (عن صمیم القلب) ئارەزووی (توحید)ی (بشر) بکا، (مُنافرە)ی (دینی)و (سیاسی)و (عرقی) لە (بین)دا نەمینی، (صلە)ی (رەحم)ی (عُمومی) –(بعد الإنقطاع)– (وصل) بکرێ، وەك لە (صدر)ی (سورەت) رابورد، یەکێ لە (عُلما)ی (طبیعەت) ئەڵێ: "ئێستا (علم) زۆر (ناقص)ە، زێرا (سبب)ی بە (سوء)ی (سیاسەت)ی (دول)، (ملا)یەکان (مُلاقات) لەگەڵ یەك ناکەن، (عالم)ی (ألمانی) لەگەڵ (عالم)ی (أنکلیزی)و (فرەنسەیی) بۆ (مداولە)ی (أفکار)، لەسەر (أسرار)ی (طبیعەت) لە جێیەك گرد نابنەوە، (وکذا، سائر)ی(عُلما)(دول)ی (مُحاربە)و (مُعادیە)، پێش ئەمڕۆ دوو (عائق)ی هەبوو، یەکی (دین)، ئەومان –(مهما أمکن)– (إزال)ە کرد، ماوەتەوە (عوایق)ی (سیاسەت)، ئەمە (إزالە) ناکرێ، (مع الاسف) (علوم) بە تەواوی (ترقّی) ناکا!" (فی الحقیقەت) (أیجاد)ی ئەکرد، (أهل)ی (علم) لە هەر (فرقە)و (أمّەت)ێ بی، بە یەك (کتلە حساب) بن، (عداوەت) نەهاوێنە دڵی خۆیان، (أما بالعکس)، ئەو (بُغض)و (نفاق)ی لە (بین)ی (ملا)یان دا هەیە لە (بین)ی (عوام)دا نیە، بەڵکو (عداوەت)ی (عوام) (منشأ)ی لە (عداوەت)ی (ملا)یانە

﴿وَمَن يَفۡعَلۡ ذَٰلِكَ﴾ ئەوەی ئەوە بکا،(یعنی)(أمر)بە(صدقە)، بە (معروف) بە (إصلاح)، یاخود ئەوانە بکا ﴿ٱبۡتِغَآءَ مَرۡضَاتِ ٱللَّهِ﴾ بۆ (طلب)ی (رضا)مەندی خوا ﴿فَسَوۡفَ نُؤۡتِيهِ أَجۡرًا عَظِيمًا ١١٤﴾ (حاشا) ئەو(مکّار)انە ئەو (سیاسیّون)انە، (مقصود)یان، (رضا)ی خوای نیە، (سواد)ی (أعظم)یان (إیمان)یان بە خوا نیە، هەرچی بیکەن، هەرچی بیلێن، هەمووی (مکر)ە، حوقّە بازی، هەڵخەڵەتاندنی، بێ هێزانە، (أمریکانی)، (إنکلیز)، (فرەنسە) (ئەلمانیا)، (سائر)ی (دول)ی(غرب) (بنا)ی (مستشفی)و (مکاتب)یان، بۆ (سعادەت)ی (بشر)ە؟ بۆ (إرتقا)ی (إنسان)ە؟ ئەی وای، کەسێك ئەو گومانە ببا، (جاهل)ە، نەفامە! بە (غیر)ی (هدم)ی (دین)و (حق)و (شرف)ی (بشری) هیچ (غرض)یان نیە، (وعد)ی (ویلسون)و (مبشّر)ان بۆ چیە؟ (ضُعفا) لە چەنگ (أقویا) (نجات) بدەن؟ (إنسان) لە (عذاب)ی (قیامەت) قورتار بکەن؟ کێ ئەو (خیال)ە ئەکا؟ مەگەر کەسێ (دماغ)ی وەك ناوکە کدوو بێ، کەڵەیە مێشکی تیابی، ئەو (تورەهات)ەی پێوە نانووسێ ﴿وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ﴾ ئەو (عصیان)ی پێغەمبەر بکا، لە (أمور)ی (خصوصی) خۆی ﴿مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ﴾ بە (دلیل)و (برهان) بۆی (ظاهر) بوو، ڕێی ڕاست زانی، هیچ (عذر)و بەهانەی نامێنێ ﴿وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ لە (مصالح)ی (عامّە) دوای ڕێ یەك بکەوێ، (غیر)ی ڕێی (أهل)ی (إیمان)، ڕێی (مسلمان)ان: (إطاعە) (خلوص)ی (قلب)ە، (إبتغا)ی (رضا)ی خوایە، (إیمان)ێ بێ (شائبە)ی (شرك)و ڕوو (ریا)یە، (تمسّك) بە (آیات)ی (بیّنات)ی (قرآن)و (أکوان)ە ﴿نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ﴾ (ردّ)ی ئەکەینەوە، ئەو شتەی ڕووی تێ کردووە، (جبراً وقهراً)، نای هێنینەوە ڕێی ڕاست، هەرچی ئەی کا، بابیکا، ڕوو لە هەرچی ئەکا، با ڕووی

تێ بکا، (إنسان) لە (أول وهله)وە (قابل)ە، بۆ (أنواع)ی(اشیا)، وەك (هَیُولا) (قابل)ە بۆ (صُور)ی (مُختلف)ە ﴿وَنُصْلِهِۦ جَهَنَّمَ وَسَآءَتْ مَصِيرًا ﴿١١٥﴾﴾

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ﴾ زیرا أگر لە شِرك خۆش ببێ ئەبێ شریکی هەبیی. خۆ شریك بو خوا محالە لی خوش بونی شرك ئەبیتە محال، لە دائرەی أمکان دانیە ﴿وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ﴾ ولو عصیان وأتبّاعی غیر سبیلی مؤمنین بی ﴿وَمَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿١١٦﴾﴾ خودا واحدی بالذاتە، وحدتی ذاتی قبولی شِرکَت ناکا، وإلا ئەبێتە وحدتی إعتباری ئەوانەی شریك بۆ خوا پەیا ئەکەن لە شوێنی ألوهیت بێ خبرن (الله) کلمەییەکە بە سەر زبانیان دادێ معنای چیە نازانن کێ ئەکەن بە شریك ﴿إِن يَدْعُونَ مِن دُونِهِۦٓ إِلَّآ إِنَٰثًا﴾ عجابیە ئەوانی مشرکن غیری الهی حرب باقی الهە بە کچیەکی حسنا تَخیُل ئەکەن إێستاش جمعێ هەن لە بَشر (فَرْج) ئەپەرستن کچی لەوانە بکاتە دەرەجەی غایت لە حُسن وجمال ئەیکەن بە (إلە) لە بعضە مراسیمی دین لەسەر تَختی مجوهر دائەنیشێ جوق جوق بەبەردەمیا تێ ئەپەڕن دستیان بە فرجی مبارکی دا دێنن دەستی خۆیان ماچ ئەکەن لەسەرچاویان دائەنێن. وأوروپایی بالعموم ژن پەرستن، سیادەت هی ئەوانە پیاوەکان عبد وخزمەتکارن، بعضي (مام آلی) لە ئێمە زۆر حەز ئەکەن سیادەتی ژنان لەناو مُسلّمانان تعمّم بکا. فی الحقیقە غیری خوا ئەوی هەبی لە قوّەی إنفعالُ وتَأثُّر شریکی ژنانن، خصوص هیولانی محض منفعلن، ﴿وَإِن يَدْعُونَ إِلَّا شَيْطَٰنًا مَّرِيدًا ﴿١١٧﴾﴾ تِمثالي آلهي حرب تِمثالي شیطانە خَبیث، گرژ، کەپو خەپو بلند وأسطور، لچ خەروای روت لە هەمو آثاري حسن وملاحت ﴿لَّعَنَهُ ٱللَّهُ﴾ لەو و لەاتباعی، ﴿وَقَالَ﴾شیطاني مرید﴿لَأَتَّخِذَنَّ مِنْ عِبَادِكَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ﴿١١٨﴾﴾

پاش ئەوە کە طرد کرا لەساحەی رَحمتيّ إلهي، ووتی لە مخلوقی تۆ پشکی مُعیّن وەرئەگرم، ئەبن بە یارویاوەرو معین وظهیري من ئەوانە عبارەتن لە شیاطینی الإنس، کە بۆ إنسان گەلیّ لە شیطاني مرید خرابترن. بە تلبیسات و تَلویثاتیان إنسان هەلّ ئەخەلّەتی ﴿وَلَأُضِلَّنَّهُمْ﴾ گمراهیان ئەکەم، ﴿وَلَأُمَنِّيَنَّهُمْ﴾ بە أماني باطلە مشغولیان ئەکەم لە سعی، (غزالی ئەفەرموی: فریوی کَسی زراعتیەکی کەمی هەبی بەتەمای زۆربی، ئەوە أمل ورجایە، ئەوی هیچی نەچەندبێ بەتەمای غِلّەی زۆر بێ (أُمنیّەیە) ئێوە لە أولادی پێغەمبەرانن چۆن معذّب ئەبن عیسی، بوذا بوینە فدیەی نجاتی گنهکاران شێخ ناییلی نەچنە جهنم، خوا غفورو رحیمە، بە عذاب داني ئێوە چە قازانجی پێ ئەگا، ئێوە إیمان دارن گناه لەگەلّ إیمان ضرری نیە، ئێوە أولیان محفوظن گوناه تأثیری سوء لە نفوسی مقدسەی ئێوە ناکا، وهکذا.

﴿وَلَءَامُرَنَّهُمْ فَلَيُبَتِّكُنَّ ءَاذَانَ ٱلْأَنْعَٰمِ﴾ بێ توقف إطاعەی امری ئەکەن، گوێی حوشتران ئەبڕن، شقی ئەکەن، ئەمەش عائدی وثنیەکانی عَرَبە ﴿وَلَءَامُرَنَّهُمْ فَلَيُغَيِّرُنَّ خَلْقَ ٱللَّهِ﴾ قسەیان زۆر لەو آیەتە کردووە تغییر حسیە یا معنویە یامەردووکیانە، ئەو خلقەی خوای کە تغییری ئەدەن ئەیگۆڕن چیە؟ لای مجدی مصری تفسیری فطرتی إنسانە مەیلی إنسان أساساً لەسەر چاکەیە، داك و باب، مامۆستا، شێخ، انقلاب چیەکان، سیاسیون ئەیانگۆڕن، ئەو فطرەتە پاکەی بە فساد ئەدەن وتفسیر بە عقلّ زۆر معقولە، ذاتاً چە شیطاني مرید چە وکلای ئەو أولا سَعی لەتیەك داني عقلّ ئەکەن. بابیون ملاحدەی صوفیە، قسمی لە صوفیەکانی ئێمە نەختێ لە ملایان حاصلی سوفسطائیەکان لە تغییر وتهوینی عقلّ خەریکن، بە مغالطات بە مشاغبات بە طبعی شاعرانە هێزی عقلّ نایێلّن، تاکو خەلّکی وك گووێ درێژ علی العمیان تسلیمیان بن، عقلّ بە ترساندن خصوص لە عقابی الهی زوو تسلیم ئەبێ، لەو

رووەوە بێ (لِمَ) گردنی دادەی إطاعەی ئەبێ، محالات هضم ئەكا. ئەو تفسیرە مبنیە لەسەر ئەوە كە بڵێین تغییرە كە ئەبێ، وإلا ئەتوانین بڵێین گاجوت ئەكەن بەخوا، أما نابی إنسان بكەنە كوڕی خوا، بەخوا (ابن مریم) نابی بە (ابن الله)، ملائكە ئەكەن بە كچی خوا، وكلّی طائفە لە أهلی علم وحكمت خاڵی نیە، ئەوجا یا بعضە مخلوق ئەگەیننە درجەی خوا، یاخوا ئەهێننە درجەی مخلوق، تفسیری تأریخ، تفسیری أوصاف لە شیمەی جولەكان وقساوسەی أورپایی وأمریكانیەكان لە أفشحی أشیایە. خولاصە شیطان نصیبی خۆی وەرگرت، أما لە صدی نەوەدونۆ. أما شیطان عالی همّتە، شكم نیە كە بە كردەوەی شەدەڵەییان راضی نیە، نەبڕا لە هَمو قیود بە دَرە حتّی كُفریش نیە، چونكی كُفر معناییكی هەیە، أمّا رفتاری ئەوان هیچ معنای نیە، یەك ثمرەی هەیە كە آبڕوی كوردانی پێ چوو. نەجو، نە دیان، نە إباحی، نەبوت پەرست، نەسەگ پەرست، نەفرج پەرست، بە مُعاملەیان راضی نیە. أما تفسیری بە كوتان بە ددان لە چرخ دان بەریش تاشین وشتی وا لام وایە زۆر بێ قیمەتە ﴿وَمَن يَتَّخِذِ ٱلشَّيۡطَٰنَ وَلِيّٗا مِّن دُونِ ٱللَّهِ﴾ ئەوی شیطان بگرێ بەدۆست ومتبوع، تَجاوز لە أمری خوا بكا زاتا متابعەی خوا لەگەڵ متابعەی شیطان قط گردنابێتەوە ﴿فَقَدۡ خَسِرَ خُسۡرَانٗا مُّبِينٗا ١١٩﴾ بە حقّەت تێ دەشكێ بەتێ شكانی آشكرا ﴿يَعِدُهُمۡ وَيُمَنِّيهِمۡۖ﴾ چی تری لە دەست نابێ، وەك لە سورەی إبراهیم ئەڵێ خوا موفقمان بكا بیگەینێ ﴿وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ١٢٠﴾ وعدەی ئەو باطلە مزخرفە تلبیسە، حَق بە باطل باطل بە حَق ئەنوێنێ، طبیعتی شاعرانەی زۆر بە قوەتە ﴿أُوْلَٰٓئِكَ﴾ ئەوانەی شیطان ئەكەنە وەلی خۆیان بە وەعد وأمانی ئەو هەڵ ئەخەڵەتێن ﴿مَأۡوَىٰهُمۡ جَهَنَّمُ وَلَا يَجِدُونَ عَنۡهَا مَحِيصٗا ١٢١﴾ جێی لاچون و هەڵاتنیان نیە لە جهنم، یانجات وقوتار

بونیان نیە ﴿وَالَّذِينَ ءَامَنُوا﴾ بەخواو پێغەمبەرو کتابی الهی ﴿وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ﴾ ذاتاً إیمانی بێ عمل بێ عملە، أگر لە قیامەتیش نجاتی بێ لە دنیا بۆ أهلی إیمان بێ کەلکە بەلکو ضرری لە دوشمن زیاترە، ﴿سَنُدْخِلُهُمْ جَنَّاتٍ تَجْرِي مِن تَحْتِهَا الْأَنْهَارُ خَالِدِينَ فِيهَا أَبَدًا﴾ مردنیان نیە لذائذ ونِعَمْیان لێ نابڕێ، أصلا هەر ئەمینن هەر متنعمّن ﴿وَعْدَ اللَّهِ حَقًّا﴾ أُمْنیّە نیە، غرور نیە، مقرّر ومحقَّق وثابتە حتی مبالغەشی نیە، ﴿وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللَّهِ قِيلًا (١٢٢)﴾ کێ قسەی لە قسەی خوا راست ترە؟ ئێوە دووای بکەون، إطاعەی أمری خوا نەکەن وعدی کبریائی وَلو بە قَولی ضعیف ولَیْتَ و عَسی بێ خوا ئەی هێنێتەجێ، چ جای وەعدی قەوی وجازم، ﴿لَّيْسَ بِأَمَانِيِّكُمْ وَلَا أَمَانِيِّ أَهْلِ الْكِتَابِ﴾ اشارەمان کرد لە جملەی أمانی وتصورات وخیالات فاسدە وکاذبیەیان کە لە طرف شیطان دێتە دلّی إنسان، اغترار بە دین اغترار بە نسب ئەوە لە أغلب مکایدی شیطانی گەورەترە، مسلّمان ئەلّێن ئێمە أمتی خیر البشر خاتم الرسل خۆشەویستی خواین، چۆن عذابمان ئەدا؟ بنی اسرائیلی وبنی الزهراء ئەلّێن ئێمە لە أولادی پێغەمبەرانین بێ شك هەر گوناهی بی کەین خوا لێ مان خۆش ئەبێ بۆ خاطری ئەو نازدارانە، وکە بعضە ملای مرائی بعضە أحادیثیان هاویشتە سەرە جێ ئەگرێ لە دلاندا شین ئەبێ هیچ مەکە مەکە نامێنی واجبە إنسان بەو خەیالّە خاوە خۆی لی نەگۆرێ بڕوا بکا بە أصدق القائلین کە ئەفەرموێ ﴿مَن يَعْمَلْ سُوءًا يُجْزَ بِهِ﴾ تأویل نەکا بلّێ ئەوە بۆ مشرکانە ئێمە محفوظین مقدسین گناە لە ئێمە تأثیر ناکا، ئێمە لە لوح المحفوظ ئەبینین ئەو گوناهەمان لە سەر مقدرّە، أنە بە إطاعەی قَدَر ئەکەین، چونکە سرّی قَدَر لەلای ئێمە مکشوفە. ئەوی لە لوح المحفوظ بو هاتە خوارێ ئەمە قرآنی کَریمە تەماشای بکە چیت بەسەر لوح المحفوظە، وقرآن طریقەی لێ

خـۆش بـونی گونـاهی بـۆ دانـاون حـەز ئەکـەن مجازاتـان بـە گونـاه نـەبێ، فەرمودەی ئەو ڕەفتار بکەن، ﴿وَلَا يَجِدۡ لَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيّٗا وَلَا نَصِيرٗا ١٢٣﴾ کێ لە دەست خوایان قوتار ئەکا؟ ئەگر إبراهیمە، ئەگر موسی یە، ئەگر عیسی یە، ئەگر محمدە بـە عبُودیّت مُقرّب بوون، ﴿وَمَن يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ هـەر کەسە بە گوێرەی حاڵی خۆی طبیعی صالّحانی ملایان لەگەڵ صالّحانی جاهلان جـوایزە، صـالّحانی دوقتـور لەگـەڵ صـالّحانی کاروانـچی فـەرقی هەیـە وکـذا صـالّحانی دەوڵەمەنـد وصـالّحانی فقـیر فَرقیـان دیـارە وصـالّحات بـە وەقـت ئەگوڕێ، وتَمَکّن وشَرطە نووێـژی حَـضَر وسَـفَر وأمْـن وخـوْف یـەك نـین ﴿مِن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ﴾ چ نێر چ مێ فرقیان چیە نظر بە چاکە، ئەگەر چـی مـێ لای ئێوە مهانە ئەمڕۆ کوردەکان وەك جاشك و کۆلك ئەیان فرۆشن لـە پێنـاو آمـالی خۆیانیان دائەنێن، گوایە بە مێردیان ئەدەن، بەڵام خوا ربّ العالمینە فرقی ئەم طائفەو ئـەو طائفـە ناکـا اسـرائیلی وقورەیشی وقِبطـی وحَبـشی لای مـساویە، طریقی شرف وکرامَت وتقرّب إلی الله بۆ هـەموو شعبێ گوشـادەجادەیە إنـسانی ئەوی پێ دا بڕواو لائەدا. حاڵیش وابی ﴿وَهُوَ مُؤۡمِنٞ﴾ ئەوی بێ إیمان بێ جـزای چاکەی لە داری دنیایە، ئێمـە قسەمان لـە آخرەتـە ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدۡخُلُونَ ٱلۡجَنَّةَ وَلَا يُظۡلَمُونَ نَقِيرٗا ١٢٤﴾ أدنـی نقـصی لـە ثـوابی أعمالیـان نابـێ، (نقـیر) نُقرەییەکە لەسەر پشتی ناوکە خورما، کـە داری خورمـا لەویـەوە شـین ئـەبێ، ئەوەش مَثَلە لـە کـەمی ﴿وَمَنۡ أَحۡسَنُ دِينٗا مِّمَّنۡ أَسۡلَمَ وَجۡهَهُۥ لِلَّهِ﴾ آینـی کـێ چاترە لە آینی ئەو کەسەی کە نفسی خۆی پاك کردبێ بۆ خوا غَیری خوا کەس بە إلە نەزانی، یا بە خالصی ڕوو لە خوابـێ ڕووی خـۆی بـۆ کـەس پـیس نـەکا ﴿وَهُوَ مُحۡسِنٞ﴾ لە حَقی عبادی خوا طماعیان تێ نەکا، نەیانکاتە کۆیلەی خۆی

﴿وَٱتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا﴾ مائل لە هەموو أديانی منحرفە وپڕوپوچ ﴿وَٱتَّخَذَ ٱللَّهُ إِبْرَٰهِيمَ خَلِيلًا ﴿١٢٥﴾﴾ لەسەر ئەو خُلّتە ودوستیە بزانن چی ئەكرد چۆن روی لە خوا ئەكرد چۆن ئەپاڕایەوە ئێوە بەو كردەوانە نسبەتی خۆتان بە إبراهيم بدەن نەك بە نسب پێ مغرور ببن ﴿وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ﴾ هەموو عَبدن مَملوكن مُحتاجن وەك ئێوە لە مافی السموات ومافی الأرض كێ إتخاذ ئەكەن بە شَريك بە ولی ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ مُّحِيطًا ﴿١٢٦﴾﴾ ڕوو لەكێ ئەكەن؟ چۆن ڕزگار ئەبن؟ جنابی كبريائی بە علم بە قدرت دەورەی لە هەموو شت داوە، إحاطەی كُلّی هەر بۆ خوایە، ئەوی إحاطە بە شتێ بدا بە إذنی ئەوە، خاصی ئەم و ئەو نیە تەماشای قوربان بكەن لەگەڵ إعتقادی بعضی كەس كە أمَّتْ بە صفوتی أناميان ئەزانن ئەڵێن قطبی فرد عِلمی وەك عِلمی خوایە لەگەڵ ذاتی كائنات تێ كەڵە، قدرتی وەك قدرتی خوایە، هەموو شت ئەتوانێ بكا، خوا أمری (كن فيكون)ی داوەتێ.

نعوذ بالله لەو جهلە عظيمە، كە لای مُسلمانان بە إيمانی كامل وأكمل حساب كراوە. ئەوەیە ليغيرن خلق الله الحاقی ئەكەن بە إله. آگادارین تقريراتی مجددی مصری لێرە تەواو بوو، رحمتی خوای لێ بێ. ئەو ڕێگای أبو مسلمی أصفهانی كردبويەوە بۆ أفكاری أحرار شێخی مرحوم تَوَسُّعی پێ دا گەلێ قيودی شكاند، شێخ بۆ مفسران وەك عسيایە بۆ بنی اسرائيل غلّ وزنجيری نَقّالان ئەكاتەوە تا بتوانن بە خطواتی دا سعی بۆ اِدراكِ معانی قرآن شەقاو باوێن ﴿وَيَسْتَفْتُونَكَ فِي ٱلنِّسَآءِ﴾ إتصالی ئەو آيتە بە ما قبلی نزيكی نەختێ بزرە، ئێمە بە سێ وجه بَيانی ئەكەين:

أولاً: جنابی حَق فەرموی: (إنْ يعبدون من دونه إلاّ إناثاً) قابِلە بێتە دلان رغم أنف عُبادِ الأناث تحقيری إناث بەلازم بزانن پاشان كە فەرموی: (ومن يعمل من

الـصالحات) لـە نَیلـی ثَـواب مـێی لەگـەڵ نێـر مـساوی کـرد لـە بـەینـی أهانـتُ ورعایەت ترددیان لێ حاصل بوو، بۆ رفعی خطرات دەربارەی ژنـان فتوایـان لـە رسولی أکرم طلب کرد.

دووەم: لە حدیث دا هەیە (رجعنا من الجهاد الأصغر إلى الجهاد الأكبر)، کـە مجاهدەی نفسە سَوادی أعظم لە عَرَب حَربیان گەلێ لاخوشتر بوو لە مُحافظـەی حقوقی ژنان، پاش أمر بە جهاد أو تفصیلاتە کە فـەرموی، هێنانیـە سـەر ئـەو جهادە گەورەیە ئەو إستفتایە لێرە إیراد کرا، سَواء بلێین لێرە وقوعی بووە یا سابقاً یا لاحقاً.

سێیەم: زۆر نزیکە ئەو سائلانە لە ضُعَفایان بوبن، دڵیـان لـە تحمـل قـوارع وزواجر ضرباتی شـدید ضـعیف بـووە مقـصدیان لـەو طَلَبـە تـوجیهی صـاحبی رسالة بۆ مسئلەی دی، هەتا لەو آلامە نجاتیـان ببـی، وحـضرتی رسـالەت نـەی توانیوە جوابیان بدا، دڵی مبارك لەو سؤالە نابەجایە تەنگ بووە، لاکـن جنـابی حَق بە مقتضای علم وحِلمی مُسامحەی کردووە، خۆی جَوابی داوەتـەوە ﴿قُلِ ٱللَّهُ يُفۡتِيكُمۡ فِيهِنَّ﴾ کەوابێ لەو بێ مُناسبەییە، مناسـبەیی زۆر بـە قُـوەت دەرئەکەوێ. آیاتی بشیر إیجابی ئەکرد ئەوانە إیمانیان بە قُـوەت ببـی، إعانـەی خائنان نەدەن، عرضـی رسالەت بکەن أمرت إجرایە سەرومالێ و قوم وعـشیرەت لە پێ ناوی توودایە، ئەو نوعـە إسـتفتایە ئەکـەن مـع أنـە ئـەو أحکامـە سـابقا معلوم کراوە، بۆیە ئەفـەرموی: ﴿وَمَا يُتۡلَىٰ عَلَيۡكُمۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ﴾ ئـەو آیاتی کە مراراً مستمراً بەسەر ئێوەدا ئەخوێندرێتەوە ئەویش فُتواتان بۆ ئەدا، یعنـی ناگۆڕێ حُکمیەکی جاریە قابلی تغییر وتبدیل نیە. سؤالەکەیان لـەو حقوقانەیـە کە آیاتی تالیە بَیانی ئەکا، وەك سیّدی آلوسی ئەفەرموێ: مَیْلی شـێخ الاسـلام لـە سـەر ترجیحـی ئەوەیـە نـەك سـؤال لـە مـیرات بـێ وەکـی بعـضەکـی دی فەرموویانە، و معنای أوّل لە مبتکراتی سیّد رشـید نیـە وەك لـە لاف و گزافـی

بەدەرئەکەوێ، وتعجب لە مفسرینان ئەکا أنە خۆی بە شێخ محمد عبدە ئەنوێنی، (کالهرّ یحکی إنتفاخاً صورة الأسد) ﴿فِي يَتَـٰمَى ٱلنِّسَآءِ﴾ متعلقە بە (یتلی)، ئەوانە زۆر بێ دەسەلاتن حِفظی حَقیان لەسەر أقویایان گەلێ لازمە ﴿ٱلَّـٰتِي لَا تُؤۡتُونَهُنَّ مَا كُتِبَ لَهُنَّ﴾ ئەوانی کە محرومیان ئەکەن لە حقوق، ئەوەی لە طرف خواوە بۆیان نوسراوە چەسپاوە پێ یان ناگەیێنن ﴿وَتَرۡغَبُونَ﴾ ومع هذا مەیلتان لێ یە ﴿أَن تَنكِحُوهُنَّ﴾ أگر جوان بن ومالّدار بن ورَغبتیان لێ ئەکەن، أگر ناشیرن وبێ مالّ بن لە صورەتی أوّل (فی ی) بۆ مقدر أکەن لە صورەتی ثانیە (عن) (حقیقةً) زۆر جوانە مختصر وشاملَ ﴿وَٱلۡمُسۡتَضۡعَفِينَ مِنَ ٱلۡوِلۡدَٰنِ﴾ دەربارەی ئەوانیش ئەفەرموێ حقوقیان پێ بگەیەنن، بە عاداتی جاهلیە محرومیان مەکەن، ﴿وَأَن تَقُومُواْ لِلۡيَتَـٰمَىٰ بِٱلۡقِسۡطِۚ﴾ ج نێر ج مێ أمری خوا ئەوەیە چۆن سابقا فەرمویەتی ثابتە ناگۆڕی إنحراف مەکەن ﴿وَمَا تَفۡعَلُواْ مِنۡ خَيۡرٖ﴾ زیاد لە ما أمر الله بە دەربارەی ئەم ضُعفایانە مطلقاً ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِهِۦ عَلِيمٗا ١٢٧﴾ أجرتان لای خوا بە ضایع ناچێ.

سابقا بَیانی نشوزی ژنی فەرموو، لێرە بە مناسبەی إستفتا لە حقوقی ژنان بَیانی نشوزی پیاو ئەکات ﴿وَإِنِ ٱمۡرَأَةٌ خَافَتۡ مِنۢ بَعۡلِهَا نُشُوزًا أَوۡ إِعۡرَاضٗا﴾ دیارە نشوز هەر وەکو بۆ ژنان ئەبێ بۆ پیاوانیش ئەبێ پیاو نوعاما سیادەتیەکی هەیە، لکن نە بە درجەی نشوز، ئایا ئەوەش داخلی إستفتایە یان نا، ظاهری تقریری سیّد رشید داخلە. لاکن نزولی ئەو آیتە لە حَق سَوْدَەی حَرمی حضرتی رسالت کە ترمذی نقلی ئەکا لە ابن عباس وئەلێ حَسَنە، گوایە سَوْدَە ترساوە پێغەمبەر طلاقی بدا گوتویەتی: یا رسول الله طَلاقم مەدە و ڕۆژی من بۆ عائشە

بێ بەو نوعە ریەك كەوتوون. نایێتە ذهنی من ﴿فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَآ أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًاۚ﴾ لە بەینی خۆیان ڕیك بكەون. ألبتە پیاو أگر پیاو بێ، پێ لە نفسی خۆی ئەنێ نایەڵێ عەیب وعاری دەر بكەوێ إیشی بچیتە بەردەستی حكّام وحكّم ﴿وَٱلصُّلْحُ خَيْرٌۗ﴾ هەریەكە شەقاوی بۆ یەك بچن ڕیك ئەكەون، ڕیك كەوتن خێرە چاكە، أگرچی ﴿وَأُحْضِرَتِ ٱلْأَنفُسُ ٱلشُّحَّۚ﴾ توخوا خیاڵ ئەكرێ آیتی درحق پێغەمبەر وحرَمی نازل ببی بەو عبارەتەو ورود بكا؟ نا بەخوا، ئەو آیتە بنا بە ڕوایەتی امام شافعی لە ابن المسیّب دەربارەی كچی محمد بن مَسْلَمە كە ژنی رافع بن خدیج بووە نزولی كردووە. ئەمە باشە أكثری منازعاتی ژن ومێرد لەسەر بُخْلە، دڵی پیاو بڕوای نادا ژنی شتی ببەخشی، أنّە ئەو ژنە وەك خَدَمە هیچ حقی سیادەتی لەسەر ماڵ نیە (شُحّ) لە كینایەتی نفسیەیە دائما لای حاضرە ﴿وَإِن تُحْسِنُواْ﴾ لە معاشرە ﴿وَتَتَّقُواْ﴾ لە نشوز ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ١٢٨﴾ هەرچی بێ خوا خەبەردارە ئەیزانێ جزای خێرتان ئەداتەوە ﴿وَلَن تَسْتَطِيعُوٓاْ أَن تَعْدِلُواْ بَيْنَ ٱلنِّسَآءِ﴾ قُدرەت وقوەتتان نیە لەسەر عدالت لە بینی ژنان، أگر چی سابقا رُخصتی داوە بۆ تعددی ژن خۆ واجبی نەكردووە، تا ئەتوانن خۆ بپارێزن، تا ممكن بێ یەك، خۆتان بە خیالات هەڵ مەخەڵەتێنن، ناتوانن عدالەتیان لە بەیندا بكەن ﴿وَلَوْ حَرَصْتُمْۖ﴾ با زۆر رغبت بكەن لەسەر عدالت تێ كۆشن ناتوانن ﴿فَلَا تَمِيلُواْ كُلَّ ٱلْمَيْلِ﴾ لە حَق ئەوەی میلتان لە گەڵی نەبێ زۆر جَور مەكەن نە بە دڵ خۆشتان بوێن نە ماڵیان لێ صَرف بكەن نە بەخێویان بكەن نە طلاقیان بدەن ﴿فَتَذَرُوهَا كَٱلْمُعَلَّقَةِۚ﴾ تەركیان بكەن وەك حبس كراوان ﴿وَإِن تُصْلِحُواْ﴾ شۆنی معاشرەتان باش بكەن ﴿وَتَتَّقُواْ﴾ لە مەیلی بێ ئەندازە ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ

﴿غَفُورًا﴾ عفى الله عمّا سلف ﴿رَّحِيمًا ﴿١٢٩﴾﴾ زیادە إحسانتان لە حَق ئەکا ﴿وَإِن يَتَفَرَّقَا﴾ أگر لە یەك جوایز ببنەوە ﴿يُغْنِ ٱللَّهُ كُلًّا مِّن سَعَتِهِۦ﴾ خودای تعالی لە فراوانی إحسانی خۆی کُلّیکیان لە وی تر غنی ئەکا، دڵیان لە یەك منقطع ئەبی تأسف وپەشیمانی نابێ، چونکە ئەو نوعە جُدا بونەوە لە تأمّل وتَرَوّی وترسی بەجێ نەهێنانی أحکامی إلهیە، ئەو أحکامی دائر بە معاشرەی عادلانە. أما ئەوانەی هجوم ئەکەنە سەر طلاق وانەبێ دەست بەجێ پەشیمان ئەبنەوە ئەو مَلا ئەم مَلا تذلّل وپاڕانەوە رەشوت دان، عبارت گۆڕین ملای بەستەزمان نازانی چی بکا، کَتیب هەڵ گێڕو وەرگێڕ ئەکا، آخر الامر أعزّ الله الشرع الشریف چارە مارە بەجاشە، هەرچێ موافقی شرع بێ باشە. گەلێك معنایان بۆ دوڵەمەند کردن لێ داوەتەوە، حقیقةً وانەبێ ژنەکە مێردی چاتری بەدەست ئەکەوی عُمْری بە خۆشی سَعادەتی لەگەڵ رائەبوێری، أما کُلّی نیە أکثریش نیە، ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ وَٰسِعًا حَكِيمًا ﴿١٣٠﴾﴾ علم وقدرتی کَرَمی فراوانە بەهەموو شتەك رائەگا، أفعال وأحکامی مُتْقَنە بۆ تضیقیان لەسەر ناکا، چی أصلح وبێ دڵ تەنگی یە ئەوەتان بۆ دائەنێ، ئێوە کاری خۆتان لەسەر خۆتان تەنگ مەکەن بێ تأنّی جاهلانە إقدام مەکەنە سەر إیشان : (زلیخا مرد أز ان حسرت کە یوسف گشت زندان چرا عاقل کند کاری کە باز رو پشیمانی) .

﴿وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلْأَرْضِ﴾ لەسەر ئەو سِعَتی مُلك وسلطنت کبریائیە چە إعتانیەکی بە ئێوە کردووە بە سعتی کَرَم ولطفی لەگەڵ ئێوە چەند بە رِفقە وائەزانن ئەوە لەبەر شرف وگەورەیی ئێوەیە خۆتان لێ نەگۆڕێ ﴿وَلَقَدْ وَصَّيْنَا ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ وَإِيَّاكُمْ أَنِ ٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ﴾ بە عواطفی مغرور مەبن، ئێمە أبنائی خواین، أحبای خواین أولیاین، بەڵکو مقابلی ئەو کَرَم و لُطف و إحسانە واجبە شُکر بکەن، زیاتر تێ بکۆشن حفظی شرعی بکەن،

فَرمایشتی بەجێ بینن ﴿وَإِن تَكۡفُرُواْ﴾ ناشكری بكەن مقابلی ئەو نِعَمە مغرور ببن لە إطاعـە دەربـچن ﴿فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ﴾ مُلـك و عَظَمتي خوا هیچ نقصی پێ ناگا، خوا هەر خوایـە مـالكی أرض وسمایـە ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَنِيًّا حَمِيدًا ﴿١٣١﴾﴾ إێستاش هەر وایە، غنای ذاتیـە، إحتیـاجی بەكـەس نیـە، پـاك و منزّە ومقدّسە كەس ناتوانێ زەرەری لێ بدا كەس ناتوانـێ نفعـی پـێ بگـەینێ. (لـو أن أولكـم) الحـدیث القدسـی ﴿وَلِلَّهِ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۚ﴾ مَلَـك، إنسان، حیوان، جنّ، ذی روح و غـیری ذی روح هـەموی ئـی ئـەوە ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿١٣٢﴾﴾ خۆی حافِظـە، رقیبـە، آگـادارە، مُـسَیطرە، إیشی بەكـەس نیـە، بەكەس ناكرێ هەرچی بە خیالّ دابێ، مُدَبّرە، مُدبّر نیـە وەك كـوردی ئـەڵی نـە عیسی، نەموسی، خوا خوایەتی خۆی هەر ئەكرد، صـوفیەی ئێمـە ئـەڵێن: (لَـو خَلَـت لَقَلبَـت) وەی ژێـر بـەرەو ژوور ئـەبوو أرض و سمـایی كـە إدارەو إدامـەی پەكی لەسەر غیری خوا كەوتبێ هەر ژیر بەرەو ژێر بی وێران بێ.

﴿إِن يَشَأۡ يُذۡهِبۡكُمۡ أَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ خـوای تعـالی نـە بـە رِیـشی إسـرائلیان ئەنازێ نە بە چەفیەو عگالی عەرەبان أگر حەز بكا ئێوە ئەفـەوتێنێ بـە جـاری محو ئەبنەوە لە وجود یا قومی ترتان بەسەردا مُسلّط ئـەكا ئەبنـە أسـیر وژێـر دەسـت، وكـو گـووێ دریـژ إسـتخودامتان ئەكـەن ﴿وَيَأۡتِ بِـَٔاخَرِينَۚ﴾ حتـی ئەتوانی كوردان زیندوو بكاتەوە و بیان كا بە قومی ذی شأن ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلَىٰ ذَٰلِكَ قَدِيرًا ﴿١٣٣﴾﴾ یا الله بە رحم و قودرەتی خـۆت رەحمـی بـە مُـسلّمانان بكـەی بـە آگابێنەوە لەو جهالەت و زلّەتیان نَجات بدەی. ئەمەش هاتە جێ: اسرائیلی بـێ خودان بوون مـسلّمانیش نزیكـە ئـەوەی بەسـەر ئـەوان هـاتوە بەسـەریان بـێ، الآنیش دەست لە لاف و گـەزاف هـەڵ نـاگرن ﴿مَّن كَانَ يُرِيدُ ثَوَابَ ٱلدُّنۡيَا﴾ لـە

رُؤسـای دیـن و دنیـا ﴿فَعِندَ ٱللَّهِ ثَوَابُ ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۚ﴾ بـۆ ڕوو لـە خـوا وەرئەگێڕن دین مانعی تعالی نیە، مایەی سعادەتی دنیاو آخرەتە عبودیەت بۆ خـوا ئازادییـە، جهـادی فی سـبیل الله مایـەی سـەرفرازیە، ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعَۢا بَصِيرٗا ١٣٤﴾ ئەبیێ، ئەبینێ خفایای أشیا ئەزانی، بۆ بە خالص تقوای ناکەن، وسائط پەیا ئەکەن، ظاهر و باطنتان یەك نیـە، ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ بـە حَق ﴿كُونُواْ قَوَّٰمِينَ بِٱلۡقِسۡطِ﴾ بە تەواوی بێ نقص و خَلَل لە عمومی أشیا إقامـەی عدل بکەن، تەرازووی عدالت ڕابگرن، میل مەکەن بۆ کەس ﴿شُهَدَآءَ لِلَّهِ وَلَوۡ عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمۡ﴾ شُهدا بن بۆ خـوا، ئـەوەی لاتانـە أدای بکـەن، دزو تزویـر لـە أهلـی إیمان ناوەشێتەوە أگر شاهِدیتان لەلابوو ولو لەسەر خۆتان بـی بـزری مەکـەن، إعتراف و إقـراریش نوعـە شـاهدییێکە ﴿أَوِ ٱلۡوَٰلِدَيۡنِ وَٱلۡأَقۡرَبِينَۚ﴾ خـوا هەرچـەند کِراراً ومِراراً أمرتان ئەکاتێ بە إحسان لـە حَق داك و بـاب و خزمـان، أمّـا ڕێـی شهادە دانی بەدرۆ نادا وڕێ ی کَتمی شهادە ئـەگرێ ﴿إِن يَكُنۡ غَنِيًّا أَوۡ فَقِيرٗا فَٱللَّهُ أَوۡلَىٰ بِهِمَاۖ﴾ ئەوی شاهدی لێ ئەدەن یا بۆی ئـەدەن چ دەوڵەمەنـد چ فقـیر فەرقی نیە نە بە (لە) نە بـە (علیـە) خـوای تعـالی دەرحَـق ئـەوان لـە ئێـوە بـە ڕەحمترە نسبتی خالق و مخلوقی بە قوّەت ترە لە نـسبتی بُنُـوّەت و أُبُـوّەت و أُمُوّت و قُرابت، ئەو مصالح چـاتر ئـەزانێ لـە ئێـوە، مـەڵێن ئـەوە دەوڵەمەنـدە حورمەتی لازمە یا قەی ناکا یا ضرری لێ بکەوێ زۆرو زەبەندەی هەیە، یا ئەوە فقیرە ئەهمیەتی چیە دڵی خـەڵکی بـۆ بهێـشێنم بـۆ ئـەو، یـا جـای تَـرَحُّمـە بـا شتێکی پێ ببڕێ، بەو خەیالاتە نە کەتمی شهادە بکەن نە شهادەتی زۆر بدەن. إشارە بۆ تساوی غنی و فقیر لەو أولویّتە (بهما) ئەفەرموێ، وإلاّ أوفَق بە لغنـت ئەبوایە بفەرموێ (بهم)، وەك لە قرائتی أُبیّ وارد بـووە، چـونکە فقـیر لـە سـەر

غنی به (أو) عطف كراوه ﴿فَلَا تَتَّبِعُوا۟ ٱلْهَوَىٰٓ﴾ به دوای هەواو هەوەسی خۆتان مەكەون ﴿أَن تَعْدِلُوا۟ۚ﴾ له عدالته یا له عدوله، یعنی بۆ خاطری ئێوه له هەموو شت به عدالت بن، نَهیتان ئەكەم له إتباعی هوا، یا دوای هوا مەكەون مەبادا له حَق عدول بكەن ﴿وَإِن تَلْوُۥٓا۟﴾ أگر زبان بگۆڕن، شهادة به حَق نەدەن، زبان پێچی بكەن، یا تـأخیری بكەن ﴿أَوْ تُعْرِضُوا۟﴾ أدای شهادەت نەكەن بالمره تَركی بكەن ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرًا ﴿١٣٥﴾﴾ له پاش ئەو زواجرو قوارعه ئەڵبەته جاری تر مُسڵمانان خیانت ناكەن و مُعاوَنَتی خائنان ناكەن، به درۆ شهادتیان بۆ نادەن ولو بابیان بن یا داكیان یا خزمیان دوڵەمەند یا فقیر ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟﴾ إجمالاً ﴿ءَامِنُوا۟﴾ به تفصیل و تحقیق به دَوام وثَبات بێ نِفاق و خَیانت وتَحویل وإنقلاب ﴿بِٱللَّهِ﴾ كه واحِد وبێ شَریكه مالكی أرض و آسمان وما فیهمایه آگاداره ﴿وَرَسُولِهِۦ﴾ كه محمّد المصطفی یه (ﷺ) پێغەمبەری به حَقّه ﴿وَٱلْكِتَٰبِ ٱلَّذِى نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ﴾ كه قرآنه إیمانتان ببێ كه وحی آلهیه له طرف خوداوه بۆی هاتووه ﴿وَٱلْكِتَٰبِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِن قَبْلُۚ﴾ ئەو كتێبەی له پێشدان ناردراوه، خوا بۆ پێغەمبەرانی عِظامی ناردوه، وەك نوح و إبراهیم و موسی و عیسی وسائری رسل، تفرقه مەكەن وەك اسرائیلیان إیمان مەكەنه عَصَبیّت و قَومیت ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِٱللَّهِ﴾ به إنكار یا به شِرك ﴿وَمَلَٰٓئِكَتِهِۦ﴾ بلّێ نین یا بنات اللهن آلهی حرب و سِلمن ﴿وَكُتُبِهِۦ﴾ گشتی یا بعضی ﴿وَرُسُلِهِۦ﴾ كذا ﴿وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾ ڕۆژی وا پەسین، ڕۆژی جزا یومی دین، چ بلّێ نیه یا بلّێ كەس لەو ڕۆژه سلطنەت و سَیطرەی هەیه ﴿فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿١٣٦﴾﴾ زۆر له حَق دوور ئەكەویتەوه، عالَمی إمكان بێ ذاتی

واجب الوجودی فوق الطبیعه نایته وجود، هەر چەند بَشر عاقلّ بێ لە رسالەت إستغنای نابیّ، کەسی صاحب کتابُ و شَرعی غایت مقبول و معقول بێ وەك ذواتی کە سابقاً بیان کران وإیمانیان پێ هێناون، صاحبی آیات وبینات بێ بۆ ئەو پێغەمبەر بێ وئەم پێغەمبەر نەبێ، من لام وایە إیمان بە بعض وإنکاری بعضیك لە حَق دوورترە گەلێ لە إنکاری أساسی نبوّت لە عالمی وجود. دلیل لەسەر وجوددی ملائکەتان نیە، أمّا رُسلی عظام هەموویان فەرموویانە هەن و کتابی کریم ناطقە بە وجودیان، إیمان بە رُسُل بە کُتب مقتضیە بۆ إیمان بە مَلَك، أمّا نابێ لە حدّ تجاوز بکەین، بە وجهی معقول ومقبول کە لە پێغەمبەرانەوە بە ئێمە گەیشتوە بەو وجهە ئەبێ إیمان بە وجودیان بینین و ئەوی إنکاریان بکا دلیلی نیە، ئەوەندە نەبی کە بەمحسوس ایمان نایێنێ لەصدری کتاب معلوم کرا ئەمانە لە قران إستفادە ناکەن أگر ڕۆژی جزا نەبێ و ئەو بَشرە هەروا بێت وبڕوا نە فریشتەی خوای گەرەکە، نەنُبوّت، نە مَلَکی پێ ئەوێ، نە کُتب چەند ڕۆژیەك بە هەر نوعی بێ بەسەر ئەباو ئەڕوا ئەو هەرا هەرایەی چی پێ ئەوێ، إنکاری ڕۆژی جَزا تام و خوویی گوناهانە لە حەقیقەتێکی علمیەوە نیە ﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ بە رغبتی کاذبە بێ رسوخ ﴿ثُمَّ كَفَرُواْ﴾ پاشان وەرئەگەڕێن بە أدنی مَیلی إنقلابیان ئەبێ ﴿ثُمَّ ءَامَنُواْ ثُمَّ كَفَرُواْ﴾ ئەو نوعە لە هەموو مسلکێ هەن ئەبینی یەکێك تحصیلی علم ئەکا صَبر ناکا دەست هەڵ ئەگرێ، دوایی مەیلێکی دێتەوە، دلّ تَشَبُّث بە تحصیل ئەکاتەوە، زۆر ناچێ دەست هەلّ ئەگرێتەوە، عاقبەت مَیلی خوندنی هیچ نامێنی، محروم ئەبێ لە سعادتی دین و دنیا، ئەوانە (بوالهوس)یان پێ ئەڵێن ﴿ثُمَّ ٱزْدَادُواْ كُفْرًا﴾ ذاتا أساسی مەیلیان بۆ إیمان مُحکم نەبوو ﴿لَّمْ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغْفِرَ لَهُمْ﴾ ولو باز عَوْدە بکەنەوە زێرا مُحقّق ئەوە تلاعبە وبی شُبهە خوا مافی

النفسی عبادی خۆی چاتر ئەزانی لە مَلایان ﴿وَلَا لِيَهْدِيَهُمْ سَبِيلًا ﴿١٣٧﴾﴾ هیچ ڕێ ی صَلاحیان نیشان نادا، رأی إمامی علی وایە إستتابەی مُرْتَد لە سی (٣) جار زیاتر نیە وبعضە مجتهد بِنا بە رأی إمامی علی ئەفەرمون مُرْتَدّ لە نَوبَتی چارەم ئەکوژرێ، طَلَبی توبەی لێ ناکرێ، ئێوە ئەی مسلّمانینە وامەبن دَوامتان لە سەر إیمان ببی، ئەوانە أگر چی لە إیمان ناو زگیان یەك بووە، بەلاّم چونکی لە رەغبت و مەیلی تەواوەوە نیە بە مُنافِق حِساب ئەکرێن ﴿بَشِّرِ ٱلْمُنَافِقِينَ بِأَنَّ لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٣٨﴾﴾ مەیلی ئەوان بۆ کُفر إشتدادیان لە کُفر شاهدە لەسەر رغبتیان بۆ عذاب کەسێ مژدەیان بداتێ بە عذاب کأنَّه مژدەیان ئەداتێ بە نَیْلی مَطلب. ئەو منافقانە ﴿ٱلَّذِينَ يَتَّخِذُونَ ٱلْكَافِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ ئەوانە نِهایَتیان لەسەر کُفرو ولایەتی کُفّاران بوو ڕویان لە مؤمنان نەکردووە. ئەوانە بۆ وا ئەکەن؟ ﴿أَيَبْتَغُونَ عِندَهُمُ ٱلْعِزَّةَ﴾ آیا ئەو منافقانە طَلَبی عزت و مناعت وشدّت ئەکەن لای کافرەکان، أگر مقصدیان ئەمە بێ زۆر غَلَطن.

﴿فَإِنَّ ٱلْعِزَّةَ لِلَّهِ جَمِيعًا ﴿١٣٩﴾﴾ أگر عِزّتیان ئەوێ ڕوو لە خوا بکەن، إیمان پێ بێنن بە إیمانی دروست وڕاست تا خوا عِزّتیان بداتێ کەسی تعظیمی بوت وأصنام بکا چ عِزّتی هەیە؟ لە جمادات ڕەزیل ترە. کەسێك آلیك بۆ گاجووت ڕابگرێ لە طبقەی زێرین چ قَدرو قیمەتی هەیە ولو پادشاهی ڕووی زەمین بێ. عِزّت وقُوّت ومَناعت وشدّت بۆ کەسێکە غَیری خالِقی سماوات وأرض وما فیهما بە مَعبود نەزانێ، بۆ کەس گردن دادەی بَندەکی نەبێ ﴿وَقَدْ نَزَّلَ عَلَيْكُمْ﴾ أی أهلی إیمانی بە ڕاستی ﴿فِي ٱلْكِتَابِ﴾ لە قرآنی کَریم، کە واجبە إیمانتان پێ ی ببی ئەوەی بیلێ بەجێ ی بێنێ ﴿أَنْ إِذَا سَمِعْتُمْ ءَايَاتِ ٱللَّهِ يُكْفَرُ بِهَا وَيُسْتَهْزَأُ بِهَا﴾ ئەوەتان بەسەرا نازِل بووە ﴿فَلَا تَقْعُدُوا۟ مَعَهُمْ﴾ لەگەلّ ئەو کافرە

مستهزئانە ﴿حَتَّىٰ يَخُوضُواْ فِي حَدِيثٍ غَيْرِهِۦٓ﴾ کەوابی چۆن ئەبی ئێوە إتخاذیان بکەن بە أولیاو ناصرو پشت و قوتی خۆتان یعنی نەکەن ئێوە وەك منافقەکان بن بیان گرن بە دۆست. سیّدی آلوسی ئەفەرموێ: خطابە بۆ منافقان بە طریقی إلتفات ئەوەم لە قَلبی خۆش نەبو، تەماشای تفسیری سیّد رشیدم کرد، ئەو ئەفەرمووێ: خطابە بۆ جمیعی ئەوانەی کە إظهاری إیمانیان ئەکرد، چ صادق چ منافق. أمّا قسەی من باشترە چونکی ئەو آیەتەی سابق لە مکّە نزولی کردووە، دَخلی بە مُنافقانەوە نیە، مُنافق لە مکّە نەبوون (إذا رأیت الذین یخوضون في آیاتنا فأعرض عنهم حتّی یخوضوا في حدیث غیره) خطابە لەگەڵ پێغەمبەر، أمّا مَقصد إیمان دارەکانە ﴿إِنَّكُمْ إِذًا مِّثْلُهُمْ﴾ فەرقتان نیە أگر، وابکەن، ئەویش وەکو ئەوانن، أنّه مَعاذ اللهِ گەپ بە آیاتی خوا ئەکەن پێ کافر ئەبن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ جَامِعُ ٱلْمُنَٰفِقِينَ وَٱلْكَٰفِرِينَ فِي جَهَنَّمَ جَمِيعًا ﴿١٤٠﴾﴾ خۆ بپارێزن لە کُفرو نِفاق و شائبەی کُفرو مَسخَرە بە آیاتی خوا ﴿ٱلَّذِينَ﴾ ئەو منافقانەی ﴿يَتَرَبَّصُونَ بِكُمْ﴾ إنتظاری حاڵی ئێوە ئەکەن لە غالبی لە مغلوبی ﴿فَإِن كَانَ لَكُمْ فَتْحٌ﴾ ظَفَرو غالبی بە سەر دوشمن ﴿مِّنَ ٱللَّهِ﴾ ذاتاً ئەوی چاکە بی لە خواوەیە ومسڵمان لە خوای ئەزانی ﴿قَالُوٓاْ أَلَمْ نَكُن مَّعَكُمْ﴾ أدی ئێمە لەگەڵ نەبوین؟ جهادمان نەکرد؟ نصیبمان بدەنێ ﴿وَإِن كَانَ لِلْكَٰفِرِينَ نَصِيبٌ﴾ نافەرموێ فتح چونکە عاقبت بۆ مسڵمانەکان بوو والعِبرةُ بالخواتیم ﴿قَالُوٓاْ أَلَمْ نَسْتَحْوِذْ عَلَيْكُمْ﴾ ئەدی ئێمە استیلامان لە سەر ئێوە نەکرد؟ چۆن سائق لەلارانی ولاّغی ئەدا ئەوهامان تسخیر نەکردن؟ ﴿وَنَمْنَعْكُم مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ ئەدی ئێوەمان مَناعت و مَتانت نەدا؟ بۆ حِفظتان لە إیمان داران أگر حەزمان لێ بوایە بە قَطعی مغلوبمان ئەکردن. مع أنە بالعکس نەمان کردو بووینە باعثی غَلَبەی ئێوە، لازمە

پاداشمان بدەنێ ﴿فَٱللَّهُ يَحۡكُمُ بَيۡنَكُمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ﴾ ئەو وەقت دەرئەکەوێ ئەو منافقانە لای ئێوەن یا طَرَفداری ئەوانن، ئەو ڕۆژە کە بالفعل لەگەڵ کافران لە جَهَنمدا گردیان ئەکەنەوە ﴿وَلَن يَجۡعَلَ ٱللَّهُ لِلۡكَٰفِرِينَ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ سَبِيلًا ١٤١﴾ هیچ ڕێی یان نادا بۆ غَلبە لە سەر أهلی إیمان تا ئەو منافقانە طرفداریان بکەن بەو نوعە. حقیقةً أگر خودا کَشفی أسراری ئەو منافقانەی نەکردابوایە زۆر دوور بو پێغەمبەر موفق ببی ، ﴿إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ يُخَٰدِعُونَ ٱللَّهَ وَهُوَ خَٰدِعُهُمۡ﴾ فێڵیان لەٚ خودا ئەوە بو کە خۆیان بە نوعێك ئەنواند ولە حەقیقەتدا وا نەبون، زیرا مُعاداتی ئەوان لەگەڵ پێغەمبەر وأصحاب هیچ وَجهی نیە غیری إیمان بە خواو دَعوتی إلی الله بێ شِرك و شائبە.

گەلێ لە صحابان خزمیانن تا ظهوری إسلامیت، لەناو ئەواندا عَداوتیان نەبوو خوای تَعالانیش بالمقابلە معاملیان لەگەڵ ئەکا. بە ظاهری قبوڵیان ئەکا لە أحکامی دنیوی ئەیان کا بە شریك لەگەڵ مُسلّمانان، لە ڕۆژی جَزا کە أسرار دەرئەکەوێ نَظَر بە مافی القلبیان إلحاقیان بە کافران ئەکا ﴿وَإِذَا قَامُوٓاْ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ قَامُواْ كُسَالَىٰ﴾ بە گرانی بە سستی بۆی هەڵ ئەستن إیمانیان بە وجوبی نیە خاصّة بۆ صلوتی خَوفْ بە جَماعت لە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) أبداً کَیفیان لە گەڵ نایە ﴿يُرَآءُونَ ٱلنَّاسَ وَلَا يَذۡكُرُونَ ٱللَّهَ إِلَّا قَلِيلًا ١٤٢﴾ ئەو أذکار وقرائتی لە نوێژدا هەیە ئەوەی بە دزی بێ نایڵێن، ئەو بعضە کلماتی بە جهر بێ أکثری ئەیڵێن بۆ ریا، تاوابزانن نوێژی تەواو ئەکەن، ئایا ئەوە عَینی خِدعە لەگەڵ خوا نیە؟ تأویلاتی چی پێ ئەوی نازانن خوا سەرو علنیان ئەزانێ ﴿مُّذَبۡذَبِينَ بَيۡنَ ذَٰلِكَ﴾ مضطربن دێن وئەچن لە بَینی مسلّمان وکافران ﴿لَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ وَلَآ إِلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِۚ﴾ لەگەڵ هیچ لایان ڕاست نین ﴿وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ سَبِيلًا ١٤٣﴾ ئەوەی خوا گومڕاهی بکا بەکەس هِدایەت نادرێ، نە تۆ نە غَیری تۆ ڕێی بۆ

نادۆزرێتەوە، زێرا أگر مثقالە ذَرّێك إیمان لە دڵیان جێ ی بووبوایەوە مەردی وآدمیت عەلاقەیێکی لەگەڵ ئەوان بمابوایە خوا ڕێی ڕاستی نیشان ئەدان وگومڕاە نەئەبوون ولو بعد حین ئەی هێنانە ڕێی هِدایت. بعد رسوخ الاحوال خوای تعالی بۆ هەر کەسە بە گوێرەی مەلەکەی خۆی ڕێی بۆ ئەکاتەوە ئەوانی سیاسیّونن حیّالن ڕێی وا ئەدۆزنەوە بۆ فریفتە دانی عِباد کە عقلاً تێیدا حَیرانە، وهکذا تەماشای ڕەوشتی عالم بکە ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ بە ڕاستی و دروستی بێ خِدعەو نِفاق ﴿لَا تَتَّخِذُوا۟ ٱلْكَـٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ وەك مُنافقان لەپاش چەندی لە زَمانی رِسالت مُسلمانان خۆ بە خۆ بوونە دوشمن ومُحارب هەریەکە دۆستی لەگەڵ فرقە دەولەتی لە کافران بەست، عاقبت ماڵیان وێران بو تاج وتَختیان نگونسار کرا، هەر لە وقایعی أندلس تا حربی عمومی تەماشای تأریخ بکەن، کەوابی آیەی (لن یجعل الله للکافرین علی المسلمین سبیلا) کە تازە ڕابوورد إعتراضی نایێتە سەر زێرا ئەو آیتە مشروطە بە إتحاد لەگەڵ یەك أولیا نەگرتن لە دوشمنان، سبحان الله إتخاذی بە أولیا لە مشایخ وکافران چۆن بووە باعِثی نشوستی إسلام ونزیکی لە إنقراضی ﴿أَتُرِيدُونَ أَن تَجْعَلُوا۟ لِلَّهِ عَلَيْكُمْ سُلْطَـٰنًا مُّبِينًا ﴿١٤٤﴾﴾ خوای تعالی بێ حُجّت وبُرهان هیچ ناکا، یَعنی بە صِفتی قهّاری یاخود بە لاأُبالی معاملە دَر حَق عِبادی خۆی ناکا تا حُجّتی قاطع بە دەستەوە نەبێ کەس مغلوب ناکا کەس عَذاب نادا، پێغەمبەران نانێری تکلیفات ناکا. أگر مسڵمان ڕێك و پێك بان، تەماشای أحوالاتی زەمانیان بکردابوایە بەناوی سُنّت دەست پێ ی عِبادیان نەبەستایە، بە تەمای نیسکی لە إیمان نەگرابان خوا مغلوبی نە ئەکردن، معاذ الله بێ کردبوایە ! بێ حُجّت ئەبوو. لە صَلاة الخوف نەیفەرموو نوێژ بکەن من ئاگاداریتان ئەکەم، کراراً فەرموی لە أسلحەی خۆتان غافل مەبن. ئێمە بە تەمای طوپی (کەلە) و (گەنج عثمان) وفلان وفلان لە خۆمان گەڕاین ومغلوب

بـوین (ولله الحجـة البالغـة) ﴿إِنَّ ٱلْمُنَٰفِقِينَ فِى ٱلدَّرْكِ ٱلْأَسْفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ﴾ درك بـه عَكسی دَرَجَه بەلای خووارەوە ئەچیٚ، مُنـافق چونکی نـامَرْدن لـه ژێـر هـەموو کافران ئەبن له آگردا. کافر نَظَر به مُنافق مَرْدە دوشمنـایَتـی بـه ئاشـکرا ئـەکا مُنافق مُخَنَّثه بێ غیرەت وناموسه، دینی إسـلام دینـی غیورانـه، یـەکێك ماڵێـك غَصب بکا دەستی نابڕیٚ، بەلاّم دەستی دز ئەبڕیٚ، چـونکه دزی لـاَمتـه ﴿وَلَن تَجِدَ لَهُمْ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾﴾ نه خوایان لایه، نه مسڵمان، نەکافر، شیطانیش کـەیفی پیٚ یان نایێ، زێرا له گفت و گۆی که له خدمت خوا ئەیکا دیارە مـردە مـەیلی مُخَنَّتی نیـه ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ وَأَصْلَحُوا۟ وَٱعْتَصَمُوا۟ بِٱللَّهِ وَأَخْلَصُوا۟ دِينَهُمْ لِلَّهِ﴾ وکی مسڵمانەکانی ڕاستی ﴿فَأُو۟لَٰٓئِكَ مَعَ ٱلْمُؤْمِنِينَ﴾ چونکه مُتصَّف بوون بـه صِـفاتـی ئـەوان ﴿وَسَوْفَ يُؤْتِ ٱللَّهُ ٱلْمُؤْمِنِينَ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٤٦﴾﴾ لـه دنیـا وآخرەت نائلی ظفـر ئـەبن فـوز نائـل ئـەبن بـه رضـوانی خـوا ﴿مَّا يَفْعَلُ ٱللَّهُ بِعَذَابِكُمْ﴾ خوا چ إیشی به عذابی ئێوە هەیه کەیفی پـیٚ نـایی شـفای خـۆی بی نـادا إنتقـام ناستێنیٚ بـۆ خـۆی ﴿إِن شَكَرْتُمْ وَءَامَنتُمْ﴾ أگـر شـکرانەی نِعمتی خوا بکەن وإیمان به ڕاستی بهێنن ولو زۆر سیِّئاتتان هەبیٚ خـوا عفوتـان ئـەکا ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ شَاكِرًا عَلِيمًا ﴿١٤٧﴾﴾ بـزانن خێرێـك ئەکـەن خـوا چـەند إحترامتان ئەکا، وائەبیٚ یەك و حەوت سەد پاداشتان ئـەداتی. جنـابی حَق بـه لطف و إحسانی خۆی إتمامی نِعْمَتمان بۆ بکا[1].

---

[1] - تفسیری جوزئی خامس تەواو بوو، وَقتی مَغرب، ڕۆژی دوشەموو، بیستی ذی القعدة، دوازدەی شباطی رومی سنه ١٣٥٣هـ قمری ١٩٣٥م.

﴿لَّا يُحِبُّ ٱللَّهُ ٱلْجَهْرَ بِٱلسُّوٓءِ مِنَ ٱلْقَوْلِ﴾ خـودای تعـالی ذَمّـی نَجْـوای کـرد و طَعنی زۆری لە مُنافقان دا لە بری ئەوە دێتە خَیال کە اخفای خراپە چاك نیـە، مُخالفەی مُنافقان إیجاب ئەکا مسلّمان چ قسەی خراپ چ عَمَلی خراپ بە آشـکرا بیلّێ وبە آشکرا بیکا، بـو دَفعـی ئـەو خَیـالَ وتَوَهمّـە ئەفـەرموێ خـودای تعـالی آشکرا کردنی قسەی خراپی پێ خۆش نیە، نای حُوبّینی، عَمَلی خراپە هەر هیچ ﴿إِلَّا مَن ظُلِمَ﴾ إلاّ ئەو کەسەی ظُلمی لێ کرابێ، بۆی هەیە بە قَدَر حـال و ظَـرف قسەی بَدْ لە حَق ظالم بکـا، تـا ببێتـە بـاعِثی رَفعـی ظُلـم. حُـسن و مُعاشـرە وا إیجاب ئەکا آگر شتی ناشرین بەحتی لێ بکرێ، بـە عِبـارَتی نازکانـە تعبیری لێ بدرێتەوە، وقـرآنـی کـریم لـەو نَزاکـت ونزاهتـە یەکانەیـە حتـی لەبـەر تعبیراتـی نازکانە أئمەی کِرام مخالفەی لە بەینا ئەبێ ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ سَمِيعًا عَلِيمًا ﴿١٤٨﴾﴾ أدَب لە خوا لازمە، إنسانی کامل الایمان ئەبێ أولا حَیا لە خوا بکـا کـە آگاداره، ئـەوی بیکەی ئەیزانێ ئەوی بیلّێی ئەیبیستێ ﴿إِن تُبْدُوا۟ خَيْرًا أَوْ تُخْفُوهُ﴾ لە خـوا بـزر نابێ، و تەماشای نِیَّت ئەکا، ئـەوی لای خـوا معتـبر بـێ خلوصـە ﴿أَوْ تَعْفُوا۟ عَن سُوٓءٍ﴾ حقّی مسلّمانی ئەوەیە بە مُسامحە بێ، خاصّةً لە حَق مـسلّمان چـاو لـە سیّئات بپۆشی ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَفُوًّا قَدِيرًا ﴿١٤٩﴾﴾ عَفوی عند المقدره لای خـوا زۆر خۆشە، چونکە خۆی زۆر بە قدرەت ودەسەلاتە زۆریش لە سیّئاتی عِباد خۆش ئەبێ، بلّندی عابد تشبهە بە معبود، بۆی گاو صورَت پەرست لە تَرقیاتی بَشری محرومن، گەلێ لە حَیوانات دورن ترن، فائدەی إیمان بـە خـوا إقتـدا بەخودایـە، ئەوانەی إدعای إیمان ئەکەن وا شَریك لە أفعال و صـفاتی خـوای لـە ئەواندانیـە دعوایان باطلە ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْفُرُونَ بِٱللَّهِ﴾ بە جُحْـد یـا بـە شـِرك ﴿وَرُسُلِهِۦ وَيُرِيدُونَ أَن يُفَرِّقُوا۟ بَيْنَ ٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ﴾ إیمانیان بـە خـوا هـەبێ بـە رسـالەت نـەبێ وەك (ناپلیون)، یـا إیمانیـان بـە خـواو بـە رسـلی هـەبێ إنکـاری أصـلی

رسالەت نەکەن، بەلام إنکاری بعضە رُسُل بکەن وەك جوودیان ﴿وَيَقُولُونَ نُؤۡمِنُ بِبَعۡضٖ وَنَكۡفُرُ بِبَعۡضٖ﴾ خوا دون الرُسُل، یا بعضە رُسُل دون بعض ﴿وَيُرِيدُونَ أَن يَتَّخِذُواْ بَيۡنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ١٥٠﴾ گوایە بە عقلّی خۆیان ڕێ ی دا ئەنێن بۆ إنتظامی بَشر، تحریری قوانین وقواعد ئەکەن ﴿أُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ حَقّٗاۚ﴾ با إیمانیشیان بە خوا هەبێ ﴿وَأَعۡتَدۡنَا لِلۡكَٰفِرِينَ عَذَابٗا مُّهِينٗا ١٥١﴾ حُكَمایِ إلهیون إنکاری رسالەت ناکەن، غایَتی لە تصویری وَحی وإنزالی کُتُب مُخالفەیان هەیە لەگەلّ ئێمە. وعذابی مهین زیاتر لایَقی کەسیەکە خۆی لە فوقی عامّەی بَشر بزانی بلّێ نُبوّەت بۆ عَوامی بَشر لازمە، أمّا بۆ خَواصی وەك من پێی ناوێ عقلّ و علمی خۆم کافیە، ئەمە تَکَبّری گەورەیە، لایق وایە ڕەزیل بکرێ، قدرو قیمتی نەمێنێ ﴿وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ بِٱللَّهِ وَرُسُلِهِۦ وَلَمۡ يُفَرِّقُواْ بَيۡنَ أَحَدٖ مِّنۡهُمۡ﴾ وەك ئەو مُؤمنانەی لە آخری سورەی (بقرة) (فەرمویانە لا نفرق بین أحد من رسلە... إلخ) ﴿أُوْلَٰٓئِكَ سَوۡفَ يُؤۡتِيهِمۡ أُجُورَهُمۡۚ﴾ ذاتاً ئەوانە أجری دُنیایان ناوێ، وإلاّ ئەوانیش ئەیان توانی ڕێ ی بۆ خۆیان إتخاذ بکەن ببن بە رئیس گروهی نائلی عِزّو جاه وثروتی دُنیا ببن ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ١٥٢﴾ ئەوانیش سَیّئاتی خەلّکی ئەپۆشن تجاوزیان لێ ئەکەن ورَحمیان دَر حَق ضُعفایان زۆرە، حَتّی کە دەعوتی خەلّك ئەکەن بۆ إیمان، لە جهەت ڕەحمەت ناتوانن بَشر لە ذُلّی کُفرو شِرکدا ببینن، بَشَریَتیان لا عزیزە، حەز بە عزّتی بَشری ئەکەن ﴿يَسۡـَٔلُكَ أَهۡلُ ٱلۡكِتَٰبِ أَن تُنَزِّلَ عَلَيۡهِمۡ كِتَٰبٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِۚ﴾ گوایە بەهانەیان ئەوەیە کە إیمان بە پێغەمبەر ناهێنن ئەیانەوێ پێغەمبەر کتێب بنێرێتە سەر ئەوان بە خَطی آسمانی (آیا ئەبی بزانن خَطی آسمانی چۆنە) ئەو کتێبە صراحةً بلّێ تۆ پێغەمبەری، یا بە ناوی جەماعەتی أهلی کتاب، یا بە ناوی چەند أشخاصیەك لە أحباریان صراحةً أمریان پێ بکا ئێوە إیمان بە

محمد بهێنن یاخود جمله کتابتْ بۆبی، وەك توراة کە جملە واحِدة بۆ موسی هاتووە، وکذا إنجیل بۆ عیسی، توراة کە جملە واحدە نزولی کردووە قسەییەکی مشهورە لەناو موسڵمانان، لاکن غَلَطَه ظاهر وایە ئەمە لە مغالطەی أحباری یهود کەوتبیتە أذهانان بی مُحاکمە و آگاداری، ذاتی وەك موسی چەند ساڵ خەریك قومی خۆی بوو تا لە چەنگ فرعون قورتاری کردن، لە بَحر نجاتی دان، ئەو هەموو أطواری مختلفه بە سەر قَوْمیا هات هەر طَورە هەر حالە نوعە حُکمێکی إیجاد ئەکرد، ئەوە چۆن تصوّر ئەکری قبل الوقایع أحکامی ئەو مسائله سیاسی و إجتماعی وحَربی وسلمی نزول بکا، ئەمە مَحالە، وکذا حضرتی رسالت بیست و دوو ساڵ تێ کۆشی هِجرتی کرد بۆ مدینە، لەوێش توشی گەرداوی مُنافقان بو وردە وردە قُوَتی ساند تا أمری کرایی بە حَرب، الحرب سجال بعضاً ئەشکا، مُنافق وضِعاف الإیمان أفکاریان ئەگۆرِا تا نِهایت خوا مُوَفّقی کرد. بە گوێرەی ئەو هەموو وقایعی متباینە آیات ئەهاتە خوارێ، چۆن خَیال ئەکری بو ئەو نوعە شخصە کِتابی سَماوی جملە واحدە نزول بکا، حتّی بەو عبارەتە نزولی قرآن یا توراة بو لوح المحفوظ یا بیت المعمور أسمانی أول غَیْرە قابلە. بەڵی کتێبی تأریخ و حِکایت ونصایح قابلە جملةً واحدةً بیت. ذاتاً قسمی أعظم لەو توراتی حاضرە لەو مقولەیەو مُلحقاتی پاش موساشی زۆر تیایە، ئەوانەش هیچی بە أحکامی سَماوی ووَحی إلهی ناچن. ئەو إقتراحە لەگەڵ جوابی ﴿فَقَدْ سَأَلُوا۟ مُوسَىٰٓ أَكْبَرَ مِن ذَٰلِكَ﴾ زۆر مُوافقە لەبەر مُناسبەی إستحالە ﴿فَقَالُوٓا۟ أَرِنَا ٱللَّهَ جَهْرَةً﴾ وإلاّ إیمانت پێ ناهێنین. قومێ لەگەڵ زعیم ومنقذی خۆیان وابن لەگەڵ ئێوە چۆن ئەبن. ئەو نَوعە إقتراحة وەك بیان کرا نَشأتی لە کَثرتی معجزات و کرامات تَعنّت وحَماقَت و بێ فکری غلَبە ئەکات تفریقی محال و ممکن نامینێ. دیتنی خوا بەو نوعە کە یەکتری ئەبینین مَحالە أشاعِرەش لەگەڵ معتزله لەو صورەتە مُتفقن غایَتی أشاعرە نَوعە إدراکی تر پەیا ئەکەن تعبیری بە رُویَت ئەدەنەوە ئەمەش لە دنیا نابێ. تێ گەیاندنی

إسـرائيلى بـە دلائـل نزيكـى إسـتحالەيە، بۆيـە لـە جـوابى ئـەم إقتراحـەيان ﴿فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّـٰعِقَةُ بِظُلْمِهِمْ﴾ بـە حـس پەرسـتان بلـىَ‌ى خـوا نابينـدرێ بەجارێ إنكـارى وجـودى ئەكـەن ﴿ثُمَّ ٱتَّخَذُوا۟ ٱلْعِجْلَ﴾ چـەند لـە يـەك دوورن تجاوزى حدّ بەو دەرەجە؟ لـە لايـەك طَلبـى رؤيتـى خـوا بكـەن وەك سـرامدانى صوفيّەى ئێمە ولە لايەك عِبادتـى گـۆلگ بكـەن ﴿مِنۢ بَعْدِ مَا جَآءَتْهُمُ ٱلْبَيِّنَـٰتُ﴾ بيّناتى ئەوتۆ منداڵيش ئەيزانى إحتياجى بە تأمّل وتفكّر نيە. انفلاقى بحر كـێ بۆى كردن؟

گاجوتى آسمان يا گاجووتى زەمينى: خيام ئەڵێ: گاويست بە اسمان نامش پروين وان گاور بگر نهفته در زير زەمين چشم خروت گشاى چـون اصـل يقـين زيرو زبردو گاومشتى خربين

﴿فَعَفَوْنَا عَن ذَٰلِكَ﴾ لە پاش تۆبە بەو نەوعەى كە لە سـورەيى (بقـرة) تـێ پەڕى ﴿وَءَاتَيْنَا مُوسَىٰ سُلْطَـٰنًا مُّبِينًا ﴿١٥٣﴾﴾ حُجّەت و بُرهانى موسى لەسەر جَهالت وَحماقتى قَومى خۆى زۆر چاك آشكرا بوو، خۆشيان مُنفعل بوون لە بـەر ئـەوە إنقياديان كرد بۆخۆ كوشتن ﴿وَرَفَعْنَا فَوْقَهُمُ ٱلطُّورَ بِمِيثَـٰقِهِمْ﴾ بـەو طَـوْرَە قبـولى تەوراتيان كرد، ئێستاش بە ددانان ئەيگرن پاش ئـەو هـەموو تَحريـف و إلحـاق وخَرافاتەى كە تيايەتى ﴿وَقُلْنَا لَهُمُ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْبَابَ سُجَّدًا﴾ مطيعـى أمـرى قومانـدان بن ئەويشيان تبديل كـرد وەكـو ڕابـرد ﴿وَقُلْنَا لَهُمْ لَا تَعْدُوا۟﴾ بـە أعمـالى دنيـوى إشتغال مەكەن ﴿فِى ٱلسَّبْتِ﴾ لە ڕۆژى شەمو، لەويـشيان تَجـاوز كـرد ﴿وَأَخَذْنَا مِنْهُم مِّيثَـٰقًا غَلِيظًا ﴿١٥٤﴾﴾ عهد وميثاقى توند، مع الأسف هيچيان بەجێ نـەهێنا لـە وەقتى كـە كـەڵكيان بگـرێ ﴿فَبِمَا نَقْضِهِم مِّيثَـٰقَهُمْ﴾ سـبب بـە بڕينـى پـەيمان ﴿وَكُفْرِهِم بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ﴾ آى موسـى و سـائرى رُسـل ﴿وَقَتْلِهِمُ ٱلْأَنۢبِيَآءَ بِغَيْرِ حَقٍّ﴾

سبحان الله! جَنابی حَق حقی چەند لا خۆشە، حتّی بۆ پێغەمبەرانیش أگر تصوّر بکرێ ڕێ‌ی کوشتنیان بە حَق ئەدا ﴿وَقَوۡلِهِمۡ قُلُوبُنَا غُلۡفُۢ﴾ ئەوی پێمان کردن بە سبب ئەوانە پێمان کردن، نهایت ڕَشمالّی ذلّت ومسکنتان لە سەر هەلّدرا استقلالیتیان نەما، ئەی موسلّمانینە ئێوەش ڕَمقیکتان ماوە، أگر بە حَق بەخۆ نەیینەوە ئێوەش بە جولەکان إلتحاق ئەکەن ﴿بَلۡ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَيۡهَا بِكُفۡرِهِمۡ﴾ نفوذی إیمانی تیا نابێ (ثم قَسَت قلوبهم فهي كالحجارة أو أشد قسوة) ﴿فَلَا يُؤۡمِنُونَ إِلَّا قَلِيلٗا ١٥٥﴾ إیمانی بێ ثَمر کەمە کەلّکی ناگری یا کەمیان إیمان ئەهێنن ئەوانەی دلّیان زۆر ڕەق نەبوە علی تفاوت مراتبهم قابلِ ئەوی دەعوتی گەیشتی إیمانی هێنا ﴿ وَبِكُفۡرِهِمۡ﴾ بە عیسی و گەلێ لە رُسُلی خۆیان (فریقا کذبتم وفریقا تقتلون) ڕابورد لە سورەی (بقرة) ﴿وَقَوۡلِهِمۡ عَلَىٰ مَرۡيَمَ بُهۡتَٰنًا عَظِيمٗا ١٥٦﴾ لاشك پاش تقرری قاعدەی لِقاح بوو تناسلی بَشری آفرەتی بێ مێرد مندالّی ببێ إتهام ئەکرێ، ولو ظاهراً صالحەو عَفیفە ولە بەینی قَوْمی باش بێ، شاهدی قاطع لەسەر بَرائتی مریم نطقی عیسایە لە باوەشی دایکی، وەك لە سورەی مریم تفصیلی دێ، کەسێ ئەم وحی بە الهیە بۆ حضرتی محمد إنکار بکا تبریەی مَریمی پێ ناکرێ إلاّ بە إدّعا نەبێ، لە پاش شهادتی عیسی حقیقةً تبنّی ئەکا کە إتهامی مریم بە زینا بوهتانی گەورەیە موجبی سخطی إلهیە وبَرائتی حضرتی مریم بۆ وبَرائتی مقامی نُبوتە، بەلّکو بۆ مقامی ألوهیتە لە إختیار کردنی وَلد الزنا بوو نُبوت ﴿وَقَوۡلِهِمۡ إِنَّا قَتَلۡنَا ٱلۡمَسِيحَ عِيسَى ٱبۡنَ مَرۡيَمَ رَسُولَ ٱللَّهِ﴾ ئەوان إعتقادی رسالەتیان پێ نەبوە، تنصیص لەسەر رسالتی لە طَرف خودایە، إشارە بۆ بَرائتی و تکذیبی دیانان، کە إدعای ألوهیەتی کردووە، معاذ الله، إدعای ألوهیەتی کردبایە هەزار ڕەحمت ورضوان خوا لەسەر ئەو کەسانە ئەبو کە إعدام وصلبیان کردبایە. پێغەمبەر ئەکوژرین

ئەمرن، نُبوَّت إنسان نجات نادا لەو أموره عادیە ﴿وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا صَلَبُوهُ﴾ إستعظامی قتل و صَلبی عیسی لە بەر زاتی خۆی نیە، (وما محمّد إلا رسول قد خَلَت من قبله الرسل أفإن مات أو قتل إنقلبتم علی أعقابكم) كە لە سورەی (بقرة) رابورد، با پێغەمبەریش بیٚ ویش كوژریٚ، بەلْكو لەبەر إستعظامی سببیەتی كە بنی إسرائیلی إدعا ئەكەن ئەو شَخصە، چونكە ولد الزنا بو بە حُكمی تەورات ئێمە كوشتمان و لەدارمان دا كەسیٚ تصدیقی رسالەتی بكا ئەبیٚ والدەی محترمەی لەو لَوْثە تەبریە بكا.

لطیفە:

١- صاحبی نظرە ئەفەرمویٚ ئەو نسبەتەیان ئەدا بۆ قائدی ڕۆمانی گومان ئەبردریٚ دیِانی أورپایی بەدلْ ئەو قسەیە بڕوا بكەن و پیٚ یان خۆش بیٚ كە عیسی لە ئەوانە بوبیٚ وابلْندی ئەكەن و ئەی گەیننە مقامی ألوهیت ونزیكە لەبەر ئەو گومانە بیٚ كەمقرّی وكیلی عیسی یعنی باب (پاپ حضرتری) لە ڕۆمایە، وإلاّ لە أهلی غرب دورە شَخصی شرقی لە قَوْمی جولەكە بەو نوعە إیمانی پیٚ بهێنن و گەورەی بكەن.

٢- سلیمان نظیف حَكایتی بۆ كردم فەرموی: لەگەلْ جَمعی لە أدبا دانیشتبوین لە هەر طَرف قسەمان ئەكرد بَحثی حَضرتی عیسی كەوتە مەیدان، أدیبی یهودی لە میانەدابو ڕوی كردە بعضە أُدبای فرنسە ووتی: سببی عداوتی ئێوە لەگەلْ ئێمە چی یە؟ ووتی ئێوە عیساتان كوشت وصلبتان كرد، ووتی ئێوە حقتان چیە عیسی خزمی خۆمانە، خۆمان كوشتمان ئێوە خوێن گرو خوێن ئەستینی عیسی نین و أو وەقتە كە عیسی مان كوشت ئێوە وەك حَیواناتی وحشیە لە چیاو چولْی أورپا بە سەرتان ئەبرد ئیستا چ مداخلتان هەیە.

٣- یەكێك لە أدیبان ئەلْی جوو لە نَظری أورپاییان من حیث المعنی لە هەموو عالم مقدّس ترە، غَربی لە سەر ئەو هەموو سَلطَنت و عِلمَ و عِرفان وعِزّو

کبریائیه کچە جولەییك و کوڕە جوییك ئەپەرستن شایانە یهودی إفتخار بە سەر هەموو عالەمدا بکەن.

حقیقةً ولادَتی عیسی أذهانی عامَّەی مُشوّش کرد، هەر کەسە قسیەك ئەکا. أگرچی آیتی لە آیاتی خودا بوو، بەلاّم کردیان بە مَصَیبَتی خودا بۆ مُوحّد وخودا پەرستان. سَوادی أعظم لە موحّد لە مؤمن بە رسالت بون بە أهلی شرک، خۆزیا ئەویش وەك سائری عِبادی خوا بە طَریقی مُعتاد هاتبایە دُنیا، بە ملیون توشی ئەو هەرا هەرایە نائەبون. ئەوجا بزانن شتْ لە مَجرای طَبیعی بۆ چەند باشە، خَوارقی فوق الطبیعە چەند خطرە ﴿وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْ﴾ أساسی إدعایان شُبهە بو شَرعی موساش نەگەیشتبووە درجەی ثُبوت، پاش نُطقی عیسی حَقّی شُبهەیان نەماو، ئەو شخصەی کوشتیان لێ یان گۆڕا عیسی نەبو، بە عیسا ی تێ گەیشتن، إعتقادی ئێمە لە حَق حَضرتی عیسی مع الاسف نە لای یهودیان نە لای سەوادی أعظم لە دیانان نەبوە مظهری تقدیرو محظوظی، لەگەلێ جولەکان أساساً موافقەمان نیە. ئێمە بە واسطەی تصدیقی رسولی أعظم عن صمیم القلب شهادة ئەدەین لە سەر بَرائتی مَریم لامان صدّیقەیە، بەلّکو لە سەر نسائی عالم تفضیلی ئەدەین، وەبعضی لە ئێمە اعتراف بە نُبوتی ئەکەن. لەگەلێ دیانان أگەرچی لەو اساسە موافقین لکن لە مَسئلەی قتل و صلب مَوافَقَمان نیە، ئێمە ئەلّێن نەبوە، معاذ الله أگەر بوبی، تُهْمَتی جولەکان ئەبێ ڕاست بوبێ، ئەوان ئەلّێن بووە، أما فائدەییەکی زۆر گەورەی تیا بووە، ئەمەش عبارەتە لە (فِدیة)، ئەلّێن آدَم ومَن دُوَنهُ سبب بە گوناهی آدَم لە عَذابدا بوون بعدَ دُهورٍ وأعْصار جنابی حَق تَفکری کرد ئەمانە چی تر لە عذابدابن مُنافی رَحمته، هەروا بێ بەهانە عَفو بکرێن خِلافی عَدالتە (بعد اللتیا واللتي) وای بۆهاتە بەر نَظَر فِدییکی نَجات پەیا بکا، بەو هەموو عَظَمَت وجاه وجلال وکبریائیه هاتە ناوزگی مَرْیَم.

طبیعی بە طَریقی رَحمدا چووە، لەوی تجسّدی کرد بە بَدنی عیسی، بە وَلَد

بوو، گەورەبوو، دوایی خۆی کردە فِدیەی نَجاتی آدَم ومن دُونَه کە نوح وإبراهیم وموسی وسائری رُسُلی عظام وکرام. هەرکەسێ ئەو اعتقادەی هەبێ ڕۆژی جَزا نَجاتی ئەبی، وإلاّ فَلا. بَعضی أهلی تَحقیقیان ووتویانە ئەو تطوراتە شتی ممکنە، وخودا لەسەر هەموو شت اقتداری هەیە، بە سِفَتی قُدرَة ئەو حالّە بۆ خوا إثبات ئەکەن، ئەوانە لە مَسئلەی عَدل بە مُعتزِلی ئەچن، ولە مَسئلەی سِفَتی قدرت وێنەییکی أشاعرانیان هەیە، أگر ئێمە بلّێین لەو وَقتە کە هاتن عیسی ببەن بۆ صلب کەسیەکی هێنایە سەر صورتی عیسی، و عیسی ی لە ئەوان بزر کرد، ئەلّێن ئەمە نابێ مَحالّە. ئایە لە پاش ئەم تطوراتی إلهی مَحال ئەمێنێ؟ آیا ئەمەش شتێك نیە بو داخلی قُدرتی خوانابێ؟ آیا إنکاری مَسخی جولەکە ئەکەن بە مَیمون و بَراز؟ مَع أنّهُ ئەوەی بردیان بۆ إعدام یهوذای أسخریوطی بوو زۆر بە عیسی ئەچوو، بێ چارە هاواری کرد من مسیح نیم، گوی یان نەدایی، لە إنجیلی (برنابا) وکو قران ئەفەرموی، عیناً وائەڵێ، أمّا مسیحی ئەلّێن ئەوە موضوعە هەلّ بەستراوە، حتّی ئەلّێن ئەوە لە طَرف مُسلّمانان تألیف کراوە، مَعَ أنّهُ بعضە نُسخەی قَدیمی دیتراوەتەوە کە قابِل نیە لە طَرف مسلّمانانەوە بێ، (طنطاوی) چەند فصلیەکی لەو إنجیلە نقل کردووە، ئەوەك لە قیس بچێ، چونکە إنکلیزو سائری مەسیحییەکان زۆر إهتمام ئەکەن بە إمحای ئەو إنجیلە، لە هەرجێ یە نوسخەی بدۆزنەوە ئەیبەن ئەیسووتێنن ﴿وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ لَفِي شَكّٖ مِّنۡهُۚ﴾ لە شأنی (( عیسی)) حتّی پاش صلبی ئەو شخصە کە صَلبیان کرد، ووتیان ئەمە (( عیسی))، أدی أین صاحبنا، یعنی أسخریۆطی، ئەوچی لێ هات لە کووێیە ﴿مَا لَهُم بِهِۦ مِنۡ عِلۡمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّۚ﴾ لە أناجیلی معتمدەدا هەیە کە ( عیسی) بە تلامیذی خۆی گوتووە هەموتان ئەمشەو شك لە من ئەکەن، کە ئەوان شکیان هەبێ خەلّکی تر چی، ذاتاً ئەوان لەو هنگامە حاضر نەبۆن هەلاتن ﴿وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينَۢا (١٥٧)﴾ مُحقَّق بزانن حَضرە تی ( عیسی) نەکوژرا نە صلب کرا ﴿بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيۡهِۚ﴾ خوا ئەزانی چی بەسەر

هات، ذاتاً حَضره تی ( عیسی) ولادتی حَیاتی، مَماتی هەموی غامضه، حتّی بعضه أوروپایی ئەڵێن ( عیسی) مُحقّق نیه له مُخیلاته ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴿١٥٨﴾﴾ غالبه، مغلوب نابیّ، حکیمه شت له موقعی خۆی دائەنێ. إنسان تَعجُّب ئەکا له (ملیُّون) خصوصاً (فریقین) له أهلی کتاب خوایان لا زۆر سوکه، هەیبەت و خَشْیَتی إلهی له دڵیاندا نەمایه، عادەتا خوا شتەکه له ژێر تصرفی خیاڵ وئەوهامی ئەوان، وقتی جلال کبریائی تَحمُّلی نەبۆ که طلبی دیتنی بکریّ ئەوانەی طلبیان کرد بروسکەو صاعقەی لیّ دان (وخرّ موسی صعقا) دوایی بۆوه دەمداری لەشکریان دائماً ئەهاته (خَیْمة الربّ) مُحاکمەی ئەکردن، تا نِهایَت ذلّت وحَقارتیان گەیانده ئەو درجەیه که خوا بێته ناو ڕەحمی مریم به خوێن و خوزاوك نما بکا وگەوره ببی وەك سائری حیواناتی بێ قَدْر، ئەو هەموو مَنقصەی بێته سەر صلیبیش بکریّ. ئەی وای. خۆزیا هەموو بَنی إسرائیلی له ئاودا خنکابان، أمّا ئەو سَفاهته و حَماقت و جَهالته إختلاق نەکرابایه، آدم وعالم أبد الآباد بسوتێن نەك ئەو تَخیُلاته فاسده له حَق خوا إختراع بکریّ، معاذ الله، ئەگەر کەسیەك بڵێ مَریم زنای کردووه چ ڕوو ئەدا بۆ أمری وا، تَصوّری ئەو خرافاته چۆن ئەبێ، حاصلی ئەو جهله عظیمه له هیچ مِلّتیەك دا نەبۆه، وه هەر چەند ئەکەم نازانم ئەو خرافاته چۆن به مێشکانەوه چەسپاوه، والآنیش خەریکن بۆ أغوای عالَم. ئەگەر بەهەشت بەو نوعه إعتقاده دەست کەویّ هەزار لەعنەت له بەهەشت ﴿وَإِن مِّنْ أَهْلِ ٱلْكِتَٰبِ﴾ أی عصری خۆی، له جوله تلامذه، ئەوانەی عیسایان ناسیوه ﴿إِلَّا لَيُؤْمِنَنَّ بِهِۦ﴾ به (عیسی) ﴿قَبْلَ مَوْتِهِۦ﴾ پێش مردن و بزربونی (عیسی) هەمویان ئەیانزانی إنسانه إبن مَریمه، نه خوایه نه کوڕی خوایه، ئەو کُفرو جَهالەته پاش ئەو به زمانیك پەیا بۆو، أناجیلی بێ سند وسَبَت تألیف کران، پاش فەوتانی ئەو، ئەوی تەماشایان بکا ئەوانه وحی آلهی نین، حِکایەتن گردیان کردوەتەوه، هەرکەسه به نَوعی، ئەوی

دی بچینی کە صحیح بێ إنجیلی بَرْنَابایە، ئەویشیان لا بێ أصلە ﴿وَيَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يَكُونُ عَلَيْهِمْ شَهِيدًا ﴿١٥٩﴾﴾ وەك لە آخری سورەی (مائدە) دێ وئەو وەقتە جزای ئەو أسبابی مسرودە، ئەو حَقیرە بەو نوعە مَعنای لەو آیتـە دایتـەوە، مُفسّرین دوو معنایان فەرمووە: یەکیان لام وایە مُخالفی واقعە، ئەوی تریشم بـە دلّـەوە نانوسێ، والآن لە حَیات ومَماتی (عیسی) قسە ناکەم، (إنشاالله)، ڕۆژی دی ئەو طَلَسْمَەش بشکێ إیمانم هەیە (عیسی) رسولی خوایە، عَبدی خالِصە خاتم الأنبیا تصدیقی رِسالتی کردووە، ئێمەش بەسەر چاو قبوڵی ئەکەین والسلام.

﴿فَبِظُلْمٍ مِّنَ ٱلَّذِينَ هَادُوا۟﴾ إحتمالی هەیە ئەمەش نوعە شبهەییەك بـێ بـۆ إیمان نەهێنانی یهود بـە (عیـسی) و محمـد(ﷺ) کەگـەلێ شـت لـە تَـوراة حَـرام کراوە، ئەمانە إباحەی ئەکەن و حُکمی توراة لا یتغیرە، (خاصـّةً) کـە (عیـسی) ئەیووت من بۆ تغییری توراة نەهاتووم، جنابی حَق دفعی ئەم شُبهە ئەفـەرموێ سبب بە ظُلم وتَجاوزاتی ئەوان ﴿حَرَّمْنَا عَلَيْهِمْ طَيِّبَـٰتٍ أُحِلَّتْ لَهُمْ﴾ طبعـاً و شـرعاً حَلال بو بۆ ئەوان، إباحەی ئەو طَیِّباتە مـوافقی طبـع و شـرعی سـابقە، ئەمانـە تەرکی ظلم، بکەن جَنابی حَق دفعی ئەو قیودانە لائەبا، شَرایعی إلهیە بۆ تربیە وتزکیەی نفسە، بۆ تعذیب و ڕێ تەنگ کردن نیە، شَرع تا مُحرّماتی زۆر تـر بـی قَوم زۆرتر بە هلاك ئەچن، تووشی گوناهـان ئـەبن، أهلـی تَقوایـان کـەم ئـەبێ، شَریعتی إسلامیش (حقاً) زۆر گران کراوە، (خاصّةً) لای أصحابی وَرْع.

بنا لە تقریری (سیّد رشید) ئەو آیتـە بـۆ تثبیتـی جَـزای أسـبابی سـابقەیە، یعنی کە مُستحق بوون بۆ ئەو نوعە تضییقە بە واسطەی کُفرو بُهتـان ودعـوای قتلی مسیح و سائری أسبابی سالفە، چۆن مستحق نابن بۆ گەورەترین خـزی و نَکـال لـە دنیـاو قیامـەت ﴿وَبِصَدِّهِمْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ كَثِيرًا ﴿١٦٠﴾﴾ زۆر جـار مَنـع ئەبوون لەو ڕێیەی کە خوا بۆی دائەنان و ئەبو بـە ڕێی نجاتیـان، ڕویـان تـێ نەئەکرد. یاخود مَنعی خەڵکیان ئەکرد لە سلوکی سبیلی خوا بە سَیّآتی أعمـالی

خۆیان ئەبون بە قُدوە، أمریان ئەکرد بە خراپە، نَهیان ئەکرد لە چاکە (واتبعوا ما تتلوا الشیاطین علی ملك سلیمان... الآیة).

﴿وَأَخْذِهِمُ ٱلرِّبَوٰاْ وَقَدْ نُهُواْ عَنْهُ﴾ لە (توراة) تفریقی شعب وغریب ئەو تفریقە یا بالتحریفه، یا تأویلی (أخ)ە ﷺ لە عبارەتی توراة واقع بووە، مع أنّهُ (أخ) لە عبارەتی رسولان (أخی فی الدین) مرادە، حضرەتی داود سلیمان حزقیال بە مُطلقی نَهیان لێ فەرمووە، ئەمانەش یا لە تَوراتیان وەرگرتووە، یا بە وَحی بۆیان هاتووە ﴿وَأَكْلِهِمْ أَمْوَٰلَ ٱلنَّاسِ بِٱلْبَٰطِلِ﴾ رِشوە خِیانة مُرابحەی لە حَدّ بەدەر ﴿وَأَعْتَدْنَا لِلْكَٰفِرِينَ مِنْهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٦١﴾﴾ بە هەر پێغەمبەرێ بێ (خاصّةً) (موسی) و تۆ ئەوە کُفری جدید واجِدّە ﴿لَّٰكِنِ ٱلرَّٰسِخُونَ فِى ٱلْعِلْمِ مِنْهُمْ﴾ ئەوانەی ڕووچوون لە عِلم، أصلاً عِلم رُسوخ ئەکا لە نفسی إنسان، أما چونکە بە طریقی کَسبە أنّهُ إنسان خۆی ئەهاوێتە ناوێ تێ یدا ثابت وقرار گیر ئەبێ ﴿وَٱلْمُؤْمِنُونَ﴾ لەوان ئەوانەی کە تقلید زۆر تأثیری لێ نەکردوون مەیلیان لە چاکەیە واِتّباعی حقە مُقیّد نین بە شخص ﴿يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ﴾ وەك (عبد الله بنی سلام)، (أُسیدی بن سعیە)، (ثعلبەی بن سعیە)، هەرکەسێ لە سالفی صادق بووبێ إیمان بە پێغەمبەری لاحق ئەهێنێ، ئەوانە إیمان ناکەنە قَومیَت وعَصبیّتی جاهلیە، مدخولی (لكن) من حیث الأعراب، تەواو بۆیە تغییری إعراب ئەدا ئەفەرموێ ﴿وَٱلْمُقِيمِينَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ لە ئەوان و غیری ئەوان ﴿وَٱلْمُؤْتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ ئەوانەی نوێژ بە جێ ئەهێنن و(زکاة) ئەدەن و خەڵکی عقوق ناکەن لە عِبادة، أموالی ناس بە باطل ناخۆن ربا ناکەن ﴿وَٱلْمُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ﴾ بە وحدانیەتی ﴿وَٱلْيَوْمِ ٱلْءَاخِرِ﴾ بەو نوعە کە بَیان کرا (واتقو یوما لا تجزی نفس... الایة) مغرور نین بە إنساب، إعتمادیان لەسەر شفاعەت نیە، فدیە نیە، جەزادەر بەس جنابی حقە ﴿أُو۟لَٰٓئِكَ سَنُؤْتِيهِمْ أَجْرًا عَظِيمًا ﴿١٦٢﴾﴾ لە

كمّ و كيف نايّتە تقرير وحساب و(المقيمين) مبتدايە (أولئك) خَبَريەتی. عُلَماى تفسيرو إعراب إضطرابيان هەيە، (بَصْرى) و(كُوفى) مُحاربن. مالّى بابم كوردى (مقيمون) و (مقيمين)ى نيە، (حقيقةً) زيان تا بسيط تر بێ بۆ إفادەى عِلم باشترە.

أكثرى تَفَنُّن وإختلافاتى أساليبى زيانى عربى بۆوەتە باعثى مُخالفەو مُخاصِمە، لەگەلێ جێ قرآن ئەينوێنى كە ئەم قيوداتە شتيەكى باشە مقصود وتفهيم و فهمە ﴿إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ﴾ هيچ فرق نيە، بۆ إيمان بە ئەوان ئەهێنن؟ بۆ إيمان بە تۆ ناهێنن وە ئەگەر كەسێ ئەو نوعە إقتراحەى لە ئەوان كردبايە، ئايا لاى ئەوانەى كە إيمان بە توو ناهێنن ئەبووە معذرتيكى حقيقى بۆ إيمان نەهێنانيان؟ آيا ئەتوانن بڵێن لە آسمان بە ناوى أشخاص كتاب هاتووە؟ يا ئەوانە (جُملةً واحِدةً) كتابيان بۆ هاتووە؟ سابقاً عرض كرا ئەوەى ئەو إدّعايە بكا زۆر غَلَطە، عجايب ئەوەيە كە گەلێ لە ملايانى ئێمە بە قسەى ملايانى جوو هەلێ خەڵەتاون.

﴿وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ﴾ تا ئێستا ناوى سبقەتى نەكردوە ﴿وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيۡمَٰنَۚ وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا ١٦٣﴾ حتّى ئەويش جُملةً واحِدةً نزولى نەكردووە، زێرا أناشيدى روحيش مواقفى مختلفەى هەيە، لە زَبورى داود نووسراوە (إن الأرض يرثها عبادي الصالحون)، ﴿وَرُسُلٗا قَدۡ قَصَصۡنَٰهُمۡ عَلَيۡكَ مِن قَبۡلُ﴾ هەناردومانە چەند پێغەمبەرى، كە بەيانى شۆون وأحوالّى ئەوانمان بۆ كردى، ﴿وَرُسُلٗا لَّمۡ نَقۡصُصۡهُمۡ عَلَيۡكَۚ﴾ تۆش وەكو سائرى (رُسُل) رسولى ﴿وَكَلَّمَ ٱللَّهُ مُوسَىٰ تَكۡلِيمٗا ١٦٤﴾ وَحى إلهى إتيانى كِتاب إرسالى رُسُل قسە لەگەلّ كردنى خوا شتێ نيە توو إختراعت كردبێ شتيەكى إلهيە، جاريە، كەوابێ ئەو تفريقە بێ معنايە و لە آيەت دا نيە.

خوا هەر لەگەڵ (موسی) قسەی کردووە، مقصود بَیانی إمکانە، أمّا چۆن قسە ئەکا لازم نیە بی زانین، ئەگەر تصدیقی رِسالت پەکی لە سەر ئەوە کەوتبی بۆ هەمووان وەك یەکە ﴿رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ﴾ بَیانی چاك وخراپ ئەکەن، بشارەت ئەدەن بەوانەی رێی چاکە بگرن، وئەوانەی بەڕێی خراپەدا ئەڕۆن ئەیان ترسێنن. ئەو ئیرسالە بۆ چیە؟

﴿لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ﴾ ملَت إتفاقیان هەیە کە عقڵ مغنی نیە لە إرسالی رُسُل ئەگەر چی مُعتزلی ئەڵێن عەقڵ حاکمە، أما لەگەڵێ جێ ڕێ بە مصالح ومفاسد نابا، خصوص پاش إختلافی آرای عەقڵ، إرسالی رُسُل حتمە، لاشك سَوادی أعظم عەقڵیان قاصرە، عەقڵ زَبونی دەستی هەوایە، إحتیاجی هەیە بە کەسیەکی مؤیّدي من عند الله لە مزلّقە قورتاری بکا، عەقڵ خۆی هاوار ئەکا بۆ ناردنی إمداد لە طَرف واهب العقل. بەڵێ وجودی نَظَر لە معجزە أوائلی دَعوەت لایان محض بە عقڵ، لام وایە ئەم قسەیە خراپ نیە، ولو مەلایانی ئێمە ئەمەشیان لێ قبول نەکردوون. ئەوی بلێ عقڵ مُغنیە إنکاری نبوەت ئەکا ﴿وَكَانَ اللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ١٦٥﴾ ئەگەر چی بە قُدرَت ئەتوانی (طَوْعاً أوْ كَرْهاً) عالم بێنێتە سەر شَاهڕاهی هِدایت، لاکن ئەمە لە دائرەی تکلیف ئەچێتە دەر بە مقتضای حِکمت تشریع پاش ئەو هەموو مَدارك وقُوایە کە داویەتیە بَشَر بۆ رفعی شُبهە بە مُعجزات وآیاتی بیّنات کە مندالّیش تێ بگا، رُسُلی هەنارد هەموو شتی بە چاکەو خراپە، (خاصّةً) قَدرو قیمتی بَشریتی بۆ إیضاح کردن، بَشر بەهانەی نەما بە غَیری عنادو ڕوچوون لە سفاهت وإفسادی فطرتی بَشَری، طمعی مالْ حُبّی رِئاسَت، إستنکاف لە طاعتی إلهی فوق الطبیعە، تذلّل بۆ مساوی ومادونی خۆیان، پاش ئەو آیاتی بَیّناتە، ئەگەر ئەمانە شاهدییان لەسەر رِسالتی تۆدا باشە، والله وإلاّ دلْ لە دلْ مەدە، غَم مەخۆ با ئەوان شاهدی نەدەن.

﴿لَّٰكِنِ ٱللَّهُ يَشۡهَدُ بِمَآ أَنزَلَ إِلَيۡكَ﴾ جنابی حق شاهدی ئەدا بە حقیّەتی ئەوە ناردویەتیە خوارێ بۆ لای تۆ. شاهدیەکەی ئەوەیە ﴿أَنزَلَهُۥ بِعِلۡمِهِۦ﴾ بۆیی بێ تناقضە، مُوافقی فطرەتە، بێ مەیل ومُحاباییە، (لو کان من عند غیر الله لوجدوا فیه إختلافاً کثیراً) (حقیقةً) خوا لە قرآن (خاصّةً) لە نَظمی علمی تیا بەجێ هێناوە، وەك بنّائی غایت ماهر، کە علمی خۆی لە وضع هَندسەی بنا صَرف بکا ﴿وَٱلۡمَلَٰٓئِكَةُ يَشۡهَدُونَۚ﴾ ئەوانەی کە أُمنای وحی إلهین، ئەوانیش شاهدی ئەدەن، زێرا خَدشەیێکی وای تیا نیە بلّێین مداخلە جنۆکە وشیطان وأرواحی خبیثەی تیابێ ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًا ١٦٦﴾ شاهدی ئەو بەسیە بۆ مُدَّعای، ولَو فَرَضْنا مەلائکەتیش شاهدی نەدەن پەکمان لەسەریان ناکەوێ ((کجابا شد گواهی مثل أحکم الحاکمین)).

(سابقاً) عرض کرا لە عالمی (کَوْن)، دلیل لەسەر وجودی ملائکەت نیە. دلیل سَمعە، وجودیان وأحوالّیان لە رُسُل وەرئەگیرێ کە باوڕیان پێ بکەن، لەسەر وجودیان ئەبێ باوڕیان پێ بکەین لە سائری أحوالّیان ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ بەخواو رُسُل جمع وتَفریق ﴿وَصَدُّواْ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ خەلّکی مَنع ئەکەن لە إتّباعی ڕێی خوا کە دینی فِطریە ﴿قَدۡ ضَلُّواْ ضَلَٰلَۢا بَعِيدًا ١٦٧﴾ نایێنە سەر ڕێی هِدایَت نزیکە مَحالّ بێ، چونکە ئەوەندە لێ ی دوور بوون.

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ وَظَلَمُواْ﴾ کفری لە نَظَرو دلیل نا، کفری مجرد، ظُلم ناشئ لە حِقد وحَسَد عَداوت ﴿لَمۡ يَكُنِ ٱللَّهُ لِيَغۡفِرَ لَهُمۡ﴾ هیچ معذرتیان نیە لە کُفر تا قابل بێ خوا لێ یان خۆش ببی ﴿وَلَا لِيَهۡدِيَهُمۡ طَرِيقًا ١٦٨ إِلَّا طَرِيقَ جَهَنَّمَ﴾ بە گوێرەی مَسلکی کُفریان ئەوەیە بیانبەین بۆ جهنّم، هدایتیان بۆ ئەو ڕێیە ئەدەین و بەس.

﴿خَـٰلِدِينَ فِيهَآ أَبَدًاۚ وَكَانَ ذَٰلِكَ عَلَى ٱللَّهِ يَسِيرًا ١٦٩﴾ تعذیبی ئەوان بەو نَوعَە لای خوا آسانه مع أنه جنابی أرحم الراحمین حەز ناکا عِبادی خۆی عَذاب بدا، مادام ڕێ بەدی بیەك بكا. ئەوانه بالكُلیه لـه ڕێ چـووینه دەر، ڕوویـان لـه خـوا نیـه، (محضاً) خۆیان ئەپەرستن وناشێلّن خەڵکیش خوا بە ڕاستی بپەرستن، (بناءاً علیه) بالمرّة دەرگەی ڕەحمەتیان له خۆیان بەستووه.

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدْ جَآءَكُمُ ٱلرَّسُولُ﴾ بۆ هەمووتان فَردی کامل خاتم الرُسل سید الكُل ﴿بِٱلْحَقِّ﴾ ئەوەی ئەو هێناویەتی گشتی (حَقّە) کتێبی دینـی فـروع وأصولی ﴿مِن رَّبِّكُمْ فَـَٔامِنُوا۟ خَيْرًا لَّكُمْۚ﴾ إیمان خێری مَحضه بـۆ خۆتـان کـەس أومێدی بە نَفعتان نیه، چونکه خودایه غَنیه، پێغەمبـەر طَمَعی ڕئاسـت وحُبّـی ماڵ وإستخدامی عِبادی نیه، خۆی عادةً بەیەکێ لە أفرادی أمّت حِساب ئەکا، له نَصبی (خیراً) إضطراریان هەیە.

مُعتَمد لای حَقیر قَولی (فرّا)یە، کە صِفَته بۆ مَصدری مَحذوف تَقدیری (إیماناً خیراً لکم) وله خولاصەی مَعنا دەرئەکەوێ، چ غُبـاری تیانیـه ﴿وَإِن تَكْفُرُوا۟﴾ خۆتان ضَرَر ئەکەن ﴿فَإِنَّ لِلَّهِ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِۚ﴾ ئەو غَنیه لە ئێـوە هـزار نَوعه عِبادی هەیە، وەکو ئێوەو لە فوقی ئێوەو ئەتوانی رَسولی خۆی حِفظ بکا، ومُکافاتی کە لایقی ئەوبێ پێی إحسان بکا ﴿وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ١٧٠﴾ نـاردنی ئەو رَسوله بەو دین و کِتابە یەکیەکـە لـە آثـاری عِلـم و حِکمتـی خـوا ﴿يَـٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَـٰبِ لَا تَغْلُوا۟ فِى دِينِكُمْ﴾ تجاوز مەکەن لـە دینـی خۆتـان لـە حـق خۆتان، دینیەکە خاوێن أتم الشرایع، کافِل بـە نظـامی عـالم، کاشـفی حقـایق و مشکلات کامـل وشـامل، دینـی موسـی سـبب بـە ظُلمـی جولـەکان زۆر تەنگـە، کەسێ بەو غِلّ و زنجیره نـاتوانێ خطـوه بـاوێ، وەك مـشربی سَلَفیانی ئێمـە مُـسڵمانان مُقیّـد ئەکـەن بـە سنّت، حتّـی لـە أمُـوری حَـرب وإداره وتـشکیل و

إنتظامی حکومەت، ئەو نوعە دینە بالکُلیە لە فِطرت دورە، دینی ( عیسی) نازانین چیە؟ ئەو مُدّەی بە پێغەمبەری ژیا چی لێ وەرنەگیرا تَدوین بکرێ، و تا رفع بوو لە سەر أحکامی تَوراة ئەڕۆیی، إلاّ لە بَعضە أحکامی ثقیلە، کە آرەزووی ئەفەرمو تعدیل بکرێ، پاش ئەو هەرکەسە شتیەکی ئەووت (بۆلّسی الرسول) بە جارێ أحکامی تەوراتی هەلّ گرت، بەناوی مسیح طَبیعتی بەرەللا کرد، تاکو مسئلەی إعترافی جُرم وصَکّی غُفرانی هاتە سەر، بە جارێ دینی ژێر بەرە ژوور کرد، وەك کوردی ئەلّێ ((کفن بە من ببڕێ، مردی گۆڕ بە گۆڕ چی)) رُؤسای کَنائس منتفع بین أُمَّت چی بەسەر دێ بابێ، کەوابی بە لاف و گەزاف ئەو غُلوە مەکەنە مَعذرەت بۆ إیمان نەهێنان بە پێغەمبەری آخری زمانی نُبوەت، حَق الانصاف توراة گەلێ أحکامی وای تیایە إنسان ناتوانێ بلّێ لە وضعی حَضرَتی موسایە فضل لە وحی وکلامی إلهی‌یە ﴿وَلَا تَقُولُواْ عَلَى ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡحَقَّۚ﴾ دائر بە ذاتی أقدس و صِفات وأفعالی، ئەوەی حَق نەبی، لایقی شَأنی ألوهیَت نەبێ مەیلێن، ئەوی بۆ مادیّات وطبیعیاتە نِسبەتی بۆ خوا مەدەن، من لە عالم پەرۆشی یۆنانیانم لە هەموو کەس زیاترە، پاش حِکمتی أفلاطون وأرسطوو فلسفەی إلهیان، چۆن بوونە دیان؟ چۆن بە جارێ لە عقلّ تَجرید کران، حقاً جێی تأسفە تحویلی ئەوان بۆ مسیحیەتی لە تحویلی جوان بۆ مەیمونی لە عقلّ دورترە، هەرچی بووە تأثیری وِراثی بووە لە آبای أقدمینیانەوە بۆیان بویتە میراتی مَعنوی. ئێوە لای خۆتان أهلی کِتابن مُوَحّدن إیمانتان بە رُسُلی عِظام هەیە خَبَر دارن بە دَعوتیان بە مُعجزاتیان، لە سەر ئەو حالّە چۆن ئەو إفراط و تفریطە ئەکەن لە حَق ( عیسی) ﴿إِنَّمَا ٱلۡمَسِيحُ عِيسَى ٱبۡنُ مَرۡيَمَ رَسُولُ ٱللَّهِ﴾ چۆن ئەلّێن بیژیە إنکاری مُعجزاتی باهراتی چۆن ئەکەن؟ ﴿وَكَلِمَتُهُۥٓ أَلۡقَىٰهَآ إِلَىٰ مَرۡيَمَ﴾ یَعنی محصولی کَلمەی ئەوە، کە أمری (کن)ە. (إنما أمره إذا أراد شیئاً أن یقول لە کنْ فیکون). هەمو شت

وایە، أمّا ( عیسی) چونکە لە میانەی سلسلەی بَشری سببی قریبی کە باوکە نیە نسبەتی بۆ أمری (کن) ماوەتەوە (مثلە کمثل آدم خلقە من تراب) وەك رابورد ﴿وَرُوحٌ مِّنْهُ﴾ خوا مَبدأی وجودە، هەمو عالم لەویەوەیە، أمّا خۆی خارجی سلسلەیە، وإلا عالم بێ مَبدأ ئەبوو. حکما و متکلمین إتفاقیان هەیە کە انسان عبارەتە لە جَسَدو روح، نە روحی حَیوانی کە مبدەئی حِس و حرکەیە وبەس، بەڵکو ڕوحێ کە مَبدأی إدراکی کُلّیاتە. لای حکماو وبعضی مُتکلمین ئەو روحە جَوهری مُجَردە لەناو بَدَن دانیە، نوعاً ما تَعَلّقیکی پێوە هەیە، لای باقی مُتکلمین جَوهری لَطیفە لەناو بَدَن دایە إمتیازی بَشر بەو جَوهرە لطیفەیە، ئەو جوهرە بە نَفخەی إلهی دیتە بَر بَدَن، بە قُوَتی قاهرَی خۆی تیا حَبس ئەکا إلی أجلٍ معلوم، وە ڕوح چ حیوانی چ إنسانی سرّی مکتومە، آثاری دیارە حَقیقتی نازاندری، ئەوەندە ئەزانین جَوهریکە لە طَرَف خوا ئەهاویژرێتە بَدَن. ( عیسی) و غَیری ( عیسی) وەك یەکن، إنسان وغَیری إنسان لەو أمرە مُساوین. وەك سابقاً ووتمان ( عیسی) چونکە بلا أب بووە ئەو ڕوح ومَبدأی حَیاتەی رأساً لە طرف کبریائی هاتە بەر بَدَن بۆیە ئەفرموێ (منە) ﴿فَـَٔامِنُواْ بِٱللَّهِ﴾ بە وحدانیەتی إیمان بهێنن ﴿وَرُسُلِهِۦ﴾ تفریق لە بەینیان مەکەن ﴿وَلَا تَقُولُواْ ثَلَٰثَةٌ﴾ مەڵێن إله سێن (٣) أب وإبن وروح القدس. کەسی آرزو ئەکا إیمانی بە أله ووحدانیتی ألە ببی لە علمی حکمت وکلام مَبحثی وجوب وإمکان وإمتناع و وحدة وکثرة إتقان بکا. عُلمای نَصاری لە بَحثی وحدة مُغالطە ئەکەن، عادةً فَرق ناکەن لە بَینی وحدتی حقیقی و زاتی وشخصی وإجتماعی، بۆیە ئەڵێن سێ یەکەو یەك سێ یە، ئەگەر ئەم قَضیە تَصوّر بکەن ئەزانن واحد نابێ بە دوو، دونابێ بەواحد، إلاّ بە إعتبار و إجتماع، وحدتی حقیقی چ کثرتی إعتباریش نیە، أما وحدتی ذاتی قابلی کثرتی إعتباریە، ئەوی مُتصّف بێ بە وجوبی وجودی ذاتی لە فَوقی طبیعتە، هەرچی أحوالی طبیعیات بێ بۆئەو ممنوعە، زمان ومکان وإتحاد وحلول لە واجبی حقیقی محالە، أصلاً تَعددی إلە لە

مشركانه، كه إيمانيان به نُبوه‌ت نيه. له أتباعی رُسُل دور بوون. ثنوی دوو شتی مختلفيان ديت له خێرو له شَر، ووتيان خوا خێری مَحضه نابێته مبدأی شَر، دو مَبدأيان دانا يه‌كێ يه‌زدان يه‌كێ أهريمن. رۆمانی ته‌ماشای أنواعی خێرو أنواعی شَريان كرد إلاهيان زۆر كرد، أمّا إی ديانان سێ (٣) بۆ مع أنّه خلق وإيجاد خێر و شَرّ عُلوی وسُفلی به مليۆن سالّ پێش ( عيسی) عيسای چ پێ ده‌وێ وه‌ك قطبی فردی صوفيه‌ی ئێمه كه‌سی طبيعيون بێ إيمانی به نُبوت نه‌بێ چۆن تصديق ئه‌كا ( عيسی) بی باب بووه مردوی زيندو كردوته‌وه هه‌يكلی طَيری له قوڕ دروست كردووه وفوی تێ كردووه بۆته طير، ئه‌گه‌ر إيمانی به نُبوه‌ت هه‌بێ چۆن ئه‌ڵێ ئه‌وه‌ی ئه‌و جۆره خَوارقه‌ی له سه‌ر ده‌ستی ئاشكرابێ خوايه؟ حقيقةً مُنافقی حقيقی ئه‌وانه‌ن، نه طبيعيّونن نه إلهيون، علاوه‌ی ئه‌وه مريم لايقتره به ألوهيت له ( عيسی)، چونكه (عيسی) له‌وه، ئه‌و مصدری إلهيه بۆ چ أب وإبن إله بن، بۆ أمّ إله نه‌بێ، عُلمای إسلام نسبتی وَلد الزنايان له باب پێ قَطع كراوه أمّا له داك نه‌كراوه، زێرا أمری قطعيه رابطه‌ی به‌كه‌س نابردرێ سيّد رشيد تفصيلاتی زۆر به فائده‌ی هه‌يه شايانی ته‌ماشايه، طنطاوی جه‌دوه‌ليه‌كی هه‌يه له بۆذه‌ويان مُوافقی قَولی نصاری، وگه‌لێ قولی بۆذه‌ويانی تيا به‌يان فه‌رمووه، چاك وايه لێره بنووسرێته‌وه وه بَعضه أقوالی عبدالله كوليَاميش شايانه لێره إيراد بكرێ، له وه‌قتی تبييض إنشاء الله ئه‌يكه‌ين ﴿ٱنتَهُواْ خَيۡرٗا لَّكُمۡۚ﴾ به‌سيه له‌و هه‌ذه‌يانه ده‌ست هه‌ڵبگرن ﴿إِنَّمَا ٱللَّهُ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۖ﴾ بێ شَبَه وشَريك وضِدّ ونِدّه ﴿سُبۡحَٰنَهُۥٓ أَن يَكُونَ لَهُۥ وَلَدٞۘ﴾ نه( عيسی)، نه مَلك، نه غير نه زێر، جنابی حَق مقدسه له توليد وتوالد، وإلاّ ئه‌ويش داخلی زُمره‌ی نباتات وحيوانات ئه‌بێ و ئه‌بێ بمرێ، چونكه قُوّه‌ی مُولّده بۆ بَقای نَوعه، واجب الوجودی بالذات، بالذات باقی وقديمه ﴿لَّهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِۗ﴾ نيسبه‌تی هه‌موی بۆ ئه‌و يه‌كه عالم ممكنه ئه‌و واجب الوجوده، عالم مُفتقره ئه‌و غنيه، عالم متكثره ئه‌و واحدی حقيقيه به‌هيچ وجه

ناگەنە یەك فضلاً کە بینە یەك ﴿وَكَفَىٰ بِٱللَّهِ وَكِيلًا ﴿١٧١﴾﴾ خالق ئەوە، حافظ ئەوە، زوال و وەهْنی بەسەردا نایێ، قادری بالذاتە، وَلَدی بۆ چیە؟ ﴿لَّن يَسْتَنكِفَ ٱلْمَسِيحُ أَن يَكُونَ عَبْدًا لِّلَّهِ﴾ مسیحی قەلەندەر ئەڵێی؟ أبد الآباد لوت بلّندی لە عَبدایەتی وبەندەگی بۆ خوا ناکا. عَجابیە خۆی بە عُبودیت سەرفرازە، إتباعی ئەیکەنە خواو کوڕی خوا، ئەگەر (عیسی) بەو دوو سێ خَوارقە ببێتە خوا یا کوڕی خوا، ئەبێ (دجّال) چ بێ؟ زێرا بە ملیۆن عَجاییاتی وای لێ ئەگێڕنەوە کە (عیسی) ڕیٕی پێ نابا، وچۆن ئەتوانێ ئەو أعجوبەیە بکوژێ. خلاصە ملیّون لە شرك وکفرو خوڕافەت پەرستی دەرنەچون، إیمان بە قُدرتی خوا توسیعی خَیالی زیادکردن، خاصّةً کە گوتیان ملائکەت قسە نامینێ، کە کرامتی (وَلی) هاتە گۆڕێ بەجارێ زِمامی هۆش وإدراك لە دەستیان ئەچێتە دەر ﴿وَلَا ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ ٱلْمُقَرَّبُونَ﴾ لە سەر ئەو هەموو قُدرت وقُوەتی کە بۆیان إثبات ئەکەن، و نەداکیان هەیە نە باب، نە ئەخۆن نە ئەخۆنەوە، نە ئەنون فتور وەهنیان بەسەردا نایی، لام وایە ئەڵێن ناش بوڕژێن. ئەوانیش إمتناع ناکەن لە عُبودیت. لاشَكَ لەو جِهتە ئەوان لە فَوقی بَشَرن (چۆن فَوقی بَشَر نین لەو جِهتە)؟ ئەڵێن (عیسی) لە نَفخەی یەك یەك لەو مُقربانەیە ﴿وَمَن يَسْتَنكِفْ عَنْ عِبَادَتِهِۦ﴾ئەوەی إمتناع بکا لەعبادتی خوای ﴿وَيَسْتَكْبِرْ﴾ گەورەیی بنوێنێ، أنّە دەعیەی نەهێنێ خوا بپەرستێ، وەك مُنوّرەکانی زەمانی ئێمە، لە (کَلَمَنْصو)ی إفرنجی ئەگێڕنەوە کە پێش مردن ووتوویەتی (من إیمان بە خوای ضُعَفایان ناهێنم) وگەلێ کەس هەن دەعیەیان ناهێنی لەگەلّ عَوامّ لە مَساجد عِبادَت بکەن، وإشتراکی عِباداتی عُمومی ناکەن، گوایا ئەوان خَواصّن لەوە گەورەترن کە تیەکەلاوی عَوام ببن ﴿فَسَيَحْشُرُهُمْ إِلَيْهِ جَمِيعًا ﴿١٧٢﴾﴾ مُؤمن وغَیر مُؤمن مُتکبر ومُتواضع ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ﴾ ئەوی

گونجا لە محلی خۆی ﴿فَيُوَفِّيهِمْ أُجُورَهُمْ﴾ بە تەواوی أجری خۆیان پێ ئەگەیێنێ ﴿وَيَزِيدُهُم مِّن فَضْلِهِۦ﴾ أجر منّتی نیە، حَقی خۆیانە، أصحابی ئێمە ئەڵێن عَبد إستحقاقی ثَوابی نیە –سبحان الله– خوا خۆی إعتراف لە حقیان ئەکا، فرق لە بَینی پاداش وزێدەیی إظهار ئەفەرموێ. لای من عَبدی مطیع بە هەموو نَوع حَقی لە سەر خوا هەیە، قیاسی لە عَبدی إنسان ناکرێ، خوا قَویە، عبد عاجزە، خوا غَنیە، عبد محتاجە خوا بێ عَوائق ومَوانعە عبد هەزار عَوائق ومَوانعی هەیە، خوا هەزار نَوعە مَوجوداتی تری هەیە، عبد بە غیری خوا کەسی نیە، عبد محاربەی لەگەڵ نفسی خۆی لەگەڵ شیطانی إنس وجین لەگەڵ طبیعەت ئەکا، روح ومالٚ و أولادی لە رێی خوا بەخت ئەکا. دڵی لە هەموو علائق ئەبرێ چەند زەحمتە، إلهی تۆ ئەیزانی، لەسەر ئەو هەمو أحواڵە ئەفەرمون حَقی نیە، هەموی فضلە، عذاب دانی عَدلە. خوا ئەزانی شەوی زستان (خاصّةً لە کوێی) سەرماو بەفرو باران وباو شەختەو بەستەڵەك آوی سارد (شوتی شەق ئەکا)، مُسلْمان لە جێی خۆی هەڵ ئەستێ دەست نوێژ ئەشوا دوو ڕەکعەت نووێژی سبەینی بەجێ ئەهینی، هەمو بهشت لە پاداشت ئەو إطاعەیە کەمە، إجرای وظائفی عُبودیت لە إجرای وظائفی ألوهیَت گەلێ زحمەت ترە، ولە خصوصە فَضلی إنسانی مطیع لە سەر ملائکە چۆن إنکار ئەکرێ (الأجر علی قدر المشقة)؛ آخ إنسان خۆی خۆی ڕەزیل کردووە، سەجدە بۆکەرو گا ئەبا، وإلاّ إنسان زۆر بە قَدر وقیمتە، زُبدەی مَخلوقاتی خوایە. حاصلی إنسانی چاك لە هەمو شت چاترە، إنسانی خراپ لە هەمو شت خراپترە ﴿وَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسْتَنكَفُوا۟ وَٱسْتَكْبَرُوا۟﴾ لە طاعت وعبادت وعُبودیت ﴿فَيُعَذِّبُهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا﴾ عَذابی بە ئێش ﴿وَلَا يَجِدُونَ لَهُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَلِيًّا وَلَا نَصِيرًا ﴿١٧٣﴾﴾ نە (عیسی)، نە ملك، نە شیطان، نە شێخ أفندی، نە گاجوت نە ماسی، نە سەگ. ئەوسا ئەزانن چەند ڕەزیل و مُحقَرو

مُهان و سام وبێ سلاّواتن ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ﴾ هەموتان بزانن ﴿قَدْ جَآءَكُم بُرْهَٰنٌ مِّن رَّبِّكُمْ﴾ دلیل و حُجتی قاطع وساطِع بی شك شُبهە ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكُمْ نُورًا مُّبِينًا ﴿١٧٤﴾﴾ ڕێتان بە تەواوی بۆ ڕوناك ئەكا، هیچ بەهانەتان نەما، پەردە هەلّ گیرا، عادةً إیش بووە عَیان ﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ بِٱللَّهِ وَٱعْتَصَمُوا۟ بِهِۦ﴾ بە بُرهان بە نوریەوە دەست بگرێ ﴿فَسَيُدْخِلُهُمْ فِى رَحْمَةٍ مِّنْهُ﴾ صِلەی ئێمە لە خدمت خوا عبودیتە، صِلّەی ئەو بۆ ئێمە رَحمتە. کەسێ مُحافظەی ئەو صِلەیە بکا خوا ئەیهاوێتە ناو رَحمتی خۆی، چۆن إیمان چوویتە ناو دلّی ئەو، ئەویش ئەچێتە ناو رحمتی إلهی، ئەوی صِلەی رَحم لە بینی خواو عبد پەیا بکا لە صِلەی ڕەحمتی خوا مَحروم ئەبی. مَوقعی ئەو (یا أیّها الناس)ە زۆر عَجاییە. کەسی آیاتی سابقە بە تَدبّر بخوینێتەوە ئەوجا دلّ ڕابگرێ ئەو خِطابە بە عامّەی بە غایت مؤثرانە دێتە گوێی ﴿وَفَضْلٍ﴾ فضل بێ لە طَرف خوا، خوا بە مُهمی دابنی ئەبێ چ ئەبی. (کَمّاً) و(کَیفاً) لە عالم مجهولە. مُحاطی علمی إلهیە وبەس ﴿وَيَهْدِيهِمْ إِلَيْهِ صِرَٰطًا مُّسْتَقِيمًا ﴿١٧٥﴾﴾ هِدایت بۆڕێی ڕاست بَعد الإیمان باللە مَربوطە بە إیمان وتَمسُّك بە قرآن، وەك لە أوّلەوە زاندرا کە جەنابی حَق إجابەی دُعای إیمان داری کرد بە (ذلك الکتاب لا ریب فیە هدی للمتقین) قرآن هێشتا زۆری ماوە نزول بکاو بێ، هەتا زیاتر بێ هِدایَت زیاتر ئەبێ، ئەوەندەی هاتووە دەستی پێوە بگرن، لە هەمو خصوصی خوای تعالی ڕێی ڕاستیان نیشان ئەدا، مَقصدی کبریائی هِدایتی عبادی خۆیەتی. أز جُملە ئەگەر مسئلەییەکیان لێ إشکال بوو بۆ زێدە إیضاح جنابی حق آیتیان بۆ ئەنێری چ لە أصول چ لە فروع ﴿يَسْتَفْتُونَكَ﴾ لە کَلالە بە قرینەی جَواب ﴿قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِى ٱلْكَلَٰلَةِ﴾ (جابر بن عبد اللە) لە حالّی نەخوشیدا بوو عرضی ڕیسالەتی کرد أصل و فروعی نیە، میراتی بۆکێ ئەبێ لە أقاربی؟ ﴿إِنِ ٱمْرُؤٌا۟

هَلَكَ ﴾ (وكُلُّ شيء هالك إلاّ وَجهه)، کەوابێ ئەو هیلاکە هیلاکی کوردی نیە ﴿لَيْسَ لَهُۥ وَلَدٌ ﴾ بابیشی نەبو ﴿وَلَهُۥٓ أُخْتٌ ﴾ یەك ﴿فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ ﴾ ئەگەر وَلدی هەبوو، نێر یا مێ، عجباً أخت ئەگرێ یاناگرێ چەند ئەگرێ چۆن ئەگری؟ ئێرە مَحلی نیە، وکذا نِصفی آخر بۆ کێ یە موضعیکی تری هەیە ﴿وَهُوَ يَرِثُهَآ ﴾ برا له خوشکی ﴿إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌ ﴾ هیچ. ئەی باب؟ ئەویش به نَظَر مقام ئەزاندرێ، که برای باب مردوو دیاره خوشکیش بی بابە، یعنی هەمو مالەکە أبیتە هی برا ﴿فَإِن كَانَتَا ٱثْنَتَيْنِ ﴾ دو خوشك بوون ﴿فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ ﴾ لەو (هو یرثها) ئەزاندرێ کە دوبرا له خوشکی هکذایی، له تقسیم به تساوی إرث ئەبەن، ئەگەر له دوو زیاتر بوون حُکم ناگورێ، ثلثان له بینیان تقسیم ئەکرێ. ئەفەرمون أخواتی جابر حەوت، (بعض)یەك ئەلێن نۆ بوون ﴿وَإِن كَانُوٓا۟ إِخْوَةً رِّجَالًا وَنِسَآءً ﴾ نێرومێ بە هەر جۆرێ بێ بالعدد متساوی، یا مختلف ﴿فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ﴾ به قاعدەی مُقرّره مَذکوره له أولی سوره ﴿يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ أَن تَضِلُّوا۟ ﴾ یَعنی بەیانی ئەوەندە آشکرایە به أدنی إنحرافی گومراه ئەبن، بەیانی وانیه که مَحلی إجتهاد بی ونائلی ثواب بن. حقیقةً بیانی هِدایت مُتضمنه بۆ بیانی ضَلال، وحَضرتی کِبریائی هەروەکو کو رێی هِدایَت آشکرا ئەکا، رێی ضَلالیش إیضاح ئەفەرموێ، مەیلی مُشاغبات وطبیعتی شِعری لە قرآندا نیە ﴿وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ ﴿١٧٦﴾ ﴾ ئەفرمون ئەو آیته له هاوین نازل بوە، آیتی سابقه له حَق کلالە له زستان. إمامی عمر مَسئلەی کَلالەی لا زۆر مُشکل بو، بالواسطه و بلا واسطه مُراجعەی پێغەمبەری ئەکرد، لە خوای ئەخواست بەیانیکی شافی. عمر لە لاییکەوە ناحقی نەبووه. أولاً قسه له کلالەیه من حیث اللغة إطلاقی ئەکریتە سەر میرات گەر إطلاق ئەکریتە سەر میرات لی گیراو، له قەولیەك غەیری والد وولد له میرات

گر کلالەیە، لە قەولی أولادی أم فقط. لە قەولی بنی أعمام أباعد دورتر لە آموزا لە تعارفی کوردی بن عامیان ئەلێن، لە قەولی ئەو عَصبانەیە کە لەگەڵ کە أولادی أمّ میرات ئەگرن، میرات لێ گیراوی بێ باب وولد، ئەمە رأیی أبو بکری صدیقە، یا بێ ولد یا بابیشی هەبێ مەیلی فاروق بۆ ئەوەیە. لە أوائلی سورە کَلالە بە إرث ذکر کراوە بێ تفسیر، چ تاق لا ذکر نەکراوە. لێرە هەر نفی ولد ئەفەرموی تَعرُضی بۆ باب نیە، تقیید بە إعتباری سببی نزول لای فاروق خۆش نەبوە، خصوص مع التفریق وکو أیرە، کەسێ طعن لە عُمَر بدا لە بێ فهمی خۆیەتی. گەلێ إنسان شتیان لا سەهلە، لاکن بعد الدقە دەرئەکەوێ صعبە. عمر ئەیەویست جَنابی حَق مفصلاً بێ ڕێی إجتهاد خودا کَلالەیان بۆ بەیان بفەرموێ. أمّا قرآنی کریم لە گەلێ جێ (خاصَّةً) لە فرائض ڕێی إستنباطی کردیتەوە، ئەمەش حَق الإنصاف موجبی ترقی أهلی نظرە. هەرچی بێ بە صراحت وەربگیرێ، قوم بەڵەد ئەبن أهلی نظرو فکریان نابێ ئەگەر اجتهاد نەبا، ئەو هەموو ملا گەورانە لە أسلامەتیدا پەیا نە ئەبوون، هەرکەس چاوی هەر لە ڕشکەو سپیلکە بێ، مێشکی ئەبێتە ناوکە کودو، ناتوانێ بە گوێرەی مُقتضای حاڵ بە فکری خۆی إختراعی بکا، ئەگەر قسەی ملایێکی لابوو ظریفە، وإلا مُعطّل ئەبێ، بۆیە من گەلێ جار ئەڵێم کورد ملای کتێبیان زۆر بووە، أمّا مَلای مفکّر کە بتوانێ لە ذِهنی خۆی بە گوێرەی مَقام قسە بکا دوو ملایان بووە، یەکێ مفتی زەهاوی، ئەوی تر بابم ڕەحمەتی خوایان لێ بێ، حقاً ئەو دوو ذاتە لە نوادراتی دەهر بوون. لە إبن عباس ئەگێڕنەوە أول کەس گەیشتە سەر (فاروق) (کە بریندار کرا) من بووم، فەرمووی لە من سێ (٣) شتان حفظ بکە، ئەترسم خەڵکم نەگاتە سەر، من حُکمم لە کَلالە نەکردووە و کەسم بە خلیفە دانەناوە، وە هەر عبدیەکی [redacted] ئازاد بن. روایت ئەکەن (فاروق) لە سەر مِنبر سُؤالی لی کرا لە کلالە، دستی هاویشتە سەر ردینی، فەرموی کلالە، کلالە، کلالە، والله، کلالەم بزانی بایە پێم خوشتر بوو لەوەی ڕۆژی لەسەر هەڵ دی، من سُؤالم لە پێغەمبەر کرد، فەرموی آیا ئەو آیەتەی لە هاوین نزولی کرد

نەت بیستووە؟ (بعض)ێ ئەڵێن لە آخری عُمری لـە فکـری خـۆی گەڕایـەوە بـۆ فکری صدیقی أکبر، ئەو ماجرایە دلالەت ئەکا لە سەر بُعدی نَظری عُمـرو کمـالی إحتیاطی لە أستنباطی أحکـام، ئـەوی بەڕاسـتی مـلا بـێ حَـق وایـە لـەو فکـرە إتباعی عُمر بکا، بە أدلّەی واهیە هجوم نەکاتە سەر حُکم...

لله الحمد والمنّە، تفسیری سـورتی (نـساء) تـەواو بـوو، گـەلێ عوائـق کەوتـە بەین، ئەو مُدّەی لە چنارۆك بۆم هیچم نەنوسی، دوایی چوومە تعزیەی مرحـوم شێخ محـی الـدین، کـە هاتمـەوە ناسـاغ کـەوتم، تـەواوی رمـضانم بـە ناسـاغی ڕابوارد، لە شەشی شوّال شێخ عبـدالعزیز وفـاتی کـرد، حقـاً داغیکـی نابەسـەر جەرگم دائماً ئەکزێتەوە، بێ هێزی کردم، جنابی حَـق بیهاوێتـە نـاو ڕەحمـەتی خۆی. لە خێری ئەو تفسیرە بەشیەکی چاکی پـێ بـدا ومـوفقم بکـا بـۆ إتمـامی تفسیری کوردی آمین. ذی القعدة آخری ڕۆژی سـێ (٣) شـەموو بیـستی شـباط رومی سنة، ١٣٥٣هـ و ١٩٣٥م.

# سورەتی مائیدە

﴿ربّنا أنْزِلْ عَلينا مائدةً منَ السّماء تكونُ لنا عيداً لأوّلنا وآخرنا وآيةً منكَ وأرزقنا وأنت خير الرّازقين﴾ سورەي مائدە لەگەڵ سورەتـي نساء وآل عمران وبقرە وفاتحە، لە غايەت مناسبەو إنتظام دايە.

لەسورەی فاتحە طلبي هِدايە ت كرا، لە بقرە جواب درا، لە آخری علاوةً دوعای نصرەتیان كرد جواب درا، لە آخری آل عمران شە رطي نصرە ت دەريان بوو، كە صبرو مصابرەو دەوام رابطهي إتحادە. لە نساء طلبي إتحادی عام كەوتە بەين، قوەت درا بە صلەي رحمي عومي وخصوصي وإعتناي زۆر بە دەوامي رابطە لە بەيني خالق ومخلوق نوان درا. لە صەدری ئەو سورەتە دەر ئەكەوێ كە خوا وەفاي بە عهدي خۆی كرد، رايەتي إسلام بە نسيمي فتح وظفر لارايەوە. خودای تعالی طلب دەكا كە أهلي إيمان وەفا بە عهدی خۆيان بكەن، ئەم عقودە لەگەڵ سائری عقود كە لە سورەی پێشو بەيان كرا بەجێ ی بينن. بنا لەو إنتظامە كە بەيان كرا حقيقەت قسەی ئەوانە دەر دەكەوێ كە دەلێن.

﴿بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ﴾ بۆ فصلی سُورە وەئەگەر لەبەر إعتنا بەما في السُوَرْە نەبی زۆر نزيكە هەمويان ببنە يەك سورەت. چەند ﴿يا أيّها الذين آمنوا﴾ رابرد كە دەتوانين ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوۡفُواْ بِٱلۡعُقُودِۚ﴾ بكەينە جزءی لاينفك لەگەڵ وان. سبحانُ ناظِمُ الكائنات! وناظم السُورِ والآيات! عقود وعهود لەگەڵ يەك ولو غَيْرَ دين، لە خدمەت خودا بەجێ بينن بێ نَقْص وخَلَلْ شائبە ي

خیانەت! ﴿أُحِلَّتْ لَكُم بَهِيمَةُ ٱلْأَنْعَٰمِ﴾ ڕێی (مَكّە) کراوە حەصرتان لەسەر نەما! بە کەیفی خۆتان تصرفیان تیّ ئەکەن!

بەهەوی ئەنێرن لە نُسك وکەفارات تقدیمیان ئەکەن. حیواناتی بەرّی بە چوارپیّ برروا بەهیمەی پیّ ئەڵێن! (أنعام) بەمەرو بزن و حوشترو رەشەولاغ وگامێش ئەڵێن. غەیری ئەوانەش حەلالن ئەمما لێرە ئەوانە مقصودو مُناسبن بۆ مَقام. تَقَرُّب بە ذَبحي وانە بۆ غَيْرِي خوا نەما! گویّ هەر تلبیشاندنی (أنعام) تیّ پەري! ﴿إِلَّا مَا يُتْلَىٰ عَلَيْكُمْ﴾ عَن قریب دیّ! ﴿غَيْرَ مُحِلِّي ٱلصَّيْدِ﴾ للهِ الحَمد کەوتینە دەوري راو و شکار، دەست وبازومان کراوە لە حِلٍّ وحَرَمْ! ئێوە نێچیر حَلال مەکەن! ﴿وَأَنتُمْ حُرُمٌ﴾ حالیش وابیّ ئێوە لە اِحرام دابن! بە حەج، بە عُمرە، بەهەردووکیان! نەراوکردن، نەخواردني نێچیر، بۆتان حلال نیە! ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَحْكُمُ مَا يُرِيدُ ۝١﴾ (سیّد رشید) حُکم بە مَنع وقَضا تفسیر ئەکا، حقیقەت لە لغەت حُکم بەو دوو معنایەش هاتیە، أمّا صاحبي قاموس ئەفەرمویّ: (أَحكَمَهُ أَتْقَنَهُ) فاستحكم ومنعه من الفسادِ لام وایە چونکی بەبیّ تَعَدي نەکردیە بۆیە واي تفسیر ئەکا لکن حکم لەسەر معناي مەشوریّ بیّ چاترە (آلوسي) ئەمەی اختیار فەرموە بۆ مسئلەي تعدیە تضمیني معناي (يَفعَلُ) وي کردیە. خلاصە ئەوەی ارادەو قصدي بکا واي دادەنیّ هەر نەوعە حکمیّ بیّ ایجابي بیّ سلبي بیّ قضائي أنفاذي بی لە هەموي دا رعایەتي حکمت ومصلحەت ئەفەرمویّ مقصدیش ئەوەیە إحترامي حریمي بیت آلحرام باقیە ماجرای قریش خللی پیّ ناگەیيني ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُحِلُّوا۟ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ﴾ شعارو علامەتی کە لەزەمانی خلیل لە طرف خوا دَانرایە تێکی مەدەن حدودي حرم مەبەزینن. ﴿وَلَا ٱلشَّهْرَ ٱلْحَرَامَ﴾ حرمتي أشهر (آلحرم)یشمحافظە بکەن بەشەرو دعوی پەردەی إحترامیان مەدرێنن ﴿وَلَا ٱلْهَدْىَ﴾ ئەوەي کە بو کعبە بە هدیە

ئەنێردریٚ بە هیچ نوع دَخلي مەکەن ﴿وَلَا ٱلۡقَلَٰٓئِدَ﴾ ئەو قەلێیە کە علامەتي هدیە لەملیان لیٚ یان مەکەنەوە نەبادا نەناسرین وە نهب بکرین ﴿وَلَآ ءَآمِّينَ ٱلۡبَيۡتَ ٱلۡحَرَامَ﴾ ئەوانەي قصدي بیت الحرام یەعنی کعبە ئەکەن ریٚ یان لیٚ مەگرن وە منعیان مەکەن ﴿يَبۡتَغُونَ فَضۡلٗا مِّن رَّبِّهِمۡ وَرِضۡوَٰنٗاۚ﴾ شکر للە بیت الأصنام بۆوە بە بیت الحرام، لە مسجد الحرام ئەوجا توجە بۆ بیت الحرام ئەکریٚ ئەوەی بۆی دەچیٚ طلبي فضلو رضواني خوای ئەکا. ئێوە نەبنە حائلي ئەوانەي کە طلبي زێدەی و رەزامەندی خوای خۆیان ئەکەن بە توجە بۆ بیتِ الحرام. ﴿وَإِذَا حَلَلۡتُمۡ فَٱصۡطَادُواْۚ﴾ کە لە احرام هاتنە دەر بۆتان مُباحە راوکردن ونێچیر، عوداً على ما کان. اساساً راوکردن واجب نیە وە مندوب و(سُنەت)یش نیە، وأکثر لەوانەی کە ئەفەرمون أمری مطلق بۆ وجوبە ئەلێن امری بعد التحریم بۆ رفعي تحریمە. غرض لەو مقدماتە ﴿وَلَا يَجۡرِمَنَّكُمۡ شَنَـَٔانُ قَوۡمٍ أَن صَدُّوكُمۡ عَنِ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ﴾ لەو آني دا توجە بۆ مسجد الحرام بوو چونکي کعبە پر لە أصنام بوو ﴿أَن تَعۡتَدُواْۘ﴾ ئێوە حمل ئەکاتە سەر عدوان وتجاوز وعدوَاتي قومي بۆ ایوە لەبەر ئەو ضلمَي کە کردیان ئیوەیان مەنع کرد لە چوونە مکە بۆ حج عَفى الله عما سَلَف ئەم کۆنە رقە بەخاتر مەینن ﴿وَتَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡبِرِّ وَٱلتَّقۡوَىٰۖ﴾ لەسەر چاکەي فراوان وەپەر هێزکاری یارمەتی یەك بکەن ﴿وَلَا تَعَاوَنُواْ عَلَى ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِۚ﴾ معاونە مەکەن لەسەر گوناهو تجاوز لە حدود وسنور.

﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۖ إِنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ٢﴾ خۆتان لیٚ نەگۆریٚ بە نظرو لطفي إلاهي مغرور مەبن لەهەموحالان خۆتان بپارێزن لە مخالەفەي فەرمایشاتی خوای تعالان شديدُ العقابُ چی دنیەوی چی أُخرَوي، رووی لیٚ وەرگێرن لێتان

وەرئەگەرێ ﴿حُرِّمَتۡ عَلَيۡكُمُ ٱلۡمَيۡتَةُ﴾ ئەو شورعه لە مصادقي إلاّ ما يُتلى، خواردنى يا تناولى مردار لە ئێوە حرام كراوە ﴿وَٱلدَّمُ﴾ خوێن نفسي بهيمة نى يە أما مداري حياتيه، بۆيە وئەويش أستثنا ئەكا ديارە خوێن نەبێ حيوان نابێ. ﴿وَلَحۡمُ ٱلۡخِنزِيرِ﴾ گۆشتي بەرازى ﴿وَمَآ أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦ﴾ تحريم كرا، وەئەوە مُجَرَّدْ لە جهتي دينە دخلي طبيعه وفطرتي تيا نى يە، بُت پەرستەكان بەناوى لات وعزى وسائري أصنام ذبحيان ئەكرد دەنگيان بە ناوى ئەوانە بلند ئەكرد ئەمەي بۆ تعظيم وتقربي الا غير الله بكوژرێتەوە لە ئێوە حرام كراوە خبائثي معنوي عبّادي أصنام تأثير ئەكا ذبحيشيان پيس ئەبێ.

﴿وَٱلۡمُنۡخَنِقَةُ﴾ بياني أنواعي مردارە خنكاوّ خنكاندراو وەك يەك حرامە لكن (سيّد رشيد) بە إتباعي (ابن جرير) إختباري قولي (سدّي) و (ضحاكي) كرديە ئەوي ئەخنكێ سەري ئەكەوێتە بەيني دوو دار يا پەتي داوي نێچيرەوان وەزۆر قوتي داينێ، لام نەختى سياسة تحريكي كرديە، (ابن عباس) ئەفەرموێ أهلي جاهليەت بهيمەيان ئەخنكاند وەئەيان خوارد ئەمە لە مسلّمانان حرام كرا، سيّدي آلوسي ئەفەرموێ أولى وايە تعميم بكرێ لە مَخْنُوقْ ومُخْنَق ﴿وَٱلۡمَوۡقُوذَةُ﴾ ئەوەي بە لێدان بمرێ بەدار بە بەرد بە بەندەقەي قُريني قۆچە قاني، أمّا تفەنگى زماني ئێمە ئەگەر نفسي رَميشْ حرام بێ مَرْمي حرام نابێ تفصيلي لە بحثي صيد عرض دەكرێ ﴿وَٱلۡمُتَرَدِّيَةُ﴾ لە جێ يْ بلند بەربێتەوە وەبمرێ ﴿وَٱلنَّطِيحَةُ﴾ بەشەر قۆچ بمرێ ﴿وَمَآ أَكَلَ ٱلسَّبُعُ﴾ گورك شێر وأمثالي وان ﴿إِلَّا مَا ذَكَّيۡتُمۡ﴾ ئەگەر مردار بو حرامە ئەگەر حياتي مابو وەسەرتان برێ حلالە ولو محققاً بمرێ ﴿وَمَا ذُبِحَ عَلَى ٱلنُّصُبِ﴾ جمعي نِصابە يا أنصاب عبارەتە لە بەردێ بێ نقش وتصوير چەند بەدرى وايان دانابو لە أطرافي بيت ذبيحەي إلاهەكانيان ئەكوشتەوە، ئەوەش نوعيكە لما ذُبِحَ لغير الله ﴿وَأَن تَسۡتَقۡسِمُواْ

﴿بِٱلۡأَزۡلَٰمِۚ﴾ ئەویش حرامە، تفسیري أزلام بە مَیْسِر لام جوان ترە لە تفسیري بەو سِهامە لەیەكیان نوسرابو خوام ئەمري پێ كردم لەوي دوەم خوا نَهي كردم، سێی یەم چی لێ نەنوسرابو بۆ سَفَرْ یاكاري مهم ئەگەر سَهْمي (أمرني ربِّي) بهاتبا إیشەكەیان ئەكرد ئەگەر (نَهاني ربِّي) هاتبایە نەیان ئەكرد. ئەگەر سادە كە هاتبا دووبارە ئەیان هاویشتەوە، گەرچی جمهور لەسەر ئەو قسەن أمّا لەگەڵ قِسْمَت ومُحَرماتي سابق من كە مفتونی نظمي قرآنم كە بە نَظمي جوان بێ یا جوانتر بێ مەیلم لەگەڵ ئەوە وەلەسەر رأي جمهور تقسیمي مال نی یە بەڵكو طلبي طَلَبِ ترجیح كردن لەسەر نەكردنە نەكردن لەسەر كردنە وەلە توجیهي حرمتي أضطرابیان هەیە حتّى بعضي فرقي ناكەن لەگەڵ قرعەيٍّ شرعي وحقیقة وجهي حِفظي عەقلە لە خرافات وسخافاتي إعتقاد وەإعتبار بەشتی پرووپوچ لكن مع الاسف ئەمڕۆ مزخرفات وترّهاتي كلێنانیان لە عالمي إسلامیەت زیاد ئەكا وە صورتي همەت وكراماتیشي وەرگرتیە ئیتر چارە ناكرێ.

﴿ذَٰلِكُمۡ فِسۡقٌۗ﴾ ئەمەتان یعني إستقسام بالأزلام خروجە لە عقل یا لە رعایەتي مصلحة. گەرچی مَیْسرە نوعاً ما نفعي هەیە أمّا ضرر (زەرەری) لە قازانجي پترە. یا جمیعي ما ذُكِرَ وەك ابنُ جریر ئەفەرموێ خروجە لە طاعەتي خواي ممكنە بلێین لە قواعدي حفظ الصحة حقیقة طبعي بشر وەك سائري حیوانات گۆشتی ئەوێ لكن ئەبێ بە گوێرەی لطافەتي مزاجي بَشَری تفریق بكری لە بینی ضارٌ ونافع مادّی ومعنوی، حتّى حیواني درندە هەمو نوعە گۆشتێ ناخوا. ئەڵێن شێر إستنكاف ئەكا فریسەی غیر بخوا وەمردار ناخوا گەلێ جارم دیوە پشیلە مشكي مرداری نەخواردیە ئەوەی خۆی شكاری بكا ئەوی ئەخوا لكن أتباعي ((بَولَسُ الرّسول)) لە هەمو شتیان تێ پەراندوە. ﴿ٱلۡيَوۡمَ﴾ ئەمڕۆ كە ڕۆژی ظفرە ڕۆژی نیلی مرادە ڕۆژی عِزّی إسلام وذُلّی كُفْرە ڕۆژی نزولی ئەو آیەتەیە ﴿يَئِسَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ تا سەرامەداني كفرو ضلال نا

ئوميد بووين ﴿مِن دِينِكُمۡ﴾ له إبطالي لەوەرگێرانـەوەي ئێـوە، رۆژی (ودّوا لـو تكفرون) تێ پەری چەندی تێ كوشين به دسيسەو مكرو إحتيال به طعنو ضرب وجنگ وجدال چيان پێ نەكرا سەعيان به هَباء چوو. دين چەسپا، ظفرتان بـو، فتحي مَكّه كرا هەمويان لەو رۆژە ئەترسان چ رؤساى أهلى چأنمّتي شـكر وثنـا ﴿فَلَا تَخۡشَوۡهُمۡ﴾ له الحمد. بێ هێز بوون کەلكي بـێ ترسـانيان پێـوە نـی يـە، لەوان مەترسن. ﴿وَٱخۡشَوۡنِۚ﴾ خوا ئەفەرموی له مـن بترسـن (مُحَوِّلُ الأحـوال) نەكەن مەستی صهباي ظفر نەبن. رابطەي إتحاد وأخوتي إسلام مەپسێنن. دائم الاحتراس بن. ئەوە ترس نی يە، تَحَفُظُه مقابلي طوارئي خارجي، ئەمڕۆ تەماشا كەن أعظم تريني دولي أرضي له هەموان دوور ئەنديشه وبه أحتراس ترە.

ئەمڕۆ له جێ يي سدّێ ئەكا نەك پاش صەد سالی دی لەوی تووشـي لافـاوێ بێ، ئەمڕۆ محافظەي رەژوويي پاپوري حربي ئەكەن نەوەك پاشی هـەزار سـالی دی پەكيان كەوێ سيادتي بحريان له قيس چێ.

مع الأسف مسلّمانان ئەمە به شێتی ئەزانن بۆ بقاي نوع تێ ناكۆشـن فـضل له بقاي سِيادَة. بۆيی چوو، صەد سال وهەزار سال بۆ عمري أمّه وەك سـەعات ورۆژە بۆ عمري شخص ((فإذا فَرَغْتَ فانْصَبْ)) سعي به دوامي عزّي دنيا سَعْيه بۆ قيامَة ﴿ٱلۡيَوۡمَ﴾ ئەمڕۆكە رۆژي عَرَفەيە قائدي أعظم رسولي أكرم له عرفاتـه له هەمو جوانب تەماشا ئەكا لەو موقفه أعظمه لەو مَشْعَرُ الحرامَ به غيري أهلي ايمان وتوحيد كەس نابينی. پـەروەردگاري عـالَمْ ئـەو آيەتـه بـۆ حبـيبي خـۆی ئـەنێرێ حقـاً ئـەوە رۆژێكـه تـأريخـی هـیچ پێغەمبـەری ئـەو رۆژەي نـەديو. ﴿أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ﴾ نظر بـه نظمـي قرآنـي مـدوّن بـه نـصرو فـتح وفـيروزي ئەتوانن به مُصلّحي اجراي ئاييني خۆتان بكەن حرّ و سەربەست بينو بـچن بـۆ حج وەقرابين صرف بۆ خوا ذبح ئەكرێ هيچ دركتان لەسەر رێ نی يە ﴿وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي﴾ ئێـوە مُـشركان منـع ئەكـەن، شُـكري خـودا بكـەن لـه چ رۆژێ

گەيشتنە چ رۆژێ ﴿وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا﴾ حقاً زۆر دڵەتان ديت گەلێ تالأوتان چێشت تەركي دارو ديارتان كرد. نفس ونفيسيشتان صرف كرد، نهايتي صبرو ثبات وغيرەت كێشتيان تا نائلي فتح ظفر بوون. حقيقە شايانن دينى إسلام بەو قدسيەت وعلويەتە دين وئاييني ئێوە بێ. خوا بەوە راضية هيچ إعتراضي لە ئێوە ني يە، دين ووفاو غيرەت وعِزّت ومەردايەتي لائقە بەو نوعە دلاوەرانە. وە نظر بە يومي نزول ئەمڕۆ دينم بۆ ئێوە إكمال كرد. أصول وفروع، بە إجمال وتفصيل تقرري كرد. لە مەيانى أحكام. أمرى إجتهادم بۆ علمايان هێشتەوە تا ئێوە قومێ متفكر بن أهلي إستنباط وإستخراجي أحكام نەك وەك بَبَغا ئەوي پێتان بلێن وا بلێن، چوار دليل بۆ ئێوە ثَبْتْ كرا. كتاب، سُنّة، إجماع، إجتهاد بە قياس وغيرە قياس. ئيتر زيدەي ونقصانى نى يە بەس توسيعي دائرەيە. وە لە مزاياى إسلامە فرق لە بينى زمانى وسعەت وزمانى تەنگانەيى فرقي نوێژي حضر وسفر فرقي خواردن لە هنگامي بون و نەبون ﴿فَمَنِ ٱضْطُرَّ فِي مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِّإِثْمٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣﴾﴾ ئەگەر مرداريش بخۆن بەقەدەر ضرورة باكي ني يە بەڵكو واجبە أما چونكە تازە لە (عەرەبان) ((مؤمنان)) حرام كراوە ميل بەلاي تحريم زياتر ئەنوێنێ ﴿يَسْـَٔلُونَكَ مَاذَآ أُحِلَّ لَهُمْ﴾ لە غيري بهيمة الأنعام سائري حيوانات برّي وبحري ما يدّبُ وما يطيرُ وممكنە سؤالەكە عام تر بي حقيقة سؤالي زۆر بەجێ يە نشأي ((غير مُحِلّي الصّيْدِ وأحلَتْ لَكُمْ بهيمة الأنعامَ))ە هيچ دخلي بە قتلي صەگەوە ني يە، جمعێ لە عشاقي روايەت نقل ئەكەن لە أبي ((رافع)) ئەڵێن ((جبريلي)) أمين هاتە لاي پێغەمبەر إذني دخولي طلب كرد، پێغەمبەر إذني دا ((جبريل)) تأخير بو لە هاتنە حضور، پيغەمبەر لۆى چو ئەويش لەبەر دەركەي راوەستابو فەرموي اِذن مان دابوي بێ يە ژوور بۆ نەهاتي؟ ((جبريل)) فەرموي بەلێ أمّا ئێمە ناچينە خانوێ صورة يا صەگى تيا بێ تماشايان كرد گوجيلە

صەگێك لە خانو دا بو ((أبو رافع)) ئەلێ أمري كردە من هەر صەگێك لە مدینە دابي بي كوژم، منیش أمرم بەجێ هێنا.

جماعەتێ هاتن عرضي پێغەمبەریان كرد چی بۆ ئیمە حلالە لەو أمّەتەي كە أمرت كرد بە قتلیان، پێغەمبەر سكوتي كرد ئەو آیەتە نازل بو. توخوا لەو قسە پروپوچانە گەڕێن سؤال لە كێ؟جواب لە كێ؟ تعجب ئەكەم محدثـەكان كویـان قبول كردیە كەي ((جبریـل)) هاتبێتـە لای پێغەمبـەر أسـتئذاني كردیـە؟ ﴿قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ﴾ هەرچی پاك وخاوێن طِبـاعي سلیمە نَفْرَتـي لـێ نـەكا، لـە ئێوە حلاڵە. لام وەبە أمرو مراجعەي أطِّباي كیمیـاویون بكـەین باشـە، ئـەوەي موافقي مزاجي بشري بێ نەفرەت و دەردو بەلا حلالە، ئەوي تر حرامە ئەوەش بۆ ئەو حیواناتەي كە نصّي لەسـەر نـەبێ وإلا حـاجة بـە مـراجعة نـي یـە. لـە ((توراتي)) كە الآن لاي ئێمەیە بـۆ حیوانـاتـي چوار پـێ قاعدە أخـذ ئـەكرێ، هەرچی دوو سم بێ وەكاوێژ بكا حلالە، ما عداي دي چی یەك سْمْ بـێ وەكاوێـژ نـەكا یـا كاوێـژي بكـا وە دووسـْمْ نـەبێ وەك حوشـتر كەروێشك یـادووسـْمْ بـێ وەكاوێـژي نـەكا وەك بـەراز لێیـان حرامـە. ﴿وَمَا عَلَّمْتُم مِّنَ ٱلْجَوَارِحِ﴾ نێـچیري حیواناتي راوي چ بەباڵ چ بـێ بـاڵ ﴿مُكَلِّبِينَ﴾ زۆر بـاش فێـرە ڕاوتـان كـردین یعني بە تعلیمێ كەم إكتفا ناكرێ ئەوانەي فێرەراویان ئەكەن ئەبێ زۆر مەلا بن لەو علمە ﴿تُعَلِّمُونَهُنَّ مِمَّا عَلَّمَكُمُ ٱللَّهُ﴾ لە طُرقي تعلیم وتأدیبي فێرى نیچیر گـرتن. خۆزي بمزانیبایە شێخی أشعري لە طریقي ئەو تعلیمي إلهي چی ئەلێ. وەحیە؟ إلهامە؟ خلقي علمي ضـروریة؟ كامیانـە؟ ﴿فَكُلُوا۟ مِمَّآ أَمْسَكْنَ عَلَيْكُمْ﴾ لـەوەي بـۆ ئێوەیان ڕاگرت بخۆن، ئەوەي لێیان خـواردبـي دیـارە بۆخۆیانـە مـەیخۆن. وە هیچ فرق ني یە لە بیني سباع و طیور بعضي فرقیان كردوە أمّا قولێ بێ وَجْهَە عجائبە لە ((مالك)) و ((لیثي)) نقل ئەكەن ئەگەر لێشی بخـوا ئـەخورێ. حتّـی روایەتیان لە ((سَلْماو)) ((سعدي إبن أبي وقاصُ)) و ((أبـو هُریـرە)) ي كردیـە.

ئەگەر کلب دوو بەشیشي بخواو ثلثیکي مابي بیخۆن. ئەمانە تفسیري ئەو آیەتە چۆن ئەکەنەوە یا ئەبێ بلێین مَنْسوخە، بلێم چی؟ إختلافیان رێی علمي لە ئێمە بەستوە، تەماشاي قیمەتي علم کەن لە نظري خوا نێچیري کلبي مُعَلَّمْ حلالە لەبەر علم. دەست کوژي مُشْرِك حرامە لەبەر جهل وەبزانن چ نوعە علمي لاي خوا مقبولە، معلوم أکثري ئەو علومی ئەوعلومي کە خۆمانی تیا ئەکوژي لاي خوا قیمەتي ني یە. ﴿وَٱذۡكُرُواْ ٱسۡمَ ٱللَّهِ عَلَيۡهِۖ﴾ لەسەر خواردني ناوي خوا بێنن زۆر موافقە پاك و خاوێنە جێی وەیە ناوي خواي لەسەر بێنن. ئەو معنایە مختاري (أبو حیّانە)) لام زۆر جوانە ئەگەر چی ((سیِّدی آلوسي)) ئەلێ دوورە.

یالە وەقتي تاڵي مثلاً بەرەلاّ ئەکەن ناوي خواّ بێنن ئێمە ئەوە إنکار ناکەین بابە حدیث اثبات ببێ. بعضيێ ئەڵێن ئەگەر بە نێچیرەکە گەیشتن حیاتي تێ مابو ناوي خواي لەسەر بێنن تذکیەي بکەن. لاي من ئەوە لە عبارەتي قرآن زۆر دوورە ((سیِّدي آلوسی))یش بە قیلي داناوە ((تفصیلاتي لە تذکیە لازمە)) ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ﴾ لە مُحرماتي خاصە لە مسألەي صیدي مُكَلِّبْ ﴿إِنَّ ٱللَّهَ سَرِيعُ ٱلۡحِسَابِ ٤﴾ زۆر ئاگادارە کەم و زۆري لێ بزر ني یە. نازام بۆ چی ملائکة هەندە خۆیان لە سەگ ئەپارێزن وەخواي تعالانیش نێچیري ((سەگی)) لە ئێمە حلال کردوە. ئەگەر عرضي ((أبو رافع)) کەین جبریل وأمثالي جبریل ناچنە خانوێ کە (سەگی)) تیابێ یا هەموو ملائکة حتی کِرامُ الکاتبینیش کەوابێ مرحباً لە راو کەران هەرچی ئەي کەن ملائکة ئاگایان لێ ني یە. ئەبێ تەماشاي راویش نەکەن بەلێ أمري پێغەمبەری بە ((سەگ)) کوشتن بێ حکمەت ني یە.

ئیمرو بَشَرْ لەو دستورە زۆر خێر ئەبینێ خصوص ((سەگە)) گرەوەکاني بەرەلاّ کوشتنیان لازمە، ئەوانیش نجاتیان ئەبێ انسانیش دەردو بەلاي کەم ئەکا. نقل ئەکەن لە شاهي ((نقشبەند)) لە أوائلي مَعْنا مأمور بوو بە تداوي کردني سەگەکاني گرووو بریندار شەل ونەخۆش. ئەی فەرمو کە تیمارم ئەکردن ئەنوزانەوە دوعایان بۆم ئەکرد من هەر بەرەکەتەکي نائلي بووم لە

دوعاي ئەو سەگانەي ئەزانم. سبحان الله ئەمە حالي شاهي نقشبەند، ئێستا گەلێ لە أتباعەكاني لەسەگی گرد خراپ ترن. حاشا أتباعي ئەو نين بەڵكو ناوي ئەو زاتە محترمە بەناوە بَدل ئەكەن. خوا بيان كوژێ ئەو سەگانە لە كۆل مسڵمانان بكاتەوە. ﴿ٱلْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ﴾ عام لە حبوبات، لە محصنات، إنسان ئەگەرحِسياتي هەبێ لە زەماني منكوبي وذلةت لەدەست دوسمن هەرچی بيخوا وەلەو ٱلَّذي أطعمەبی لای ناخۆشە تالە گەروگيرە، كەسەر كەوت شتي ناخۆشيش لا خۆش ئەبێ. خۆش گوار، بەخۆشی بەگەروی دا دەچێتە خوار. ئەی مجاهديني ربّي نۆشی گيانتان بێ هەرچی پاك وخاوێنە بۆ ئێوە حَلال كرايە ربّي لێتان حَلال بێ وەك شيری دايكي خۆتان. واديێتە بەر حيسّي حقيرانم رَسولي أكرم كە ئەم ئايەتەی لە (مَشْعَرُ الحَرام) لەسەر سَوادي أعظمي مسڵمانان خوێندۆتەوە بە دەنگێكی بلند لە قَلبي قَوي وە بەنِشاط بە نوعێ كە لە كێوی كەژي عَرَفات دانگی دايتەوە وەدلي مسڵمان لە إستعمالي بانگی مُحمدي دڵيان وەك نقّارە خانەی طَرَب لێی داوە وەوەچە خۆشە دەنگی قائد لە پاش ظَفَر بە خوا لە گوێی شاكری ظفر أثر گەلێ لە عودو كەمان خۆشترە. ئەی واە مع الأسف ئەو دەنگە نەهاتە گوێی ئێمە لە أيامي نحوستي ئێمە بە غَيْري نوكە نوكی حُزْن، سەردولكەی ماتەم، شكستمان نەبيست. ﴿وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ حِلٌّ لَّكُمْ﴾ ج جو ج دييان لە عەرەب لە غَيری عەرەب إلاّ دييانی (بني تُغْلُب) إمامي علي فەرمويەتي ئەمانە لەسەر دييانی نين بەغَيْري شُربي خَمر چيتريان لێ دەرنەگرتوە. حبوبات بێ نِزاعە، نِزاع لە زبيحەيانە، نقل دەكەن لە (إبنُ عباس) مقصد لە طعام زبيحەيە، حبوبات جێی قسە نی يە.

(سَيّدي آلوسي) دەلێ أكثري مُفسرين لەسەر ئەو قسە نە كەوابي (عَشاي) ربّاني دييان لە ئێمە حَلال نيە، وەشرطي معقول دەريان كراوە وە لە إضافەی طَعام إستفادە دەكرێ طعامي أهلی كتاب بەو شرطە خۆيان لێ بخۆن لە ئێمەش حلاڵە، ئەگەر خۆيان لێی نەخۆن وەك حيواني (تَريفە) حەرامە. ظاهر

وایە ئەگەر بە ناوی (عزیز) یا (عیسی) ذبحي بكەن حَلال بیّ، أمّا لای (إبن عمر) حەرامە.

(حَسَني بَصْري) دەفەرمویّ ئەگەر گویّت لیّ بو ناوي غیری خوایان هیّنا مەیخۆ حەرامە، وەإلاّ مُبَاحە. أمّا مەیلی حَقیر لەسەر ئەوەیە مادام (أُهِلَّ لِغَيرِ الله) بی حرامە. عام تخصیص دەكریّ مطلق مُقَيَّد دەبیّ. كەسیّ تەماشای تفسیری (سیّد رشید) بكا لە إختلافي عُلمایان سەری سور دەمیّنیّ ﴿وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْ﴾ ئەو طعامەي لە ئیّوە حَلال كرا هەر لە ئەوەیە لەوان حَلال كراوە. جەنابي حَق طَيّبات لەكەس حەرام ناكا. جو ئەو هەموو شتە طَيّباتەیان لە خۆ حەرام كردیە بیّ مَعنایە، حتّا فازو قولینگ وبو قلمون. لاقیدي دییان لە (عیسی) وە نیە لە (بولُص)ە وەیە. أحكامي إلهي بی علّتو حكمە نابي لە مقتضاي حكمەتیەتي گۆشتي لە إنسان حلال كردوە. طبیعة ئەیەویّ ذاتاً كائنات یەكتر ئەخۆن بەشریعەت بەس بۆ تعدیلي طبیعەت حكمي هەیە. هەر دینی بالكُلّيّة لەسەر خلافي طبع دانریّ منهدم ئەبی. كەوابیّ كەس حَقّي إعتراضي لە شرائعي سماویة نی یە. سبحان الله ئەوەي بَشَرْ ئەي خوا لە حیوانات رۆژ بە رۆژ زیاد ئەكا. ئەوەی نای خوا زۆر كەمە ئەوە سرّي غریبە. یاخوت طعامي ئیّوە لەوان حَلاّلە. كەوابیّ ئەگەر إطعامیان كەن لە حبوبات بیان دەنیّ لە لحوم بۆ ئیّوە باسي نی یە. ئەوان ئەي خۆن یان نای خۆن سندانیان بیّ. ﴿وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الْمُؤْمِنَاتِ﴾ حُرّة یاعفیفة ولو جاریەش بیّ. مُحْصَناتي مُؤمنات ئیمرو حلال نەكراوە بەلاّم بۆ دفعي دَغدَغە ئەي فەرمویّ. زیرا قبائلي عَرَبْ عداوەتي زۆریان كەوتۆتە بەین مەبادا لەرویی كۆنە عداوەت تجنب لەیەك بكەن. ژن لەیەك نەخوازن. إعلامي إباحەي نكاحي مؤمنات كرا. پیّش دان محاربة بوبن. ﴿وَالْمُحْصَنَاتُ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ هەر ملەتي أهلي كتاب بوبیّ مُحصناتي وان لە ئیّوە حلالە ئیّوە غالبن رۆژي عطفە لەگەلّ مغلوب. بە أنواعي ملاطفە حتی بە مصاهرة تلطیفیان بكەن. ترستان لیّ

نەبن ئێوە قطعي صِلَه مەکەن. لاي حقیر مختار ئەوەیە ئەوي لە مبدأي وجود کە خوایە لێمان جوودا نەبوویێ ژن لێ خواستنیان جائزە. زێرا لە مبدأ من حیث الإعتقاد إتصالمان هەیە. أمّا ئەوەي لە مبدأ دا جودا بوویێ وصل لە بەینمان نابي. مصاهرە لەگەڵیان حَرامە. ئیمرۆکە رۆژي سیادەتي ژنانە وەعصري دینٍ و إیمانە لاي حقیر بۆ مسڵمان جوازي نـي یە لە غیرە دین ژن بخوازي. لاشَكّ ئەولا سەلامەتە.

﴿إِذَآ ءَاتَيۡتُمُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾ وەك ژنە مسڵمان سبحان الله خوا داني مَهري زۆر لا مهمه حتى عبارەتي وا ئەنوێنێ کە حلّي مُحْصَنات مشروط بێ بە إیتاي مَهْر. کەچي مسڵمانان أبداً أهمیەتي نادەنێ. ﴿مُحۡصِنِينَ﴾ بە نکاح خۆ لە قەلاّ((قلعة)) نێن خاوەني عِفّة بن. یاخوت إمانتان مُحْکَمْ کەن. ﴿غَيۡرَ مُسَٰفِحِينَ﴾ زنا کار مەبن ﴿وَلَا مُتَّخِذِيٓ أَخۡدَانٖۗ﴾ دۆست وبنازۆیان مەگرن. ئەی وابی... ! کەي؟ نێرو مێ ئەبنە دۆستي راستي بێ مَیْلي خیانەت. أحوالي بَشَرْ لە سایەي غربیان زۆر گۆڕاوە ئەبیني ژني قۆلي لە قۆلي دۆستي هەلکێشاوە وە مێردەکەشي بە دوایان دا ئەڕوا گەلێ مسرورو ممنونە، شرقیش گەلێ کەیفیان بەو نەوعە دۆستیە دێ. کەسێ تەماشاي جرائدو مجلات بکا ئەبیني لە رووي دۆستي چی فضائح ئەقەومێ. أمّا لاي مُنَّورو مدنیەکان هیچ عەیب وعاري تیا نی بە. حقیقە چۆن إنساني غیور وەبەناموس حەز ئەکا ژني تەنها بۆ خۆی بێ وەك کابراي خۆشناو بە ژني خۆي ئەگوت: فاتێ خۆزیا خۆزیا بەتەنێم ئی خۆ باي.

ژنیش حەز ئەکا پیاو بەتەنێ ئي خۆي بێ، هەردوولا عفیف بن چاو لەدەر نەبن ئەوسا بە سەلامەتي راي ئەبوێرن مقاصدي إزدواج بەجێ ئەگەینن ﴿وَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلۡإِيمَٰنِ﴾ مفسران تأویلي إیمان بە (مؤمَنٌ بـِهِ)، ئەکەنەوە یعني ئەوەي انکاری شرایع بکا وەقبولی نەکا ﴿فَقَدۡ حَبِطَ عَمَلُهُۥ﴾ من لام وایە حاجەت بە

تأویل وتقیدری مضاف نی یه، یعنی ربُّ الإیمان، کەسێ سَبَب به إیمان کافر بێ گۆیا إیمانیان هەیە به خواو به شَرایع أمّا إنقیاد ناکەن ئەوي خۆیان پەسندي بکەن، ئەوي ئەکەن، ئەوانە ئەوي ئەیکەن هَدَره هەبایە.

گەلێ کەس ایمانیان هەیە خوا (غَنّي عَنِ العالمینَه) ئەو ایمانە دەکاتە سَببي إنکاري گەلێ أحکام کە جەنابي حَق لە رووي لطفەوە اعتناي پێ کردیە آن زیادە بۆ ئەو أحکامەی عائدي ژن ومێردایەتي بێت انکاری دەکەن دەلێن لاي خوا ني یە. زۆر کُفریان هاتیتە ناو اعتقادیاتي إسلام. کەسێ ایماني بە ونوعە کُفریاتە نەبێ، لایان مسلّمان ني یە. ﴿وَهُوَ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٥﴾ وەك مازي کەري کون لە پاشۆلي لە سبەي تا ئێوارێ مازي ئەکا ئەي هاوێتە پاشولي لێی ئەکەوێ ئاگاي لێ ني یە. ئێوارە صِفرُ الید دێتەوە مالێ ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ لایخفی ئەو رۆژە کە أمر کرا بە توجە بۆ مسجد الحرام مقصود ئەمرۆ بوو. بۆیێ لەوێ باسي دەست نوێژی نەکرد. ئەي إیمان دارینەگەیشتنە مرام کعبەتان پاك کردەوە لە أصنام، طعامي پاکتان لي حلال بوو. ﴿إِذَا قُمۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ﴾ لەخەو بە خَبَرْ هاتن وەك إمامي شافعي ئەفەرموێ: یا کەبێ دەست نوێژ بوون، وەك لە شرطي تیمم بەدەر ئەکەوێ، کەوابێ حاجة ني یە بلێن دەست نوێژ بۆ هەموو نوێژ لە صدري إسلامەتي واجب بوو دوایي نَسْخ کرا إلاّ بۆ بێ دەست نوێژ. کە هەستان بۆ نوێژ کردن ﴿فَٱغۡسِلُواْ وُجُوهَكُمۡ﴾ رووي خۆتان بشۆن ﴿وَأَيۡدِيَكُمۡ إِلَى ٱلۡمَرَافِقِ﴾ تا ئانیشك. ئانیشك بالضرورة ئەبێ بشۆرێ وەك بعضێ لەسەر بۆ دەم وچاو ﴿وَٱمۡسَحُواْ بِرُءُوسِكُمۡ﴾ دەست بەسەري خۆتان دا بێنن ﴿وَأَرۡجُلَكُمۡ﴾ لاقتان بشۆن ﴿إِلَى ٱلۡكَعۡبَيۡنِۚ﴾ تاهەردوو قاپان بەپاك و خاوێنی ڕوو بکەنە کعبە دەست ودوولاقتان لە غباري شەر بشۆن، لە خوێنی أعداء دەستي خۆتان پاك کەنەوە، بەسەري خاوێن بێ إغبراري ذِلّة نوێژ بکەن، سەري أفتخار بۆ خوا

لەسەر عەردیٚ دانێن . لله ألحمد دەست ولاقتـان کرایـەوە ... گوشـاد بـوون، سەرتان له غوائلي دوشمن سووك بوو، بـه پـاك و پـاکیزەیـي روو کەنـه خـواي مُنَزّه و مقدس. ﴿وَإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُواْ﴾ به إحتلام بەوطأ ئەگـەر لـەش پـیس بوون خۆتان بشۆن لاشك له إفراغي مادە عمومي بەدەن دێته هـەژان، قـوەتـي زۆر صرف ئەکا بۆ إعادەي قوەتی تنـشیطي دەمـارو عـروق غـسلي بـەدەن بـه غایه نافعه. ئەوانەي ئەڵێن ئەو کاره بیٚ جیٚ ئـەکریٚ، باهـەر ئـەو بشۆریٚ، زۆر دوورن لـه حکمـەت. ﴿وَإِن كُنتُم مَّرْضَىٰٓ أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ أَوْ جَآءَ أَحَدٌ مِّنكُم مِّنَ ٱلْغَآئِطِ أَوْ لَٰمَسْتُمُ ٱلنِّسَآءَ﴾ پێستان به پێستی ژنانـي نـامحرم کـەوت تفسیر بـەوطأ بـیٚ معنایـه لەبــەر ((وإنْ كُنــتُمْ جُنُبــاً)) ﴿فَلَمْ تَجِدُواْ مَآءً﴾ چـەنگتان نەکــەوت ﴿فَتَيَمَّمُواْ صَعِيدًا طَيِّبًا﴾ تفــسیري تــیٚ پــەري ﴿فَٱمْسَحُواْ بِوُجُوهِكُمْ﴾ خفیف دەستي پیٚ دا بێنن ﴿وَأَيْدِيكُم﴾ الى المرافق باتـا جُمکـه ﴿مِّنْهُ﴾ لـه خۆرەکه ئەبیٚ شتێکی پێوه بنوسیٚ، ئەگەر چی (سیّد رشید) له سورەي نـساء پێی رازي ني یه ﴿مَا يُرِيدُ ٱللَّهُ لِيَجْعَلَ عَلَيْكُم مِّنْ حَرَجٍ﴾ ذاتاً خوا حـەز له مضایقة ناکا.

جوو ((جوولەکە)) خەتاي خۆیان بوو، واقعـاً مـسڵمانیش شـرعیان زۆرگـران کردیه، خصوص شعوب ومذاهب، بۆ ((إنسانیٚ عمریٚ درێژ لازمه، تائـەی زانـیٚ، ئەوجا کەي عَمَلـي پـیٚ ئـەکا؟ ﴿وَلَٰكِن يُرِيدُ لِيُطَهِّرَكُمْ﴾ ظـاهرو بـاطن پاکتـان بکا، طَیِّب وطاهرین، فائدەي دەست نوێژو خۆ شوشتن عائدي خۆتانه بۆ حفظ الصحّەیه، حفظُ الصحّه ش بۆ أمتّي وەکی ئێوە زۆر لازمه، لـه مقـامـي حفظـي نفس دایه. مُعْظمي أمراضـي بـشري لـه پـیـسی وچـلکینه شـته. پێشی حـربـي عمومي سفیري فرنسەي ((موصل)) چو بۆوە پاریس لەویٚ مقالەکي نشر کردبو خطاب بۆ عمومي أوروپا ((ئێوه بۆ تقـسیمي ممـالیکـي عثمـاني شـەر مەکـەن، نفس ومال به بـضائع مـەدەن، چـونکه سـیٚ چـشت لـەناو وان هەیـه هـەر یـەك

لەوانە کافیە بۆ إنقراضي عاجل، فقر، عداوەتي خۆبەخۆیي، أنواعي نەساغي. پاش چەند سالیّ ئەوانە منقرض ئەبن. ئەوجا بیّ شەرو دەعوا میراتیان تقسیم کەن)). ﴿وَلِيُتِمَّ نِعۡمَتَهُۥ عَلَيۡكُمۡ﴾ بەوەندە فتوحاتە راضي ني یە بۆتان زیاتر ئەکا ئەوەش لە قضا ئەخوازیّ دینیّ بە سماحەتتان بۆ داني، نەك بە إجراي ئاییني مشغول بن، چتان وپیّ نەکریّ و﴿لَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ٦﴾ خودا بەدینی گران مشغولي نەکردین، دیني پاك وخفیف وەك روح خفَّة کەواتە بەدەن بە نشاط وحرکەي ئەخات. ﴿وَٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ﴾ لەبیری مەکەن لە حالیّ هینابنە چی حالي، دینێکی دانیّ چ دینێ..! کەپێی بوینە سیّدي دنیا وآخرەت ﴿وَمِيثَٰقَهُ ٱلَّذِي وَاثَقَكُم بِهِۦٓ﴾ بدأي لە آخري سورەي بقرە تیّ پەري ﴿إِذۡ قُلۡتُمۡ سَمِعۡنَا وَأَطَعۡنَاۖ﴾ دائماً تذکاري بکەن بەتەواوي (غُفرانكَ ربّنا وإليكَ المصير) إلى سەري ئەم سورەتە. إطاعەي أمري خواو پێغەمبەرو أولوا الأمر بکەن، رابطەي إتحاد تێك مەدەن.

ناشُکري نەبیّ وا پسا جاریّ تر گریّ نادرێتەوە ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ﴾ أول وآخر ظاهر وباطن، سرّو عَلَنُ خۆ بپارێزن لە خوا بترسن خاصّة لە إعتقادیات ئاگادار بن بە إیمان توشي کفر نەبەن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمُۢ بِذَاتِ ٱلصُّدُورِ ٧﴾ ما في الضمیر لەو بزر نابیّ کەسیّ بە دقّة بنواریّ ئەزاني ذکري دەست نوێژ چەند لەو مقامە چەند منتظم وجوانە. نوێژ لە أوائلي إسلامیەت واجب بوو، دەست نوێژ ئەشۆرا نێزیکە بلێین ئەو آیەتە زۆر پێش تر نازل بوویێ، أمّا مناسبە هەلي گرت بۆ ئێرەو جملەي ((إذ قلتم سمعنا وأطعنا)) ئەو سورەتانە چۆن پێك ئەچەسپێنیّ سبحان الله چی ناظمیکە..! ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ بەراستی نەهەر بەعنوان ﴿كُونُواْ قَوَّٰمِينَ لِلَّهِ﴾ زۆر قیام کەن بە بەجیّ هێناني حقوقي خوا حقّي لەسەر ئێوە زۆرە، ﴿شُهَدَآءَ بِٱلۡقِسۡطِۖ﴾ شاهدي بە حقّ وعدل بن، أولا

لەسەر وحدانيەتي إلهي ﴿شهِدَ اللهُ أنه لا إله إلا هو﴾. الآية ثانياً لەسەر حقيّەتي رسالەتي حضرتي محمدي، ثالثاً لەسەر حقوقي عباد هەركي بادا باد. ﴿وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَـَٔانُ قَوْمٍ﴾ شدّتي رقي ئێوە لەوان يانەوان لە ئێوە ﴿عَلَىٰٓ أَلَّا تَعْدِلُوا۟﴾ ئەو عداوەتە حملي ئێوە ئەكاتە سەر ناعەدالەتي ﴿ٱعْدِلُوا۟﴾ ئەي ايمان دارينە دەربارەي دۆست ودوژمن خوێش بێگانە دەولەمەندو فقير ﴿هُوَ﴾ عدلي مفهوم ﴿أَقْرَبُ لِلتَّقْوَىٰ﴾ عدالەت لە هەمو شت نێزيك ترە لە تقواو خوا پەرستي زێرا عدالەت وەسەطە لە بيني إفراط وتفريط ناوەند لە هەردو لاي خراب دوورە، حتى عدالەت لە إيمانيش لازمە، كەسێ إفراط كا لە إيمان توشي كفرو جهالەت ئەبێ، توشي إنكاري بديهيات ومشاهدات ئەبێ، حَقْ ئەكاتە تابعي فكري خۆى، نابێتە تابعي حق، حتى ((إفراطي في الإيمان)) رابطهي موجوداتي لە بعضە كەس تێك داوە، ئەڵێن أرتباط لە بيني هيچ كائنات دانيە. ﴿وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ﴾ كوو جنابي حق، حقي أدنى كەسێكى بۆ حبيبي أكرمي خۆى ضائع ناكا، ئێوەش حقى كەس ضائع مەكەن، خواي تعالان ربّ العالمينە پەرهێزكاري ئەو بكەن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ خَبِيرٌۢ بِمَا تَعْمَلُونَ ۝٨﴾ سِرّو عَلَنْ ﴿وَعَدَ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّـٰلِحَـٰتِ﴾ چاكە بە گوێرەى وخت بگونجێ وەمناسبي حالي عاملەكە بێ، گەلێ دەولەمەند هەند لە أيامي ئيمە كتكي (أبا هريره) نمەكيان ناكا شەوو رۆژي دە هەزار صلواة لێ ئەدەن، ئەبێ خوا بە وەعدەي بەجێ دابنێ..؟ ﴿لَهُم مَّغْفِرَةٌ وَأَجْرٌ عَظِيمٌ ۝٩﴾ كافيە أجرێ كە خوا بفەرموێ عظيمە ﴿وَٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَكَذَّبُوا۟ بِـَٔايَـٰتِنَآ﴾ كُفري بالله وبالرسل سەر چەشمەي هەمو سيّئاتە، ياخوت هەر سيّئاتێ ببێ نَظَرْ بە كُفرْ لا شَيْء شاياني ذكر ني يە ﴿أُو۟لَـٰٓئِكَ أَصْحَـٰبُ ٱلْجَحِيمِ ۝١٠﴾ خۆيان صاحبن، حاجەت بە وعد وعيد ني يە ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ چەند

خۆشەو ئەو ندایانە لە گوێشي هۆشي أهلي إیمان ﴿ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ﴾ لاي أهلي مروەت تذكاري نیعمەتی منعم خصوص حفظ لە دوژمن لە وَجانِبَە، وەتذكاري كُلّي جار سروریٚ زۆر عظیم ئەداتە إنسان ﴿إِذۡ هَمَّ قَوۡمٌ﴾ أمّا چی قوم، قومي جەنگیٚ مستعد بۆ غَلَبە. ﴿أَن يَبۡسُطُوٓاْ إِلَيۡكُمۡ أَيۡدِيَهُمۡ﴾ دەستی تطاول و قتال بۆ ئێوە دریٚژ كەن ﴿فَكَفَّ أَيۡدِيَهُمۡ عَنكُمۡۖ﴾ ظاهر وەیە ئەو قەومە، ئەو قەومن كە إعلانی حیادیان كرد، معاونەي هەم دیني خۆیانیان نەكرد، ئەوەش لە ترس نەبو، بەڵكو شتي بو لە طرفي خواهاتە دڵیان وایان بۆ شیرن بو، كە مداخلەي هیچ لاییٚ نەكەن. أما ئەوەي لە سببي نزولي نەڵێن كە حضرتي رسول چووە نەدیویٚ شیري بەداریٚ هەلاوسي ((غوث بن حارث)) چوو بە دزی شیرەكەي هێنایە خوار هەلي كێشا چوە سەر پێغەمبەر، گوتي ((كیٚ حفظت ئەكا لە من؟)) پێغەمبەر فەرموي ((ألله)) كابرا لەرزي ولەغزي و كەوت، پێغەمبەر شیرەكەي لەسەر ڕاگرت وفەموي ((من يَمْنَعُكَ مِنّي)) كابرا طلبي عفوي كرد، هیچ مطابقەي لەگەڵ عبارەتي قرآني نی یە، ئەگەر چی حفظي رسولي أكرم لاي إیمان داران لە فوقي هەموو نعمەتانە، حاصلي رُوّاتي أسباب نزول چەرتەمیان زۆرە ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَۚ﴾ لەهەموو أوقات ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَلۡيَتَوَكَّلِ ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ١١﴾ هەرئەوە ئەوەي لە عُهدەي وانە بۆیان بەیان ئەفرمویٚ إیقاظیان ئەكا ڕیٚی غەفلەت وغروریان نادا، ئەوي عائدي خۆی بیٚ بۆیان ئەكا، ولی گەلیٚ دوشمنیان لە حق نەرم ئەكا. ئەو هەمو ئیشە باشانە كیٚ بۆیان ڕێك ئەخا غیری خوا؟ لاشك أصحابی گزین معنابي توكلي على الله یان بە تەواوي زانادوە، نەوەك أخلاق خاصە بعضي أهلي تَصَوُّف بۆیە دائماً بەر حَذَرْ بوون بعد إكمالِ العَدَدِ والعُدَدِ دڵیان بەخوا مربوط بو. أمّا ئێمە پال ئەدەینەوە سعي وكۆشش ناكەین ئەڵێن متوكلي على الله ین، حاشا حاشا ئەمە توكل نی یە، سستیە تەنبەڵیە، ((أصحاب)) صلاة الخوفیان لە فكر نەچوە،

((خُذُوا حذرَكُمْ ولا تَغْفلُوا عن أسلحتكم))یان دائما لەیادە. ﴿وَلَقَدْ أَخَذَ ٱللَّهُ مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ﴾ کە عمل بە أمري خوا بکەن وە لە إطاعەي رسولي خۆيان بن بەو جۆرە کە پەیمانمان لە ئێوە وەرگرتیە ﴿وَبَعَثْنَا مِنْهُمُ﴾ هەناردومان لە خۆیان بۆ خۆیان ﴿ٱثْنَيْ عَشَرَ نَقِيبًا﴾ هەر سبْطي نقيبيَ رئيسێ تەماشاي أموریان بکات، دائم لە تفتيشي أحواليان دابێ ئێوەش ئەوا دوري خلافەت وملك وسلطنە تان نزيك بووە هەر عشيرەتە و رأيسێکی هەیە ﴿وَقَالَ ٱللَّهُ﴾ بەواسطهي رسول ﴿إِنِّي مَعَكُمْۖ﴾ من لەگەلّ ئێوەم ئاگادارتانم ﴿لَئِنْ أَقَمْتُمُ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ کە رابطەیە لە بەینی عَبْد وخوا بۆ دەوامي حضوري خدمەت خوا داندراوە ﴿وَءَاتَيْتُمُ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ لە زکات دانە بۆ أهلي إستحقاق چاکتر نی یە، فقرو تسأُل وەرەزالەت لەبەینی أُمّەت ناهێلێ، ئەویش رابطەیەکی زۆر بە قووەتە لە بەینی ملّەت.

﴿وَءَامَنتُم بِرُسُلِي﴾ هەر کەسێکی ببێ، إسرائيل ی یا غیرە إسرائیلی ﴿وَعَزَّرْتُمُوهُمْ﴾ نصرەتیان بدەن لەگەلّ تعظيم شەرەفي مَقامي نبوّەت محافظة بکەن. رزائلي کە مناسبەی نەبێ لەگەلّ نبوەت نسبەتیان پێ نەدەن. خاصّە شتێکی عائدي عَرض وناموس بێ.

حقاً بَني إسرائيلي نە حفظي مقامي ألوهيەتیان کرد نە حِفظي مَقامي نبوّەت أُمّەتی ئێمەش ألآن زۆر دوور نین لەوان ﴿وَأَقْرَضْتُمُ ٱللَّهَ قَرْضًا حَسَنًا﴾ زیاد لە زەکات ئەوي لازم بێ بۆإعتلای شأني ملّت وأُمّت، بۆ إستحصالي مال صَرف بکەن بیدەنە خوا بە قَرضي حَسَنە، ئەگەر ئەمانە بەجێ بێ نێن ﴿لَّأُكَفِّرَنَّ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ﴾ أثري گوناهاني سابقە لە نفوسي ئێوە ناهێلین، یائەگەر وردە وردە بعضە ئیشێ نابەجێش بکەن، لێتان خۆش ئەبین. ﴿وَلَأُدْخِلَنَّكُمْ

جَنَّٰتٍ تَجۡرِي مِن تَحۡتِهَا ٱلۡأَنۡهَٰرُۚ﴾ لە دونیا وە لە قیامەت ﴿فَمَن كَفَرَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ﴾ پاش ئەو عەهد وپەیمانە ﴿مِنكُمۡ فَقَدۡ ضَلَّ سَوَآءَ ٱلسَّبِيلِ ١٢﴾ رێی راستی گوم کردوە، ئەوي جادەي بێ پێچوکەو خوارەکە بزر بکا لە کۆچەو دەربونان رێی دەرناکا. ﴿فَبِمَا نَقۡضِهِم مِّيثَٰقَهُمۡ﴾ هەلیان وەشاند پارچە پارچەیان کرد بۆیە ﴿لَعَنَّٰهُمۡ﴾ لە نَصرەت ورەحمەت دوورمان کردن ﴿وَجَعَلۡنَا قُلُوبَهُمۡ قَٰسِيَةٗۖ﴾ رەق وەك بەرد بەڵکو لەبەرد رەق تر. أمّا لە پاش ئەو هەمو مُجارات ومُداراتە کە خوا لە گەڵی کردن، نەك خوا لە أوَّلي دڵی رەق کردن بۆیە وایان کرد، وایان بەسەر هات. تَفصیلي لە سورەي (بَقَرە) زاندرا.

﴿يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ عَن مَّوَاضِعِهِۦ﴾ کلامي إلاهي لە موضوع لە خۆی لائەدەن، چۆلي ئارەزویان کرد لەگەڵ غرضي خۆیان بێ زیادە یانقص یاتَقدیم وتأخیر تا تأویلي پروپووچ رێکی ئەخەن ﴿وَنَسُواْ حَظّٗا مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦۚ﴾ بێ لەوە کەکتابي أصلیان نەما، بەشێ گەورەیان لەوەي کە پێی وَعظ ئەدران لە فکریان کرد، أزجملە ئەو میثاقەیە کە تازە بەیان کرا. ایمانیان لە حەق خوا صحیح نیە، بەگەڵێ پێغەمبەر کافرن، جِهە تي اتحادیان نەمێشت ﴿وَلَا تَزَالُ تَطَّلِعُ عَلَىٰ خَآئِنَةٖ مِّنۡهُمۡ﴾ قومێ خائِنن بە غش پاك نابنەوە، تۆ خەبردار ئەبي بەسەر خیانَتي وان جوستە جوستە بۆت ئاشکرا ئەبێت ﴿إِلَّا قَلِيلٗا مِّنۡهُمۡۖ﴾ یعني أكثریان خائِنن کەمێکیان هەن بە صادقي مسڵمان بوون وەکو (عبد الله بن سلام) رەضاي خواي لێ بێ، وەبعضەکیان مسڵمان بوون وەکو (کَعبُ الأحبار) و (وَهب بن مُنَبِّە) خالي نەبوون لە خیانەت، لەگەڵ مسڵمانان خیانەتي وان خراپتر بو لە خیانەتي ئەواني مسڵمان نەبون. خرافاتي إسرائیلیان هێنا ناو إسلام لەبەر حسني ظَن لێ یان قبول کردن، گەلێکیان بَعد عَصرِ بوونە حدیث

﴿فَٱعۡفُ عَنۡهُمۡ﴾ عفو (عِندَ الأقتدار)ە. ئەمڕۆ ﴿وَٱصۡفَحۡۚ﴾ إعراضیان لێ نێ وخیاناتي مَخفیە، تجاوزیان لێ بکە ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿١٣﴾﴾ عفو إعراض لەو خائنانە احسانێ گەورەیە لە حەقیان. لە زەمانی رسالەت تا ئەمڕۆ باوجودي مسڵمانان لە حەقیان زۆر بە لُطف بوین، لە خیانەت خالي نەبوین، باز مسڵمانان مُسامحەیان کردوە، ئەو حَقارەتي کوشتن وبریني سائري أُمم بە جوانی کردوە، مسڵمانان پێ یان نەکردینە. ﴿وَمِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَٰرَىٰٓ﴾ لە وانیش ﴿أَخَذۡنَا مِيثَٰقَهُمۡ﴾ ئەوان لاي خۆیان أُمەتی رَسولي سَلامن یاخود عِبادُ الله مُسلمن، بەو گوێرە میثاقیان لێ وەرگیرا ﴿فَنَسُواْ﴾ ئەوانیش وەك جووان لە فکریان کرد ﴿حَظّٗا﴾ أمّا چ حَظّێ؟ نَصیبي زۆر گەورە ﴿مِّمَّا ذُكِّرُواْ بِهِۦ﴾ خاصَّةً تذکیر بە حالي (یهود) مع هذا ئەوان لە جووان خراپتربون لە ئاشوب وفتنە ئەنگێزی سبقیەتیان کرد ﴿فَأَغۡرَيۡنَا بَيۡنَهُمُ ٱلۡعَدَاوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ﴾ دوژمنایەتي ورقمان هاویشتە بەین، پێمانەوە نوساند، وەك سەی بەسەیەوە ئەنێن، وەی دیان لێ ئەکەن چەپڵەیان بۆ لێ ئەدەن تا بەگژ یەکا بچن ﴿وَسَوۡفَ يُنَبِّئُهُمُ ٱللَّهُ بِمَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ ﴿١٤﴾﴾ مقصد لە بەیانی حالي طائفەتین عِظە واعتبار بۆ مسڵمانان.

ئەو عهد ومیثاقەی خوا لەگەڵێ کردبون، تێکی نەدەن. إعتقادیان دەربارەي خوا پاك بێ تَعظیم وتَوقیری (رَسولي أکرم) بکەن. لە أمر وإطاعەی دابن نگەدار بن بۆ محافظەی رابطەی أُخُوەت، لە مکایدي دوژمن غافل نەبن.

مع الأسف ئەوانیش تێکیان دا، هەندە نەچو پاشي وەفاتي پێغەمبەر دەستیان دا شمشیر چەند مەیدانی کارزانیان لە خوێني یەك سوور کرد، تفرقەیان بوولە إعتقادیات لە عبادات لە تدبیری مُلك وسیاسەت، چەند خلافەت

ومَلَكيه تيان تَشكيل كرد، لەبەر شەڕو شۆڕي خۆيان هەموو مُنقَرِضْ بوون، تادەولەتي عثماني پێ گەيشت، إسلام قوەتێكى بوو، ئەوانيش لەگەڵ حكومەتى إيران تێك گيرسان دەوامي حَربيان بو، هەردوو لايان سست بوون. ئەوروپاي قوەتيان ساند وردە وردە بە تجارەت بە دۆستى بە (رقص) وبە (دانس) بە كارخانەچيەتي بەشەر بە طوپ وطيّارە، لەهەموو جوانب بەسەر موسڵمانان غالب بوون. تا حَربي عمومي بە جارێك وەحدەتى إسلاميان تێك دا، بۆ إغواء مُبشّريان بلاّو كردەوە تا موسڵمانان وەرگێرن بيانكەنە دييان. بە تَحريكاتي وان چەند كەس وەك باب وقاديانى (هِندي) وە بَهاي (إيراني) هەڵستانە سەر پێ دەعواي رِساله تيان كرد، ئاڵان بە كمالي حريەت دەعوەتي موسڵمانان ئەكەن بۆ إيمان بەو جڕو جاموشتانە. موسڵمان بێ صاحب، إسلامەتى بێ كەسە. بعضە مەلايێ وەك (سيِّد رشيد) وأمثالي وي ببنە كەس بە جواب ناێ. حاصلي إسلامەتي چ ڕۆژي واي نەديوە، دوست ودوژمنى لێى بوو بە دوژمن. ئاڵان كان كما كان، مەلا خەريكي نزاعي (معتزلي) يانن، (جعفري) لەسەر ماتەم وزيارەتي (إمامانن)ە، فاك وفيكى شێخ وأولياىيان لەوێ ڕاوەستێ، شێخ قطبە مُدبّري عالەمە لەگەڵ دەوراتي كائنات تێكەڵە هيچ شت بێ أمر وإرادەي وي حركەيك ناكا. خودا ئەگەر ڕەحمێك نەكات زۆر ناچێ بەجارێ ديني إسلام مەحو دەبێ (نَعوذ بالله تعالى).

﴿ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ جوو وەدييان سائري أهلي كتابي سماوي ﴿قَدۡ جَآءَكُمۡ رَسُولُنَا ﴾ زاتێ كە حەقي شايانە خوا بفەرموێ رسولي ئێمە ﴿يُبَيِّنُ لَكُمۡ كَثِيرٗا مِّمَّا كُنتُمۡ تُخۡفُونَ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ ﴾ دەليل لەوەي ئاشكرا تر نيە، بعضێ أحكام كەمتداوەلە بلێين لە ألسنەي عَوامي زانيوتي. ئەدي ئەو أحكامە زۆرەي كە خۆتان بزري ئەكەن لە كێى بيستوە؟ ديارە صرف بە وەحي إلاهيە، من ئەوەم لە هەمو أخباري غَيب عَجايب ترە

کەسێ ناشارەزا بفەرموێ لە فلان مَذْهَبْ ئـەو حکمە وایـە، مـع أنـه لـە أكثـري علماي مَذْهَبْ بزرە. في الحقیقة ئەوە هیچ شائبه هەلناگرێ.

﴿وَيَعْفُواْ عَن كَثِيرٍۚ﴾ گـەلێك شـتیش هەیـە إظهـاري ناكـا چـونكی إیجاب نابینێ ئەوەندەي إظهار ئەفەرموێ کە خـەلکي بـزانن ئێـوەچ جانگـەکن، مەبادا خەلکي پێتان هەلخەلـەتێ بلـێن ألبتّـە خـۆاري نیە ئەوانـە ایمـاني پـێ نایـەنن. ﴿قَدْ جَآءَكُم مِّنَ ٱللَّهِ نُورٌ﴾ كاشـف الحقـایق مُظهـر الخفایـا نەتەنها یدی بیضایە. سەراپا نوورە رووناکـي رێـی راسـتە. دەك لـە هـەردووك چـاوان کـۆر بـن ئەگـەر بـە إتبـاعي ئـەو نـوورە رێ دەرنەکـەن ﴿وَكِتَٰبٌ مُّبِينٌ ١٥﴾ قرآنــــي كــــریم کتـــێبێ وا ﴿يَهْدِي بِهِ ٱللَّهُ مَنِ ٱتَّبَعَ رِضْوَٰنَهُۥ﴾ ئەوی تابعي رەضامەندي خوا بێ ایمان نەکاتە قەومیەت وتعصبي جاهلیەت بەلکو مَقصَدي خوا بێت، ئەوانە بالطبع لە هەر کوێێ نوورێکیان چاوو پـێ کـەوت دوای ئەکـەون. خـوداي تعـالان بـەو كتێبـە ئـەوان هدایـەت دەدا. ﴿سُبُلَ ٱلسَّلَٰمِ﴾ ســـەلامێ تـــەمام، راســـت، بـــێ سیاســـەت و درۆ. ﴿وَيُخْرِجُهُم مِّنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ﴾ لە تاریکي جهالەت وعبادەتي طَواغیت بۆ لاي ئەو نوورە باهِرە دەریان دێنێ کـەوابێ لـەو نـوورە بـاز مقـصد هادي سُبُل خاتمُ الرُسّله. ﴿بِإِذْنِهِۦ﴾ زاتاً ئەو نـوورەي بۆیـە نـاردە کـە إتبـاع بکرێ، ئەوی بۆ لاي ئەو نوورە بچێ بۆ جهنّتي خوا دەچێ. ﴿وَيَهْدِيهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ١٦﴾ رێـی راسـت بـۆ مقاصـدي دیـني ودنیـوي ﴿لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَۚ﴾ سـوادي أعظـم لـە نَصارى ئەلێن عیسی خوایە خوا عیسایە یعني یەك شَخصە عیساش پێ ئـەلێن وەخواشي پێ ئەلێن، نەك دووي مُتّحدن تـا بلـێین ئـەوە لازمـي مَذْهَبـە، أبایـە

(زَمَخْشَري) و (فخري رازي) و (بيضاوي) وثوقيان به قرآن زياترىيايه ﴿قُلْ فَمَن يَمْلِكُ مِنَ ٱللَّهِ شَيْـًٔا﴾ کێ مالکي شتێ ئەبێ له جِهه ت خـواوه؟ ئايا کـەس ئەتوانێ معارضەو مقابلەي بکا؟ مَنعي قُدْرَتي إرادەي کبريائـي بکـا ﴿إِنْ أَرَادَ أَن يُهْلِكَ ٱلْمَسِيحَ ٱبْنَ مَرْيَمَ﴾ که ئەڵێن خوايە. ﴿وَأُمَّهُۥ﴾ ئەڵێن (أُمُّ الرَّبه).

﴿وَمَن فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًاۗ﴾ حتَّا (پاپی) حضرتلري. نـه (عيسى) مانـەوه داكي. وَمَنْ فِي الأرضيش. چين به چـين ئـەرواو موحـو ونـابود ئـەبێ. (عيـسى) (وەکـو خۆيـان ئـەڵێن) بـەنووره نـوورد وگـرين وزاري هـاوار هـاوار لـەدار درا نەلاهوت بەکەلکي هات نەناسوت. ئەوکلّي له لاهەت وناسوت، مەلاو صـۆفيانـي ئێمەش بەدەميانەوه گرتوه ئەڵێن (عيسى) له قَبر نرا خۆڵ وبەردي بەسەرکرا، زيندوبۆوه هاتەدەر له قَبرو چو بۆ ئاسمانان و له تەنيشت باوکي دانيشتوه. به خوداي لايزال (عيسى) نەبێ (جبريل) بـێ بمـرێ وبيخەنـه نـاو قَـبر تـا قيامـەت نايەتەدەر. بەڵێ له پەنارا (ملیون) رێی درۆيان بۆ واسعه، أمّا لـه شـتي بـەرەو مەيدان ناتوانن قسان بکەن. بعضه کفرێ هەيه تـۆزێ معقولـه، أمّا ئـەو نَوعـه کُفـره حقـاً کُفـري کەرانەيـه. ﴿وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَاۚ﴾ به خلق وإيجاد به تدبيرو تَصَرُّف عائدي ئـەوه. ئـەم أرضو ئاسمـان ومابينهُما ما فيهما به (عيسى) خلـق دەکـري؟ ئـەی بەرِيـشت لەگـەڵ ئيـشت! خۆی ذەررەيەکه لـه ذەرراتـي عالـەم، مقابـل بـەو ملـك وملکوتـه عَظيمـه هـيچ نانوێنێ. ئەو طبيعەته جبّاره عاصيه ئەو قوەتي قهّاره که له کائنـات دا هەيـه بۆ خوداي (واجب الوجوب) عليم وقدير نەبێ، رام نابێ. ﴿يَخْلُقُ مَا يَشَآءُۚ﴾ چۆن إراده بکا له خالقي ناکەوێ. تفويضي خلـق وإيجـاد بـۆ کـەس ناکـا. کـەس لـه شئوني إلاهي شرکەتي نابێ غير ممکنه. گـەلێ مـەلاي گـەورە گـەورە لـه ئێمـه ئەڵێن به تَبَعيه تي صۆفيان خواي تعالان تفويضي أمري ((كُنْ فَكانَ)) ئەکاتـه

بَعضی أصفیای خۆی . وای لەو کفرە عَظیمە وا ئەزانن خوا بە لفظ إیجادی أشیا ئەکات، ئەوە أمری تکوینیە توجیهی قُدرەت وإرادەیە، ئەو شأنە شأنی خوایە نادرێ بە کەس محالە. خوا لەسەر خۆی وشئونی ذاتی خۆی قُدرقتی نیە. شرطی مقدور إمکانە. (مِلیَون) بە شمولی قدرەت حکم لەسەر ذات وذاتیاتی خوا ئەکەن، ئەوەش نەوعێکە لە کفری بالإیمان.

﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ﴾ کە ممکن بێ، با بەنظر عقل دوور بێ، هەرچی بێ. أهلی علم فرق لە بەینی مُستحیل ومُستبعَد دەکات ﴿قَدِيرٞ ١٧﴾ أمّا ئەوەی محال بێ مقدور نیە. کەسێ تَجویزی مُحالی بکا، هَدمی هەمو أدیانی إلاهی ئەکات. ئەگەر محال جائز بیت، إثباتی صانعمان پێ ناکرێ. چ قەیدیە با ئەو عالەمە بێ صانع بووبێ، ئەوسا نە ألوهیەت دەمێنێ نە نبوەت. نە (أب) نە (إبن) نە (روحُ القُدس) نە (أُم الألە) گشتی بای لێ ئەدات. بەلام طَوری (مَسیحیونان) و (صوفیونان) ورای طوری عقولە. ئەی خاك بە دەمەنیان ئەگەر بچین بۆ طَوری وَرای طَوری عقول ئەم باس وخواسە هیچ نامێنێ. ﴿وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ وَٱلنَّصَٰرَىٰ نَحۡنُ أَبۡنَٰٓؤُاْ ٱللَّهِ وَأَحِبَّٰٓؤُهُۥۚ﴾ خودا مبارکی نەکا لەو أبنایە نا خَلَفانە لەو أحبّایە منافقانە قەدرو قیمەتی ألوهیەتیان نەهێشت، خوایان کرد مُسَخَّرو تابعی هەوای خۆیان. وەقتێ جَلالی کبریائی بە نوعێ بە طلبی رؤیەتیان ئەکرد صاعقە ئەی گرتن. (موسی) لەپ ورپوو بێ هۆش ئەکەوت. وردە وردە گەیاندیانە دەرەجەیێ وەکی ذَراتی حَیَوِیّەی حیوانات بچێنە ناو رەحمی کچە جووێ ببێ بە (عیسی) بیبەن بۆ دار تفی لێ کەن تاجی درکی لەسەر نێن بەهزار ئەتك وسیاسەت لەداری بدەن. ﴿قُلۡ فَلِمَ يُعَذِّبُكُم بِذُنُوبِكُمۖ﴾ ئەگەر ئێوە أبناو أحِبّای خوان چۆن لەبەر دەستی دوژمنی خوا رەزیل ئەبن؟ قبلە گاهتان خراپ دەکرێ؟ یابۆچی شتێ وا ئەکەن خوا عذابتان بدات؟ أمری بەجێ ناهێنن ئەوەی ئەو لای ناخۆشە ئەیکەن، حَقّی بُنُّوەت

ومُحبّـت وایـه ؟ ﴿بَلْ أَنتُم بَشَرٌ مِّمَّنْ خَلَقَ يَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ وَيُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَلِلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا﴾ حاجـەتـي بـەأبناو أحبّـا نیـە عالـەم مخلوقي ئەوە، کەس لەسەر کـەس إمتیـازي نیـە، إلاّ بە تقوی نـەبیّ ﴿وَإِلَيْهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿١٨﴾﴾ مبدأي وجود لەوە، گەڕانەوە بۆ لاي ئەوە. ئەو وەقتە معلومتان ئەبیّ چتان بەسەردیّ. گەلیّ مسلّمانان إدّعا ئەکەن ئێمە خۆشەویستي خوداین، هەرچی بیکـەین خـوا لەگـەلّمان بـە مُحبّـتـە لیّمـان خـۆش ئـەبیّ عـذابمان نـادا. طائفەیّك ئەلّین أولیا محفوظن یعني گوناه تأثیر له قدسیه تیان ناکا، ئـەوانیش نا شکري نەبیّ توشي زِلّەت بـوون حـالاش بەخەبـەر نایـەن، خۆیـان بـه نـازدار ئەزانن حالیشیان معلومە. وامەزانن عِزّە تي (نَصاری) ئەمڕۆ له سایەی أبنـاءيُ وأحبّائیە، له سایەی علمای طبیعەتە که خرافاتـي مـسیحیان فـریّ دا، حتّـا لـە قەیدي إیمان به خوا چونه دەر، قواي طبیعـەتیـان بەقـەدەر حـال کشف کـرد ڕێیان بۆ إستخدامي برد تەرەقیان کرد. هەمو مخترعەکان لایان وایە دین مانعي تەرەقیە، حقّا دیني جوو دیانان مانعي هـەمو شـەرەفە. أمّـا ئێمـە ئـەلێین ئـەو دینـە مُختَلَقـە إلاهـي نیـە. ﴿يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ﴾ (جـوو) و (دیـان) ﴿قَدْ جَآءَكُمْ رَسُولُنَا﴾ محمدی إسماعیلـي ﴿يُبَيِّنُ لَكُمْ﴾ ئێوە لـە خـەلکي إحتیاجیتـان بـە ڕەسولیّ زیاتر هەیە، بەیاني حەقتان بۆ بکا، سَبب به إیمان وەرگەڕاون. ﴿عَلَىٰ فَتْرَةٍ مِّنَ ٱلرُّسُلِ﴾ أنبیاء ورُسُلْ له بَني إسرائیلی هەندە زۆر بـون نُبـوّەت لایـان بوه ملعبه، قیمەتي رسُلیان لا نەما ئەیان کوشت ڕەزالەتیان بەسـەر ئـەهێنان. إفترای ناشیرن ناشیرنیان پیّ ئەکردن حکمەتي إلاهي إیجابي کرد جاریّ رسـول نەنێریّ، زەمانەکي بکەوێتە بەین. بۆیـە گـەلیّ لـە بَـني إسـرائیلی تینوبـون بـۆ بعثي رسولیّ. خەبەریان به قُربي زەمـانـي ئـەدا. خـوا ئەفـەرمویّ لەسـەر ئـەو إنقطاعه طولي عَهده وا ڕەسولـي خۆمـان بـۆ نـاردن. بـەیانـي أحکـامـي إلاهـي

أصولي وفروعیتان بۆ ئەكا. ﴿أَن تَقُولُواْ مَا جَآءَنَا مِنۢ بَشِيرٖ وَلَا نَذِيرٖۖ﴾ مُدّەیەكە كەس نەهاتوە لە طرف خودا بۆ سەر ئێمە بەشارەت بدابە مُطیع عاصیان بترسێنێ ﴿فَقَدۡ جَآءَكُم بَشِيرٞ وَنَذِيرٞۗ﴾ ئەواهات، یاخوا بەخێر بێت، سەر سەران سەرچاوان. تەماشاكەن چ بەیانەكتان بۆ ئەكا. كو حەقّ وباطل لێك جودا دەكا. أخباري مَسَرّەت أفزاي بۆ أهلي تقوایە، خصوصیەت لای ئەو نیە. ترساندانی بۆ أهلي شقایە. هیچ شخص بە زاتی خۆی نە خۆشەویستە نە مَبغوضی خودایە.

فەرقي إسماعیلّي وإسرائیلی لای وي نیە. ئەگەر چی (دار قُطني) بەو قسە راضي نیە. دەلێ (إنّ اللهَ خَلَق الخَلْقَ فأختار مِنْهمُ العَرَبَ) ئەوجا نۆرەی عەرەبانە بینە (شعب الله) و (أبناء الله) و(أحِبّاءُ الله). ئەی واي چۆن دواي إسرائیلیەكان كەوتن، ئەمانیش وەكي وان تێ كەوتن ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٞ ١٩﴾ حتّا ئەتوانێ لە كُلّي شعبێ رەسولان بنێرێ ئەمە بە مُحال مەزانن بۆ بەهانە زیاتر وەرمەگەرێن جەوابی ئەو دەعوەتە لە طرف أهلي كتاب كُفرو عنادە، ئەوە (شَنشَنە) كە لە أباو أجدادیان بەمیرات وەرگرتوە ﴿وَإِذۡ قَالَ مُوسَىٰ﴾ (علیه السلام) كلیمي خوا زەعیم أعظم منقذي أكبر ﴿لِقَوۡمِهِۦ﴾ كە آبای ئەمانەن لە عصري توودان.

﴿يَٰقَوۡمِ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ﴾ شكرانەي خوا بكەن یادي نعمەتي بكەن كە لە حەق ئێوەي كردوە ﴿إِذۡ جَعَلَ فِيكُمۡ أَنۢبِيَآءَ﴾ لە خۆتان حتّا لە تَشریعي قَوانین إحتیاجتان بە مِلَل ودەوەلي دیكە نیە. حقّا ئەوە نعمەتێكی گەورەیە، لای من أسیر ئەو قومەیە كە إتباعي قوانیني أجانب بكا ولَوْ دەولەتێ بێ وەكی (بَریطانیا) استلاي قطعاتي أرضي كردبێ. ﴿وَجَعَلَكُم مُّلُوكٗا﴾ لە أسارەت دەرچون بونە متصرفي خۆتان حاكم لەسەر خۆتان. أما تشكیلی

حکومەت ئەو پاشي زمانێ لە أیّامي (شاول) کە پێی ئەڵێن (طالوت) کرا.
﴿وَءَاتَىٰكُم مَّا لَمْ يُؤْتِ أَحَدًا مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٠﴾﴾ لە متقدمین ومتأخرین بحري بۆ شەق کردن دوازدە کاني لە بە ردي ڕەق بۆ دەرقولاندن، (مَنّ) و (سلْوی)ی بۆ ناردن سایەباني هەوري لەسەر هەلدان. حقیقە ئەو لطف مەرحمەتی خوا بوواني کرد بۆ کەسي نەکردیە. ﴿يَٰقَوْمِ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْأَرْضَ ٱلْمُقَدَّسَةَ ٱلَّتِى كَتَبَ ٱللَّهُ لَكُمْ﴾ ئەو أرضە بەخێرو بەرەکەتە کە خوای تعالان بۆ ئێوەي نوسیوە لەو أرضە، ئێوە لە هەمو ڕەزالەت وإستحقار پاك ئەکاتەوە، ئەبنە صاحبي تاج وتەخت ودیهیم وعَلَمْ. واتێ مەگەن کە خوا بۆ ئێوەي نوسیوە وەك مریشکی سوورکراوە یا مائدەي (عیسی) بێتە بەردەمتان، بێ ڕەنج وتعب وجدال وقتال إستلاي ئەکەن. ڕوویان تێ کەن بەزۆري بازو وولاتیان لێ بستێنن. ئەگەر ئێوە سعي بکەن تأمینتان ئەکەم خوا بەسەرتان دەیخی. ﴿وَلَا تَرْتَدُّوا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَارِكُمْ﴾ پاشەوپاش مەگەرێنەوە ﴿فَتَنقَلِبُوا۟ خَٰسِرِينَ ﴿٢١﴾﴾ ئەگەر پشت لە دوژمن کەن وەرگەرێن لە هەمو طَرفە کي نائُمێد ئەبن، ئەو کۆششي تا ئەمڕۆ کرایە، بێ هودە ئەڕوا. ﴿قَالُوا۟ يَٰمُوسَىٰٓ﴾ لە جەوابي ئەو منقذە جگەرسۆزە گوتیان ﴿إِنَّ فِيهَا قَوْمًا جَبَّارِينَ﴾ لێرەدا هەیە قەومێ زل متکبر خون ڕێژ صاحب قوەت بأس شدید. ئەو قەومە (بنو عناقیان) پێ ئەڵێن (عوجی بنی عنق) لەوان بوە، ڕوات وقصاص لەزلیان زۆر درۆي گەورە گەورەیان کردیە، بێ شك درۆیەکان گەلێك لەوان گەورەترن. عوج وموج بێ أصل وأساسە إیرادي ئەو نوعە خرافاتە لە کتبي تفسیر جێی تعجبە.

﴿وَإِنَّا لَن نَّدْخُلَهَا﴾ أبداً نایچینێ ﴿حَتَّىٰ يَخْرُجُوا۟﴾ ئەو قومە جبّارە ﴿مِنْهَا﴾ لە أرضي مقدسە ﴿فَإِن يَخْرُجُوا۟ مِنْهَا فَإِنَّا دَٰخِلُونَ ﴿٢٢﴾﴾ هەرچەند ئەو أرضي بە ئێمە وەعد دراوە شیرو هەنگوینی لێ دەرکولێ أمّا نە

ئەو شیر وعَسَلە نە حرب لەگەلْ ئەو قەومە. ﴿قَالَ رَجُلَانِ﴾ دوو پیاو (یوشع بنِ نون) (کالب بنِ یفنه) ﴿مِنَ ٱلَّذِينَ يَخَافُونَ﴾ لە بني إسرائیلیان کە دەترسان لە جبّارینان یا لەوانەي کە لە خوا ئەترسان یا لەو قەمە بون کە بني إسرائیلي لەوان ئەترسان لە بعضي قراءَت (یُخافونَ) بەبنا مفعول خویندراوەتەوە، بۆیە بعضي ئەلێن ئەو دووپیاوە لە عمالقان بون هاتبونە خدمەت (موسى) إیمانیان هینابو بە خوا. بەو قراءَته (زَمَخشري) تأیدی معنای ثالث دەکا، زۆر دوور نیە.

ترسي واى غلبە بەسەردا کردبون لەو أول و لە آخر کەسێ بەهێزیان نەمابو. بناءً علیه معناي ﴿أَنْعَمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمَا﴾ بە إیمان بە حضرەتي (موسى) یا جەنابي حەق انعامي لەگەلْ کردبون بە غیرەت وشجاعەت وصَبرو ثبات لەحَرب. حقیقةً لە بەیني بني إسرائیلي ترسنوك ئەوە نعمەتێ فوق التصورە.

﴿ٱدْخُلُوا۟ عَلَيْهِمُ ٱلْبَابَ﴾ دیارە ئەوانە شارەزا بوین زانانددیانە شار لە کێهە طَرَفي ئەگیرێ قوم مُعَطّل ئەبن ناتوانن شەڕ بکەن دەروازەي شاریان لێ بگرن ﴿فَإِذَا دَخَلْتُمُوهُ﴾ ئەگەر چونە ناو دەرکە ﴿فَإِنَّكُمْ غَـٰلِبُونَ﴾ فەرمون رِوولەشار کەن مەترسن ﴿وَعَلَى ٱللَّهِ فَتَوَكَّلُوٓا۟﴾ دلْ بەخوا ببەستن وثوقتان پێ هەبێ ﴿إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٢٣﴾﴾ ئەگەر بە حەق إیمان دارن ﴿قَالُوا۟ يَـٰمُوسَىٰٓ﴾ ئەو قسانە پڕو پوچن خۆمان بە فیرۆ نادەین. ﴿إِنَّا لَن نَّدْخُلَهَآ أَبَدًا مَّا دَامُوا۟ فِيهَا﴾ ئیتر درێژەي پێ ناوێ ﴿فَٱذْهَبْ أَنتَ وَرَبُّكَ فَقَـٰتِلَآ إِنَّا هَـٰهُنَا قَـٰعِدُونَ ﴿٢٤﴾﴾ تۆ ئێمەت لە (مصر) هینادەر وەعدەت پێ داني بە أرضي مُقدس کە (تَدُرُّ لَبَناً وعَسَلاً) کو بحرەت بۆ شەق کردین أنواعي خوارقت نواند بۆر تۆ لەگەلاّ خوات شەر بکەن.

ئەو قومە بشكێنن دەريان كەن ئێمە إشتراكي حەرب ناكەين لێرە دادەنيشين والسلام. قومێ لەگەڵ زەعيم وسيّدي خۆيان معاملەيان وابێ لەگەڵ تو چۆن ئەبن! ﴿قَالَ﴾ حضرەتي موسى لەوان نا أُميد بو عرضي (كبريائى) كردبا ﴿رَبِّ إِنِّي لَآ أَمۡلِكُ إِلَّا نَفۡسِي وَأَخِيۖ﴾ يارەبّي ئەمن هەر نفسى خوموبرام بەدەستە ئێمە لە ژێر أمر وإرادەي تۆين، ئەو قومە خۆت دەبيني چۆن لاساريٍ ئەكەن. أما دووپياوەكان نَظر بە سَوادي أعظم نانوێنن تابێنە ذكر كردن، زاتا قومي (موسى) گوێيان نەدا قسەى ئەوان حتّا رووى خطابيشيان تێ نەكردن ﴿فَٱفۡرُقۡ بَيۡنَنَا﴾ خۆم وبرام ﴿وَبَيۡنَ ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ ٢٥﴾ فصلمان لە بەينا بفەرموى نزاع وجدالمان ببرێتەوە ﴿قَالَ فَإِنَّهَا مُحَرَّمَةٌ عَلَيۡهِمۡۛ﴾ أرضي مقدسە حرامە لەوان نايچنێ ﴿أَرۡبَعِينَ سَنَةٗۛ﴾ ئەمە جزاي تَمرُّديانە ﴿يَتِيهُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِۚ﴾ لە ئەو چۆل وصحرايە بە مُتَحيّري وسەرگەرداني ئەخولێنەوە. مقصد لە وەچى يە؟ ئەو قومي حاضرە ترس غلبەي لێ كردينە قابلي حرب وخرب نينە لەو مُدّە نسلێكى (بَدَوي) (حَرْبي) (بێ ترس) (دوور لە ذِلّتي) حضارەتيان لێ هەلكەوي بە تعليم وتربيەي عسكري گەورە ببن، ئەوانە نائلى وەعدەي إلاهي ئەبن. أما ئەو مُتحيّرانە ناگەنە ئەو مەرامە. ﴿فَلَا تَأۡسَ عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡفَٰسِقِينَ ٢٦﴾ غەمگين مەبە لەسەر ئەو قومە لە إطاعە دەرچوانە. ئەوە شاهدێكە جەنابي حەق ئەو قومە كە ئەڵێن: ئێمە أبناء الله وأحِباءُ الله ين بەو نوعە ئەيان گرێ، عذابيان ئەدا. شاهدێكى تريش لەو خەبەري آتي وەرئەگێرێ ئەو مؤاخذەي آتي لەگەڵ إدّعاي وان ظاهراً زۆر لێك دوورن. كەوابێ ئەم شاهيدەت بە قوت ترە لە شاهدي سابق ﴿وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱبۡنَيۡ ءَادَمَ﴾ لەسەريان بخوێنەوە خەبەري دوو كورِى آدە مي ظاهروايە لە صُلبي خۆى بن بلا واسطة. ناويان چ بو لزومي نيە، گەرچى لە (تَورات) ئەلێى يەكيان أول

أولادي آدەم بـۆ (قابیـل) دووەم ثـاني ولـدي بـو (هابـل) ﴿بِٱلْحَقِّ﴾ بـێ مزخرەفات وخرافاتـي (أسـفار) صـفوەت القـول ئەوەندەیـە کـە قـرآن بـەیانـي دەفەرموي ﴿إِذْ قَرَّبَا قُرْبَانًا﴾ وەقتێ قوربانیان تقدیم کـرد چ بـوو؟ نـوعـێ بـو؟ یادوو جنسي مُختلِف؟ یەکیان صاحب مەڕ بوو یەکێ صاحب نملە، بێ لزومە.

﴿فَتُقُبِّلَ مِنْ أَحَدِهِمَا﴾ لە یەکیان قەبول کرا ﴿وَلَمْ يُتَقَبَّلْ مِنَ ٱلْآخَرِ﴾ لـەوی دیکـەیان قبـول نـەکرا. کێهـەیان کێهـەیان کوشـت؟ علامـەتی قبـول چ بـوو؟ فائدەیەکی علمي تێدا نیە؟ لـە (تـورات) دەلـێ قابیـل هـابلي کوشـت. بعـضێ ئەڵێن نابێ، چونکي مشهور لاي وان (قابل)ە لە قبولە، چۆن ئەمە قابِلە؟ قابِلْ غیرە قابِل بکوژێ؟ لە تورات ئەلێ قورباني وهدیەکەیان تقدیمي زاتي (کبریائي) کـرد خـودا تەماشـاي هابل وهدیـەی هـابلي کـرد تەماشـاي (قابیـل) وهدیـەي (قابیل)ي نەکرد. أیهو ئەو خـواي ئێمـە ایمانمـان پـێ هەیـە لەگـەڵا خـواي لاي إسرائیلیان فەرقي زۆرە. ﴿قَالَ﴾ ئەوەی قورباني لێ قبـول نـەکرابو بـەوي دي گوت ﴿لَأَقْتُلَنَّكَ﴾ ئەتکوژم ﴿قَالَ﴾ لـە جـوابـي دا بۆیـە ئـەمکوژي چـونکـي قوربانیت قبول نەکرایە؟ ئەمە قەباحەتي مني تێ دا نیە، سَببي عائدي خۆتـە.

﴿إِنَّمَا يَتَقَبَّلُ ٱللَّهُ مِنَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٢٧﴾﴾ تۆ لە أهلي تقوا ني بۆیە خوا لە تـۆي قبـول نەکرد. خوا صَدقات وقرابین هەر لە پـەرهێزگاران قبـول ئـەکات. نفسي خـۆت بکوژە بـە مخالفـەي هـە واي، بـۆ مـن ئـەکوژي. ﴿لَئِنۢ بَسَطتَ إِلَيَّ يَدَكَ لِتَقْتُلَنِي﴾ ئەگەر تۆ دەست درێژ بکەی بۆ لاي مـن بـۆ کوشـتنم ﴿مَآ أَنَا۠ بِبَاسِطٍ يَدِيَ إِلَيْكَ لِأَقْتُلَكَ﴾ من دەست درێژ ناکەم بۆ لات کە بتکـوژم. نـە تـۆ حـەقی کوشـتنت هەیە لەسەر من، نە من لەسەر تۆ. ئەمەش لە بێ هێزیم نیە.

﴿إِنِّيٓ أَخَافُ ٱللَّهَ رَبَّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾﴾ من لە خواي عالەم ئەترسم حـەق وایـە تۆش لە خوا بترسي. تۆ ئەگەر لە أهلي تَقوا باي بِلا موجِب بۆ قَصدي قتلي من

ئەكەي؟ ﴿إِنِّيٓ أُرِيدُ﴾ چونكي هەندە بێ پەرهێزي لەخوا ئەمن قصد ئەكەم ئەخوازم ﴿أَن تَبُوٓأَ بِإِثۡمِي﴾ ئەگەر بمكوژي هەر گوناهێكم هەبێ بێتە ئەستۆي تۆ، تۆ بیگێریەوە داري جزاء. ﴿وَإِثۡمِكَ﴾ گوناه، ئەو قتلە، وە سائري دیكە ﴿فَتَكُونَ مِنۡ أَصۡحَٰبِ ٱلنَّارِۚ﴾ خاوەني ئاگري لێی جودا نابی ﴿وَذَٰلِكَ جَزَٰٓؤُاْ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٢٩﴾﴾ ئەمەش پاداشي ظالمانە ﴿فَطَوَّعَتۡ لَهُۥ نَفۡسُهُۥ قَتۡلَ أَخِيهِ﴾ ئەو قسانە تأثیري تێ نەكرد، نفسي خبیثي قتلي براي بۆ مُزَّين كرد ﴿فَقَتَلَهُۥ﴾ كوشتي. ﴿فَأَصۡبَحَ مِنَ ٱلۡخَٰسِرِينَ ﴿٣٠﴾﴾ براى لە قيس چو، نفسي لە فِطرەتی بَشَري محروم بوو. مستحقي لَعن وعذابي أبَدي بوو. وەنەشي زاني لاشەي براي چ لێ بكا. ﴿فَبَعَثَ ٱللَّهُ غُرَابٗا﴾ خوا قەلەڕەشەكي نارد ﴿يَبۡحَثُ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ بەلاقي بەدەندوكي أرضي ئەكۆڵیەوە. بۆخۆشي قەل دائم لە كرم دەگەرێ عارد هەردەكۆلێ كرمي لێ دەهێنێتە دەرێ. ﴿لِيُرِيَهُۥ كَيۡفَ يُوَٰرِي سَوۡءَةَ أَخِيهِۚ﴾ تانیشاني بدا لاشەي براي خۆي بشارێتەوە. (أبو مُسلِم) ئەفەرموێ قەلەكە قولَتەكي هەڵقەند شتێكی تێ داشاردەوە ئەویش لێ فێربو. ظاهر وايە يەك (غُراب) بوبێ گەرچی جمهوري مفسرین ئەفەرمون دوو قەل بوون، يەكيان ئەويتري كوشت حَفرەكی هەڵقەند شتێكی تێ دا شاردەوە. ظاهر وايە يە ك (غُراب) بوبي گەرچی جمهوري مفسرین ئەفەرمون دوو قەل بوون، يەكيان ئەديتري كوشت حفرەكی هەڵقەند وەشاردیەوە ظاهر وايە ئەمەيان بە مناسبەي تەمامي حكايەتی أخوين رێك خستبێ.

﴿قَالَ﴾ قاتل گوتي ﴿يَٰوَيۡلَتَىٰٓ﴾ ئەي هاوارتە لە خۆم ﴿أَعَجَزۡتُ أَنۡ أَكُونَ مِثۡلَ هَٰذَا ٱلۡغُرَابِ﴾ ئەوەندە هۆشم نەبو كەوەكوئەو قەلەي بم. ﴿فَأُوَٰرِيَ سَوۡءَةَ أَخِيۖ﴾ لەخۆرا دەركي بكەم. ﴿فَأَصۡبَحَ مِنَ ٱلنَّٰدِمِينَ ﴿٣١﴾﴾ پەشێمان

بۆوە أمّا سودێکی نەبو، ئیش لە ئیش تێپەڕي. عُلماء گەلەك شتیان بیان کردیە کە بَشَرْ لە حیوانات فێري بوین، ئەمەڕاستە، حتّا الآن کە عَصري إختراعاتي حَدیثە یە بعضە شت لە حَیوانات وەرئەگرن ﴿مِنۡ أَجۡلِ ذَٰلِكَ﴾ لەبەر ئەوە کە ئەو برایە براي خۆي کوشت ﴿كَتَبۡنَا عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾ لەسەرمان نوسینِ ثابتمان کرد ﴿أَنَّهُۥ﴾ شأن وایە ﴿مَن قَتَلَ نَفۡسَۢا بِغَيۡرِ نَفۡسٍ﴾ بێ موجبی قِصاص ﴿أَوۡ فَسَادٖ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾ بێ سَبَبي فتنەو فساد لە أرضیدا ﴿فَكَأَنَّمَا قَتَلَ ٱلنَّاسَ جَمِيعٗا﴾ گوناهي هەمو عالەمي ئەگاتێ. کأنّە هەمو بَشَري کوشتوە (ئەو شتە بۆ غَیري بَني إسرائیلي نیە). بعضێ وەك (حَسَنِ بَصْري) دووریان زانیوە یەکێ لە کوڕانی ئادەم یەکێ تر بکوژێ ئەو شتە لەسەر بني إسرائیلیان بکرێ، بۆیە بە دوو شخص لە بني إسرائیلي تَفسیري فەرموە. أمّا ئەوە من حیث المعنی لێ ی نزیك تر نیە لە أولي سببي مُقرّبْ أمرێکە معلوم ئەبێ لە حالي بَني إسرائیلی کە لە قدیمي زەمان عَداوەتیان هەیە لەگەڵ (إسماعیل) لەڕەگزی پیشتی براي اسحاق. هیچ عُزریان نیە ئەمەندە نەبێ کە اسماعیل لە کەنیزەکە (ساراخاتون) هەوێ باري لەگەڵ کردوە. إسماعیلیان لە إرثي مَعنوي بابي بە محروم ئەزانن، ئەوي لەویش پاشەکەوت بێ نابێ نائلي فضیلە تي رسالەت بێ، کأنّهُ حَیاتي مَعنوي کە گەلێ لە فوقي حَیاتي مادّیە، لە إسماعیل وأولادي إسماعیلیان سَلِبْ کردیە. حَسادَتێ وان گەلێ گەورەترە لە حَسادە تي کوڕی آدەم معذروە تیان زۆر واهی ترە. لاشَك بَني إسرائیلي لەوەئەگەیشتن بۆیە إعتراضیان نەبو. وەلەسەر ئەو تشدیدە أهمیەتیان نەئەدا بە قَتل، حتّا رُسُلي خۆیان ئەکوشت. ﴿وَمَنۡ أَحۡيَاهَا فَكَأَنَّمَآ أَحۡيَا ٱلنَّاسَ جَمِيعٗاۚ﴾ بائەوەش داخلي مکتوب بێ بۆ حِرمانیان لەو نعمەتە عظیمەیە، زێرا ئەوان دائما خریکي إخمادي أنفاسي عِبادن، مەگەر کەسێ طمعیان پێ بێ خێري لێ ببینن. في الحقیقە کەسێ بلا موجب کەسێ

بکوژێ کأنّه هەموإنسانی کوشتوە، زێرا بیٚ دەسەلاتی نەبیٚ هیچ مانعی تری نیە. کەسیٚ نفسیٚ لە هیلاکەت قورتار کا ببیٚ بە باعثی حَیاتی بیٚ طمع وأملی دنَیوی بەلکو صرف لەبەر حنّو وعواطفی بشری کأنّهُ هەموو کەسی زیندی کردیتەوە مادام بۆی رێك بکەویٚ هەر کەسیٚ ببیٚ نجاتی ئەدا.

ئەو ثوابە بۆ ئەو نوعە کەسە لە لطفی خوا ئەوەشێتەوە بۆ هەمو کەس، إسرائیلی وغَیرە إسرائیلی ببیٚ. ﴿وَلَقَدْ جَآءَتْهُمْ رُسُلُنَا﴾ جمعیٚ زۆر أزجملە حضرەتی (عیسیٰ) وەحضرتی (مصطفیٰ)یە ﴿بِٱلْبَيِّنَٰتِ﴾ ئایاتی ظاهرە ﴿ثُمَّ إِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم بَعْدَ ذَٰلِكَ﴾ پاش ئەوی ذکر کرا لە تشدید وبعثی رُسُل بالبیّنات ﴿فِى ٱلْأَرْضِ لَمُسْرِفُونَ ۝٣٢﴾ لە گوناە إسراف دەکەن لە هەر کویٚ بن حتّا زۆر خەریك بون (لا سمح الله یە) حضرەتی خاتم الرسل بکوژن وەتا توانیان سَعیان کرد لە کوژاندنەوەی نوری إسلام ومَنعِ کردنی عِبادی خوا لە هدایەت بۆ رێی راست. لا یَخفی فائدەی قەیدی بِغَیرِ نَفسٍ سابقاً زاندرا وە جزای دُنیوی وأُخروی مان لیٚ معلوم بو بزانین فائدەی قەیدی (أو فسادٍ فی الأرضِ) چیە ﴿إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ﴾ شەڕی لەگەلا خواو رەسولی خوا ئەکەن، ئەوی شەری عام بیٚ، شەری لەگەلاخواو رەسولی خوا ئەکا ﴿وَيَسْعَوْنَ فِى ٱلْأَرْضِ فَسَادًا﴾ ڕیٚ گری ئەکەن أکثرِیت کاروان ڕووت ئەکەن، عبادی خوا ئەترسێنن، فتنە بەرپا بکەن ﴿أَن يُقَتَّلُوٓاْ﴾ ئەگەر خەلك بکوژن ﴿أَوْ يُصَلَّبُوٓاْ﴾ ئەگەر مالیش ببەن ﴿أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلَٰفٍ﴾ یادەست ولاقیان، چەپ وراست، ببڕیٚ. ﴿أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ ٱلْأَرْضِ﴾ نفی بکرێن لە ولاتی خۆیان بۆ ولاتیٚ دی. معنایٚ لە (تَرْجُمانُ القرآن) نقل ئەکەن ئەوەندە بیٚ معنایە إنسان ناتوانیٚ نقلی بکات. وە یاخود إمام مُخَیَّرە لە و جَزایانە، ئەوەی صلاحی زانی، وای ئەکا. ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەوی ذکر کرا لە جَزا

﴿لَهُمۡ خِزۡيٞ فِي ٱلدُّنۡيَاۖ﴾ لە دونیایێ ڕەزیل کردنیانە. حَق وایە ئەوي خراپە بکات، کو لای خوا مُحَقَّر ومُهانە، لاي أُمَّە تیش وابێ. أمّا ئەوانی أشقیاء. ئەگەر لە طرف أمّەت نائلي إحترام وتقدیرو ئافەرین وإکرام بون، ئەو نَوعە جَزایە زۆر تأثیري نابێ. وەحکومەتیش عاجز ئەبێ لە گرتنیان. ﴿وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ ٣٣﴾ ئەو عذابە عظیمە بە گوێرەي قساوت وپیسی دڵ ونَفسیان لە دەرەجاتي عَظمەت تفاوتي هەیە. ﴿إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِن قَبۡلِ أَن تَقۡدِرُواْ عَلَيۡهِمۡۖ﴾ توبەي بکەن دەخالەتي بە حکومەت بکەن تسلیم بنْ، ئەو وەقتە بۆ إمام عفوي عمومي هەیە أمّا لە حقوقي شخصي عَفو نیە. وە قوانیني دولیش لەسەر ئەوەیە.

﴿فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ٣٤﴾ لە حقوقي خۆش ئەبێ، ئێوەش هەوەستان لێ یە لێ یان خۆش بن، هەوەستان لێ یە دەعوایان لێی بکەن. (بیضاوي) ئەفەرموێ أمّا قِصاص بە مراجعەي أولیاي مقتولە بە (تَوبە) وجوبي ساقط ئەبێ جَوازي ساقط نابێ، یعني أولیای مقتول دروستە بۆیان طَلَبي قِصاص بکەن ئەگەرچی أساساً طلبي قِصاص واجب نیە چونکی خوا ڕێی عَفوي داناوە وەك سابقاً زاندرا (تَوبە)ش ئەو جَوازە رَفع ناکات، أما ئەگەر طلبیان کرد لەسەر إمام واجب ئەبێ قِصاص بکات. خلاصە بە (تَوبە) وجوبي حَدّي لەسەر إمام سقوط ئەکا جَوازي دَعوا لەسەر وَلي خوێن سقوط ناکا (من حَیثُ کونه قِصاصاً) با (بعد الدعوى من هذه الحیثیّة) لەسەر إمام واجب بێ. أمّا عبارەتي (بیضاوي) کورتە تەنگە، بۆیە (إبن الحجر) إعتراضي لێ گرتیە، وە (إبن القاسم) جوابي دایتەوە. ئەمە وابێ. کەسێ تەماشاکا ئەزانێ ئەو آیەتە ئەوەندە مُتصلە بە ماقَبلي ڕێی هیچ أسبابي نزول نادا ئەگەر چی نقّالەکان گەلێ حکایەتیان کردیە بۆ سببي نزول، وەلێ ئەوانە لەبەر تەماشاي أسبابي نزول ئاگایان لە تَفسیري نظمي قرآن نەماوە، مَعَ انَّە وەك (سیّد رشید) کرارا

ئەفەرموێ، بعضه وقایع بوه، ئەوي آیەتەکەي بیستبێن واي خَیال کردوه کە دائر بەو واقِعه نزولي کردیه. ئەوي نَظَر به نظمي قرآن تفسیر بکا، ئەبێ (مادام الإمکان) رِوو له أسبابي نزول نەکات خصوصاً که أوهام وخَیال مُداخَلەی تێدا بێ. ئەو خِزيٌ وعَذابه جَزاي ئەوانەیه رِێ گري ئەکەن وآمن وئاسایش تێك ئەدەن. ئایا ئەوانەي کە شِرك بۆ خوا پەیا ئەکەن قسەی نالایق وسوك دەربارەي (کبریائي)ئەڵێن رِێی هدایەت بۆ دیني حَق که مایەي حَیاتي إجتماعي وسعادەتي حَیاتي أبدیه له عبادي خوا ئەگرن قصدي کوشتني هاورِێی مُخلِص ئەکەن ئەبێ بێ؟ ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ گوێتان لەو آیەتانە بو کە أحوالي بَنی إسرائیلی تێیان دا بَیان کرا. زِنهار صەد زنهار ئێوه وەك وان مەبن ﴿ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ﴾ له غضب وسخط وعِقابي خوا خۆ بپارێزن بترسن ﴿وَٱبْتَغُوٓاْ إِلَيْهِ ٱلْوَسِيلَةَ﴾ طلبي شتێ بکەن به کمالي شَوق که ببێتە واسطەی نێزیکي لە خوا، بەو واسطه نائلي لطف ومرحمەتي خوا ببن. حاصلي ئەوەي رضامەندي خواي تیایه ئەوه بکەن. سەر له إطاعه ي مەپێچن وا مەزانن ئەمرۆ نهایەتي فتوحاتتانه له مەولا ئەمرتان ئەکرێتێ به توجه بۆ دەولەتي (رۆم) بۆ دەولەتي (فارس) مەلێن ئێمه چۆن رِوو کەینه ئەو دوو دەولەته جَبّاره حقیقةً بعضي له (عرب) له ژێر دەستي ئەو دوو دەوڵەتەبون أمّا زِلّەت و رِەزالەتیان وه کي بني إسرائیلي نەدیبو وەترسیان له دلّدا شین نەبوبو. وه قسمێ زۆر له وان به حُریەت مانەوه پەس له دوژمن هەراسی مەکەن. ﴿وَجَـٰهِدُواْ فِى سَبِيلِهِۦ﴾ له رِێی خوا بۆ خَلاصي بَشر له شەري ظالمان له ذِلّي عبودیەتي حیوانات وجمادات ﴿لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٣٥﴾﴾ به أمیدي ئەوه کە نائلي سعادەتي دنیاو قیامەت بن لەسەر أرضي بەسەر بەرزي بژین له قیامەت درجاتان بلّند بێ وەکي جولەکەکان مەلێن (إذهَبْ أنت وربك فقاتلا إنّا هٰهُنا قاعدونَ) پێغەمبەرو معجزەي پێغەمبەر بکەنە وەسیله بۆ فتح وفتوح ودَفعي دوژمن وەك تا

ئێستانەتان كردیە ئەو وسیلەي كە دەستتان پێوە گرتیە دەستي لێ بەر مەدەن. كەسێ أنصافي هەبێ ئەوانێ مقصد لەو وسیلە لێرە چیە. ئەوەي ئارەزوي هەبێ روحي ئەو ئایەتە ببا بۆ موسڵمانان فائدەی تێدا نەهێڵێ، حملي وەسیلە ئەكاتە سەر شتێ كە تا ئێستا كەڵكی موسڵمانانی نەگرتیە وەتا أبد كەڵكیان ناگرێت بەڵكو مع الأسف بوە باعثي شكست ونشستي إسلام. (سیدي آلوسي) و (سیّد رشید) لە تحقیقي وەسلە لێرە تفصیلاتێ زۆر مفیدیان هەیە بەڵام ئەو تفسیرە كورتە كوردیە ئەو طول تفصیلە هەڵناگرێ مع أنە حق دیارە، كەسێ لە تجاربي زمانە عبرەت وەرنەگرێ بە دلائل وبرهان چارەي ناكرێت خصوص ئەوانەي كە پێغەمبەر زۆریان لێ ترساوە كە ئەفەرموێ (أخوف ما أخاف علیكم كل منافق القلب علیم اللسان) في الحقیقة ئەوانەي دڵ بە غەشن لەگەڵ عبادي خوا وەتەڕ زوبانن لەهەموو كەس خراپترن بۆ إفسادي أمّت ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ﴾ وەسائلیان پەیدا نەكردوە بۆ نجاتي قیامەت ﴿لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِي ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا﴾ بە هەمو خەزێنەو دەفینە ﴿وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ﴾ مثلي مافي الأرضیشي لە گەڵ بی ﴿لِيَفْتَدُواْ بِهِۦ﴾ بۆ خاطري بیكەن بە فیدیە نَجات بەو وَسیلە خَلاص بن. ﴿مِنْ عَذَابِ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ مَا تُقُبِّلَ مِنْهُمْ﴾ لێ یان قبولێ ناكرێ. ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٣٦﴾﴾ چاك حِسّي ئەكەن. حقّا مأیوسي لەو وَسائلە عَذابي زۆر بە ئێشە، لە ألَمي ئاگر بۆ أربابي وجدان بە ئێشترە. ﴿يُرِيدُونَ أَن يَخْرُجُواْ مِنَ ٱلنَّارِ﴾ لەپاش ئەوەي لە چوونە ئاگري حەز ئەكەن بچنە دەر ﴿وَمَا هُم بِخَٰرِجِينَ مِنْهَا﴾ ناچنە دەر. چۆن ئەچن؟ دەسەڵاتیان نیە ﴿وَلَهُمْ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٣٧﴾﴾ ثابتە لە سەریان، تێ ناپەرێ. ممكنە بەڵێنی ئەوانە لە دونیا حەز ئەكەن بە واسطِهِي وَسائل وفِدیە لە ئاگر تێ پەڕن نەكەونە ناوي، نجاتیان لێ ببێ. أمّا ئەكەویێ لێی ناچنە دەر چونكي چي وا ناكەن كە باعِثي نَجاتیان بێ، بەڵكو دەوام ئەكەن لەسەر ئەو سَیِّئاتە كە پێی دەوام

ئەكەن لەناو ئاگر ﴿وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ﴾ دزیش نوعێكەلە فسادي في الأرض أمّا فسادێكی حیزانەیە وەكي ڕێگر نایەتە بەر مەیدان، بۆیە ڕێی عَفو نیە لە عقوبەت وەلو (تَوبە)ش بكا پێش گیراني ﴿فَٱقْطَعُوٓاْ أَيْدِيَهُمَا﴾ دەستیان ببڕن ﴿جَزَآءَۢ بِمَا كَسَبَا﴾ بۆ وان جزا ﴿نَكَٰلًا مِّنَ ٱللَّهِ﴾ بۆ خەلكي عِبرەت بگرن إقدام نەكەنە سەر دزي ﴿وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ ﴿٣٨﴾﴾ غالبا شت لە مواقعي خۆی دادەنێ مع أنّه إشعارێكی تریشي تێ دا هەیە بۆ سَیِّئاتي بَني إسرائیل گەورە گەورەكان دزیان كردبایە حَدیان لێ دەرنەدەكرد، حَدیان إجرا دەكرد لەسەر فَقیر و بێ دەسەلاتان. هەركەسێ دزي بكا، چ نێر چ مێ، گەورە گچكە، بۆیە پێغەمبەر فەرموي (بەوكەسەكەم روحي محمدي بەدەستە ئەگەر فاطمەي كچی محمد دزي بكات دەستي دەبرم) ﴿فَمَن تَابَ مِنۢ بَعْدِ ظُلْمِهِۦ﴾ چیتر دزي نەكا ﴿وَأَصْلَحَ﴾ إصلاحي نفس بكات ﴿فَإِنَّ ٱللَّهَ يَتُوبُ عَلَيْهِ﴾ خوا تَوْبەي لێ قبول ئەكا قَلَمي عفو بَركوناهي سابقي ئێنێ. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٣٩﴾﴾ بۆیە (تَوبە) قبول ئەكا، نەك سَلَّمَهُ السلام چی بكا بلێی خوا غفورُ الرحیمە، ئەوەخۆ هەلخەلەتاندنە. ﴿أَلَمْ تَعْلَمْ﴾ ئەي صاحبي إیمان یا ئەي رسولي خوا ﴿أَنَّ ٱللَّهَ لَهُۥ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ﴾ مالِكُ الملكە تصرف لە ملكي خۆي دەكا چۆن حەز بكا كەس نەتوانێ بلێ بۆ وا ئەكەي. ﴿يُعَذِّبُ مَن يَشَآءُ وَيَغْفِرُ لِمَن يَشَآءُ﴾ هەر كاتێ بە مَشیَّتْ وإرادەي خۆیەتي. ولكن بزانین لەكێ خۆش ئەبێ؟ كێ عذاب ئەدا؟ بۆ ئەوە تەماشاي قرآنبكەن ڕێ گر دەخالەت بكا (قبل القدرتي علیه) جَزاي چیە؟ دواێ چیە؟ دز ئەبێ توبە وأصلاحي نفس بكا، ئەوجا عفوي ئەكا. لە(مُعَرّي) نقل ئەكەن گۆیا إعتراض لەو حكمە ئەكرێ وئەلێ (یدٌ بخمسماءٍ مِنْ عَسْجُد وُدیَتْ مابالُها قُطِعَت في رُبعِ دینارِ) دەستی دیەتي بە پێنج صەد مثقال زێر داندراوە بۆ چی لەسەر چواریكە دینارێكی برا؟ (عَلَمُ الدِّینِ

سَخاوي) جواب ئـەدا (عِزُّ الأمانـةِ أغلاهـا وأرخَـصَها ذلُّ الخيانَـةِ فـافْهَمْ حِكمـة الباري) لە (إبن الجوزي) نقل ئەكەن جوابی دایە (لما كانـت أمینـە كانـت ثمینـة فلما خانت هانَت) هـەر كایەكـە دوو یـەكن، نـازانم لێكیـان وەرگرتیـە یـاتواردی خاطرە.

تا أمینە قیمەت دارە كە خیانەتي كرد إهانەكرا. بەلیّ لام وایە (مُعَرّي) ئـەم حكمەتە ئەزانیّ إعتراضي لە أصلي حكم نیـە لـە تقدیري مـالي مسروقە ئـەلیّ مادام تەماشاي قەدەري مالي مسروق ئەكـەن بـۆ تەماشـاي قیمـەتـي دەسـتي سارق ناكەن؟ وەبۆچی تەماشـاي حـالي صاحب مـالّ ناكـەن؟ پـیرە ژنـیّ دوو مریشكي هەیە رۆژیّ دوو هێلكە وارداتیەتي، دوو هێلكە بۆ ئەو بیرەژنە مقابلـي صەد لیرەیە بۆ بعـضە كـەس. صـاحبي شـریعەت ئەفـەرمویّ: لعنـەت لـەدزدا، بَیضە ئەدزیّ، دەستي ئەبردریّ). بۆچی حملي ئەكەنە كـلاو وخـودەي ئاسـن؟ ئەو إعتراضە بە أمینە وثمینـەو خانـت وهانـت دفـع نـابیّ. حَقـي اهانـە ئەوەیـە لەسەر أدنی شتەكي قطع بكریّ. أساسا كاكی (كۆر) طرفداری تعذیبي أشـقیایە دەربـارەي ضـعفا زۆر دلّ نەرمـە. اعـتراض لـە قـصاص لەدەسـت بـریـني دز لەرەجم لێداني زیناكەر لە مێژە گوترایە لە ئایەتـي قـرآن، جـوابي ئـە زانـدري. ئەگەر ئەو حدودە إجرا بكریّ عالـەم ئەكەوێتـە راحـەت. ئـەمرۆ ممـالكـي (إبـن السعود) بكەن لەگەلّ (ممالكي سائري دولي إسلام وغیرە إسلام) فەرقی زۆرە.

ئەوی ضرە ربە هَیكەلی إجتماعي بە عضوي عامل بێنیّ حَقـاً بـریـني لازمـە. ئەمە سەیرە (میرزا حسن بهاء الله) گوایە لەبەر ئەو أحكامانە ئـەلیّ شـریعەتـي إسلامي (ناقصە) دەستی دز برین وەحشَتە لەگەلّ زەماني مدنیت رێك ناكەویّ. ئایا ئەو (سَبُك مَغزە) وائەزانیّ ئەو نَقصە زانـي رسـالەت پـەنـاهـي ئـەو دەركـی كردوە؟ هەر بەرپشی خاوەني. ئەو قسانە هەزار سال پێش ئەو كرایە وەجوابي درایتەوە. ئەلیّ: مُقابلی ئەو نوعە جرائمە جزایّ نَقدي بـستێندریّ، گویـا ئـەوە حكمیّ كاملە وموا فقي حضارە تە. ئەوەش لە دولان وەرگیرایە زادە ي فكـري هُمایوني نیە وە حاجت ناكا لە ئاسمانەوە ئەو (وَحي) بۆبیّ. شریعەتي إسلامي

تەماشای صندوق پڕکردن ناکا، جزای نَقدي بۆ حکومەت لە شریعەت دا نیە. شریعەتي إلا هي تەماشاي لاي مَظلوم ومغدور ئەکا دز نەختێ مالي لي بستێندرێ بۆ حکومەت با چەند مانگێك حەپس بکرێ مالێ بڕاوو مالێ دزراو چ فەرامۆشیەکی پێ دێت؟ رضواني خودا لە (شافعي) بێ کە ئەفەرموێ دز دەستیش ئەبردرێ ومالەکەشی لێ إسترداد ئەکرێ، حقا، ئەمە خۆیەتی. ئەگەر أحکامي إلاهي إجرا کرابا ئەمرۆ لە جێی وەك (بَغدا) وسائري بلادي إسلامي قەحپەخانەو مەیخانە بە إیجارە ئەدرا؟ ئەو هەمو ژنانە توشي ئەو ڕەزالەت و وەقاحەتە ئەبون؟ حاشا. أمّا دیني إسلام دیني بو الهوس وبێ شەرەفان نیە، آمنا بالله وبدینە. ﴿وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ قَدِيرٌ ٤٠﴾ أما قُدرەتي خۆی بێ هودە صَرف ناکات، بە مقتضاي حِکمت هەر شتە لە موقعي خۆی دادائەنێ. (أصمعي) ئەلێ صورەتي (مائدە)م ئەخوێند (أعرابی) یەکم لەگەلێ بو لە ئاخري آیەتی سرقەت ووتم (والله غفور رحیم) أعرابي گوتي ئەو کلامە إی کێ یە؟ گوتم کلامي خوایە، گوتي ئەبیخوێنەوە دیسان وام خوێندەوە، دواي تَنَبّەم بوخوێندمەوە (والله عزیز حکیم) گوتي الآن إصابەتت کرد، گوتم بە چی ئەزاني؟ گوتي (یاهذا) عزیزی حکیم أمر بە قطع دەکا، ئەگەر لێرە ڕەحمي کردبایە وەلێ خۆشبایە أمري بە دەست بڕین نەدەکرد. کەوابێ دیارە بَلاغَتي قرآني (من حیث المعنی) بە فائدە ترە لە (من حیث اللفظ) فی الحقیقە مقصدی بلاغتي معنویە ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ﴾ فەردي کامل لە (پەیامبەري خوا) ﴿لَا يَحۡزُنكَ ٱلَّذِينَ يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡكُفۡرِ﴾ محزونت نەکەن ئەوانەي کە خۆشرۆي ئەکەن لەناو کُفري دا، کفر بویتە ظرف بۆ وان لە دلّیان دا ڕووچوە دەماري بۆهەمو أطراف وجوانبیاني داکوتاوە تیێ دا قەرار گیر بوین، تێ یاندا قەرارگریوە، مسارعە ئەکەن بۆ إطفاي نوري إسلام منعي عباد لە هدایەت تَنفیریان لە متابعەي تۆ، کەوابێ حاجەت نیە بلێین (فی) بە معنی (رانی)یە. یعني بە کردارو ڕەفتاري وان دەربارەي خۆت دلگیرمەبە ئەگەر چی

جێی حُزنه. زێرا جەنابي رسالەت زۆر عذابي له دەست منافقان دیت، دینیان له إنتشار عَوق ئەكرد، به إفتراو دەسیسەي وان عالەمێ زۆر له حضرەتی رسول متنفر بون. نەدیتو نەناسي بونه أشَدّ أعداء، أنّە خودا تَسَلّی ي ئەدا ﴿مِنَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِأَفۡوَٰهِهِمۡ﴾ لەوانەي ئەڵێن ایمانمان هینایه. ئەوقسه بەزوبانه ﴿وَلَمۡ تُؤۡمِن قُلُوبُهُمۡۛ﴾ بینما إیمانێی بەلایانەوە نەچوه. ئەو منافقانه جدیدن، إی پێش نزولي ئەو سورەته نین، ئەوان فەوتان. ﴿وَمِنَ ٱلَّذِينَ هَادُواْۛ﴾ هەم له جولەکان جوي (مَدینه) و(خَیبر) وەدەوران پشتی مدینه. نا، بەڵکو جوي أطرافي دوورتر وەإلاّ لەگەڵ ئەو قَولە کە ئەڵێن ئەم سورەته له (حجة الوداع) نزولی کردیه رێك ناکەوێ. زاتاً له أوَّلي رسالەت تا ئەمرۆ، وەلەمرۆ تا ئەمرۆ، هیچ زەمانێك خالي نەبوه له منافق وبَدخواها نەي إسلام، خصوص ئەمرۆ لەهەمو عصرێ خراپترە. منافقەکان پەردەي نفاقیان دري إظهاري رسالەتیان کرد گەلێ خەلکیان إغوا کرد. دیني إسلام بێ کەسه به تەواوي دوژمن کامي خۆي ئەبینێ ﴿سَمَّٰعُونَ لِلۡكَذِبِ﴾ ئەو مسارعانه گوێ رادەگرن له فەرمایشاتی تۆ بۆ خاطري درۆی پێوه بکەن ﴿سَمَّٰعُونَ لِقَوۡمٍ ءَاخَرِينَ لَمۡ يَأۡتُوكَۖ﴾ گوێ رادەگرن بۆ خاطري إغوای قومێ بکەن که ئەوانه نەهاتونەته لات بەدرۆ و دەلەسه بیان کەنه دوژمنی تۆ شەڕت لەگەڵ بکەن ﴿يُحَرِّفُونَ ٱلۡكَلِمَ مِنۢ بَعۡدِ مَوَاضِعِهِۦۖ﴾ ئەوەي له تۆي ئەبێن له مواقعي خۆي وەري ئەگێڕن ئەي گۆڕن. أمّا تحریفي (تورات)یان ئەمه معلومه.

﴿يَقُولُونَ﴾ جَواب بۆ ئەو قومه غائِبه ئەنێرن ئەڵێن ﴿إِنۡ أُوتِيتُمۡ هَٰذَا فَخُذُوهُ﴾ ئەشزانن ئەوەی له طرف پێغەمبەر بەوان ناگات. ﴿وَإِن لَّمۡ تُؤۡتَوۡهُ فَٱحۡذَرُواْۚ﴾ ئەوقومه بەگێدی وان ئەخەڵەتێن خِلافي سوپاردەي وان قبول ناکەن.

﴿وَمَن يُرِدِ ٱللَّهُ فِتۡنَتَهُۥ﴾ إختبارو إمتحاني وە دەرنەچىٚ، غَلٌّ غَشٌّ ودەغـەلّی بەدەركەوىٚ. ﴿فَلَن تَمۡلِكَ لَهُۥ مِنَ ٱللَّهِ شَيۡـًٔاۚ﴾ هیچت بە دەست نـابىٚ لـە طرف خواي بۆ ئەوكەسە. زێرِا جەنابي حَق عِبادي بە غایَتي سَهل إمتحان ئەكا، ئەوەي أسبابي رشدو هدایەتە بۆي پەیا كردیە لە حـواس لە عقل لـە إعتبـار، آیاتي بیّناتي بۆ إیضاح ئەكات چ طبیعي چ تشریعي لەسـەر ئـەو حالّە إهتداي نەبىٚ بە كىٚ هِدایَت ئەدرێن؟ كىٚ لطفي بەقەدەر خوایە؟ دەربارەي عبادي. كـىٚ بیاني وەك بیاني خـوا ئاشـكرایە؟ تـا بـۆى هدایـەت بـدرێت تكلیفـي إلاهـي بـە گوێرەي وسعي شخصە چ إعتقادي چ أعمالي. ئەو جۆرە كەسە بـدیهیات قبـول ناكا، جزم بە محالات دەینىٚ، چارەي ئەكرىٚ؟ حاشا.

﴿أُوْلَـٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ لَمۡ يُرِدِ ٱللَّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمۡۚ﴾ مع أنّە ئەگەر دلّی أدنـی أدنی قابلیەتێكی هەبا خـوا إرادەي پـاك كـردنـي ئـەكرد. حاشـا جـەنابـي حَـق خوداوەندي أرْحَم وأكرَم دلّی قابلي پاك بون بىٚ بە پیسی نایهێلّێتەوە. خلاصە كفر كە بوە ملكە رێی إیماني بۆ ناچىٚ مەگەر بە جَبري مَحض. خواي تعـالی نـە بۆ كفر نە بۆ أیمان جَبر ناكات، مُحَوّلي نظرو فِكري عِبادە، إختیاریـە إختباریـە ﴿لَهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا خِزۡيٌۖ﴾ ئابرویان ئەچىٚ نفاقیان دەرئەكـەوىٚ بـە نَـوعي كـە لاي قَومي خۆشیان سوك ئەبن گەمەیان پىٚ ئەكەن. حتّا مبشرەكانـي ئـەمرِۆ لـەناو خۆیان زۆر مُهانن أمّا بۆ ناو مسلّمانان و بعضە أقوامي دي نوعـاً مـا إحترامیـان ئەگرن، بەخێویان ئەكەن، ئەوەش مَحضاً سیاسەتە. سیاسیّوني أیّامـي ئێمـە دینیان كردیتە ملعبەي سیاسەتي خۆیان أصلاً إعتقادیان بە دین نیە.

﴿وَلَهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٞ ٤١﴾ كُنهـي، خـوا ئـەیزانىٚ ئەوەنـدە گەورەیە نایەتە بَیـان. ﴿سَمَّـٰعُونَ لِلۡكَذِبِ﴾ نـە تـەنها هەنـدە ﴿أَكَّـٰلُونَ لِلسُّحۡتِۚ﴾ حرام خۆرن ربا كارن بە أنواعي حیلەو دەسیسە استلاي مالّی عبـاد ئەكەن مُقابلي (تَوبە) پارەىٚ زۆر وەرئەگرن. لەو جهەتە لە نظر قَـومي خۆیـان

پروزاتیان دەرکەوتوە، لکن هێشتا حَماقەت لە بەینی عَوام حُکم فەرمایە ﴿فَإِن جَآءُوكَ﴾ بۆ فصلي قَضا ﴿فَٱحۡكُم بَيۡنَهُمۡ أَوۡ أَعۡرِضۡ عَنۡهُمۡۖ﴾ ئەوان مقصودیان بە حق گەیشتن نیە مقصودیان سماعي حُکمي تۆیە تا درۆی پێوە بکەن چ حکم بکەي چ حکم نەکەي ئەوان لە حَق تۆ لە بَدْ گۆي ناوەستن.

﴿وَإِن تُعۡرِضۡ عَنۡهُمۡ فَلَن يَضُرُّوكَ شَيۡـًٔاۖ﴾ هیچ ضرەر بە تۆ ناگەینن ئەگەر چی ڕێی طَعنەیان بۆ گوشاد ئەبێ، ئەڵێن ئەگەر پێغەمبەربا حکمەکەي ئەکرد، نەی وێرا. ئەو نوعە هَذیانانە بۆ أقوامي غائبە إفشا ئەکەن، خوا مفتضحیان ئەکا، خباثەتیان دەرئەکەوێ. ﴿وَإِنۡ حَكَمۡتَ فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِٱلۡقِسۡطِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلۡمُقۡسِطِينَ ٤٢﴾ حکم بە عدل بکە تەماشاي میولي وان وە إفساداتیان مەکە، چی ئەڵێن با بڵێن. ﴿وَكَيۡفَ يُحَكِّمُونَكَ﴾ بە دڵ، بەرضامەندي، بە حکمي تۆ. ﴿وَعِندَهُمُ ٱلتَّوۡرَىٰةُ فِيهَا حُكۡمُ ٱللَّهِ﴾ زێرا تَورات بعصه حکمي خواي تیامایە هەمویان پێ تحریف نەکرایە هەر حکمەکەي لە (تَورات) دابێ (قرآن) قبولي کردبي لاشَك حُکمي خوایە. من لام وایە حکمي خواي قابلي (نسخ) نیە إلا ئەوەي لەبەر إضطرارێکی طبیعي داندرابێ یا لەبەر لجوج وعِنادي قومێ شِدّە تي تیا بێ. ﴿ثُمَّ يَتَوَلَّوۡنَ﴾ لە حُکمي تۆ یا لە حُکمي تەورات مع أنّه گۆیا بەدران گرتویانە ﴿مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَۚ﴾ لەپاش ئەو تعصّب وأیمانە یا پاش مراجعەو تحکیمي تۆ ﴿وَمَآ أُوْلَـٰٓئِكَ بِٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٤٣﴾ نە أیمانیان بە تۆ هەیە نە بە تەورات وصاحبي تەورات. واقعاً ئەوە جێی تَعَجُّبە أمّا لە أمّتي ئێمەش ئەو نەوعە کەسە زۆرن گەر بزانێ بە شرعي ئەبیاتەوە، ئەڵێ شرعي خواو و پێغەمبەران خۆیەتي، قانون ومانون وطاپۆ وماپۆ چی یە، ئەدي ئەمە بە چی مسڵمانین ((أعَزّ الله الشرعَ الشريفَ)) ئەو دەستي شرع بی بڕێ خوني لێ نایێ ئەگەر بزانێ ئەي دۆڕێنێ بۆ محکمەي نظامي ئەچێ، بزاني

بە قانونی محکمە ئەی دۆرێنی طلبی تجارەت ئەکا، ئەگەر دەسەلاتی هەبێ بەزۆری بازووی مدعای خۆی ئەباتە سەر، شرعی چی قانونی چی تجارەتی چی في الحقيقة ئەوانە إيمان دار نین وإلاّ إطاعەی حکمی شرعیان ئەکرد ولو ماڵەکی زۆریشیان لە کیس چوبا.

﴿إِنَّآ أَنزَلْنَا ٱلتَّوْرَىٰةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ﴾ إرشاد ورووناکی تیایە حتی لە محّرفەکەش دا إرشادو نوری تیا ماوە ﴿يَحْكُمُ بِهَا ٱلنَّبِيُّونَ﴾ لە موسی تا عیسی کەوابێ ((نبي)) لێرە عامە لە رسول مقابلی ((نبي)) کلمەیە نی یە وەك مقابلی رسول هەیە یعنێ پێغەمبەر. ئێمە بە هەموان ئەڵێین پێغەمبەر چ راساً پەیغامی بۆ هاتبێ یا پەیغامی پێغەمبەرێ تر تبلیغ بکا ﴿ٱلَّذِينَ أَسْلَمُوا۟﴾ وێنەی حضرتی أبراهیم کە خوا فەرموی ((أسْلِمْ)) ووتی (أسْلَمْتُ للهِ ربِّ العالمين)) إستسلام وگەردەن دادان بۆ حکمی إلاهی زۆر ئاسان نی یە مرتبەیێ گەورەیە لایەقە ستایشی أنبیای پێ بْکرێ خصوصاً تعریضیشی تیایە بۆ ئەوانە کە حکم بە غیری ما أنزل الله ئەکەن ﴿لِلَّذِينَ هَادُوا۟﴾ بۆ یهودیان گەورە چ کچکە بێ فەرق ومیل ومحابا ﴿وَٱلرَّبَّـٰنِيُّونَ وَٱلْأَحْبَارُ﴾ ((قَتادَه)) ئەڵێ عُبادو عُلما ((مجاهد)) ئەڵێ ربّانیون علمای فقهان لە فوقی أحبارن یعنی وەك مجتهدین وعلمای مذاهبی ئێمە بَعْضی بە ولات وعلمایان تفسیر ئەکەن. (حِبْر) لە لُغەت مُشعِرە بە معنای جَمال وزینەت یعنی ئەوانەی کە علم مزَیَّنی وقیمەت دار ئەکەن وەك (حاكمي) إيراني (عَلي خان) لە حَق بابم وتبوی: (من مەلام زۆر دیون عِلم ئەوانی أرزُندە کردیە أمّا فلان ئەو علمی أرزُندە کردیە) حقیقة شرعی إلاهی بەو نَوعە مەلایانە حفظ ئەکرێ، نە بە ناکەسەکانی بی أصل وفصل وعِرقِی شَرَف ونجابەت. ئەوان علم بێ جمال بەڵکو ناشیرنی ئەکەن. ئەوانەش بۆ قەومی خۆیان حکم بە تورات ئەکەن، بێ تحریف و تبدیل ﴿بِمَا ٱسْتُحْفِظُوا۟ مِن كِتَـٰبِ ٱللَّهِ﴾ بەواسطەی ئەو عهدو میثاقە کەلەگەڵیان

کرابوو لە طرف پێغمبەران کە حفظي کتابی خوای بکەن. ئەوانیش لە حَقْ ئەو ئەو عهدەیان بە جیْ هێنا ﴿وَكَانُوا۟﴾ ئەو علمایانە ﴿عَلَيْهِ شُهَدَآءَ﴾ لەسەر کتابي خواي رقیب وچاوەدێر بوون رێی یان نەدەدا بەبەد مەیلان بیکەنە مَلْعَبَه ي هەواي خۆیان .

﴿فَلَا تَخْشَوُا۟ ٱلنَّاسَ﴾ کەوابێ ئەي علماي عصري سعادَة لە خلق مەترسن إتباعي أنبياء وأسما ربانیون وأحباري خۆتان بکەن، لە ترسان یا لە برسان حکمي خوا مەگۆڕن ﴿وَٱخْشَوْنِ﴾ لەمن بترسن ﴿وَلَا تَشْتَرُوا۟ بِـَٔايَـٰتِى ثَمَنًا قَلِيلًا﴾ خوا ئەزاني کە مەلا برسي بوو وەك ((حاجي قادر)) ئەڵێ ((قرآن بە دوو نانان ئەدات وناترسێ)) هەر دینێك کە تێك چوو لە مەلایاني بێ أصل وبرسي تێك چوو، ئەگەر زادەکان بووبانە مەلا قەت دین ذلّەتي نەدەدیت ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ حکمی صریح وصحیح ﴿فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَـٰفِرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ هەر ئەوان کافرن، لە کافر مُنکرو خراپ ترن وەك (خیّام) ئەڵێ:

((ان قوم کی پردە ي سجادە پرستند فرند
زیرا کی بە زیری باری سالوس دَرَنْر
وین أز هَمَد طُرفەتر کی ر پردەی زُهد
إسلام فروشندو زُکافر بَتّرنْر.. ))

لەو حُکمە فرق لە بینی هیچ مِلّە تا نی یە بەڵکو ئەو نوعە کەسانە لە عالەمي إسلامي دا گەلێ خراپ تر بوون لەواني جوو و دیان، ئایا کەسێ بڵێ من مسڵمانم ئەگەر تحریف وتبدیلي حکمي خوا بکا، هەر مسڵمانە؟ خۆشەویستە؟ معاذ الله. ! ئەو فەرق وجوداییە لاي خوا ني یە، أمّا شتێ هەیە لە دیني إسلام نازانم لەواني تر بوە یان نا، أولا ڕێ ی إجتهادي کردیتەوە بۆ أهلي علم، إستنباطي حکم لە کتاب وسنّە بکەن. ثانیا گەلێ مسائل حوالەي رأي إمام

ئەکات، واني يە هەمو أحكام بە صريحي لە قرآن يا لە حديث وەرگيرا بێ، بۆيە لە زەماني إمامي عمر تا ئيمڕۆ لەو أمورانە كە نَصّي إلاهي وەرسالەتي لەسەر ني يە، قوانين تنظيم ئەكرێن لەبەر ئەوە حُكم ئەكردن ((بما أنزل الله)) لە عالەمي إسلامي زۆر كەمە خصوصاً ئەگەر تەماشاي إستحسان وسَدُّ الذرائع مصالحي مُرسله بكەن عَدَمْ الحُكْمِ بما أَنْزَلَ الله زۆر نادر ئەبێ سَلَف و خَلَفْ لەو كُفره قسەيان كرديە منازەعەيان زۆرە، أمّا حقّ وحقيقة ئەمەيە كە ئێمە عرضمان كردن ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ﴾ لە تورات دا. ﴿أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ﴾ ولو پادشاهێ بێ مقابلي گەدايێ بە غەيري حق ئەگەر بي كوژي بي كوژنەوە. ﴿وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ﴾ چاوبەچاو ئەكوڵدرێ، ﴿وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ﴾ لووت بەلووت ﴿وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ﴾ گوێ بە گوێ ﴿وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ﴾ ددان بە ددان ﴿وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌ﴾ برين، بە گوێرەي خۆي، برين، ﴿فَمَن تَصَدَّقَ بِهِۦ﴾ بە قصاص يعني عەفوي ئەكا ﴿فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَّهُۥ﴾ خوا بە مقابلي ئەو عەفوە عەفوی ئەكا لە گوناهاني خۆش ئەبێ ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ لە قصاص ﴿فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّـٰلِمُونَ ﴿٤٥﴾﴾ أساساً شرائع وحكومات خاصةً كە أحكامي جزائي دا بۆ حفظي بێ دەسەڵاتانە لەشەڕي زۆر داران، كەچي بالعكس مُعظمي رجالي حكومەت وملەت لە أكثري أزمان وأعصار طرف داري أقوياء ئەكەن، كەسێ ضعيف بێ كەسێ بێ هەرچي بەسەري بێ أهميەتي نادەنێ آن زيادە ظالم وغدّار محاميەكانن، ئەوی بێ دەسەڵاتە دوعا بكا خوايە لێم نەقەومێ ﴿وَقَفَّيْنَا عَلَىٰٓ ءَاثَـٰرِهِم﴾ بە دواي شوێني ئەو أنبياو و ربّانيون وأحبارانەمان خست ﴿بِعِيسَى ٱبْنِ مَرْيَمَ﴾ كەوابي ئەو، داخلي ئەواني پێش و ني يە، وەك موسی، ئەواني حُكميان بە تەورات ئەكرد، حفظيان ئەكرد لە بيني ئەو دوو ذاتە محترمانە دابوون.

﴿مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ﴾ يعني ئەوەي كە ئەي زاني بَقِيَّە ي كلامي خوايە، نەك مُحرّفات ومُلحقات، چي حضرتي عيسى چي حضرتي محمد(صلى الله عليه وسلم) بەو نەوعە تصديقي تەوراتيان ئەكرد، پيس وپاكيان لێك ئەكردەوە ﴿وَءَاتَيْنَٰهُ ٱلْإِنجِيلَ فِيهِ هُدًى وَنُورٌ﴾ وەك تەورات، طبيعي هەر كتێبێ لە طرف خواوە بێ، ئەبێ وابێ ﴿وَمُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ﴾ ئەي أنجيل. ﴿مِنَ ٱلتَّوْرَىٰةِ﴾ ئەو تصديقە تصديقي مُنزلي إنجيلە ﴿وَهُدًى﴾ ئەو إنجيلەكە بو عيسى نازل بوو بوو، هەمووي هيدايەت وإرشادە چي بێني ضلالي لێ بێ تياي نەبوو، أب وأبن وروح القدس يۆك. ﴿وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٤٦﴾﴾ ذاتاً ئەوي لا أبالي بێ لە موعظة ناتۆرێ، متأثر نابێ ﴿وَلْيَحْكُمْ أَهْلُ ٱلْإِنجِيلِ بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فِيهِ﴾ ئەگەر راست ئەكەن أهْلن تابعي أحكامي أنجيلن، إيمانيان هەيە كە لە طرف خوا بۆ عيسى ناردراوە ﴿وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ﴾ چي دائر بە إعتقاديات چي بە أعمال، چي بە تربيەو آداب وأخلاق، ﴿فَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَٰسِقُونَ ﴿٤٧﴾﴾ خارجن لە إيمان بما أنزل الله خصوص ئەوەي خلافي تربيەو تأديبي إلاهي رەفتارو حكم بكا بەجارێ ئەبێ بە خليعي، محاسن بە قبائح ئەگۆرێ، وەك مسيحيەكاني ئەو عصرەي أوروپی بە جارێ لە مآثري بشري رووت بوين هەرچەند شرورو فسادي سەر عەردي هەيە مادّي ومَعْنوي لەوان نشأة ئەكا بە أحكامي تورات بە أحكامي أنجيل ذەرێي أعتبار ناكەن، لەهەر كسوەيێ دابن طَمَعْ مُجَسَّمن، نەغيرەت نەناموس، نەوەفا بەعهد، ئەگەر مشرف لە ميموندا هەبێ لەواندا نيیە، باوجودي خۆيان لە أولادي مەيمون حساب ئەكەن.

﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ﴾ فەردي كامل قرآني كريم فُرقاني حكيم ﴿بِٱلْحَقِّ﴾ سەراپا لە لباسي حەق دايە ﴿مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ﴾ (تورات) و (أنجيل) ﴿وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ﴾ رەقيبە پاكيان ئەكاتەوە لە أباطيل لە مُلحقات لە

أحکامي (کولیناني). ﴿فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُۖ﴾ لە بیني أهلي کتاب جوو دیان سائري وان ﴿وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ﴾ دوای هەوەسي وان مەکەوە، ئەوي مەیلیان لێ بێ وایان حکم لە بەین بکەي وەلَو بۆ إستماله بێ، بەو وەسیله عدول بکەي ﴿عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡحَقِّۚ﴾ کەسێ دوای هەواو هەوەسي ئەوانە بکەوێ، دواکەوتووە لە حەق ﴿لِكُلّٖ جَعَلۡنَا مِنكُمۡ شِرۡعَةٗ وَمِنۡهَاجٗاۚ﴾ بۆ کلێ لە ئێوە ئەی أُممي صاحِب کتێب شریعەت ومنهاجێکمان بۆ داناون لەگەڵێ أحکامي مُختلِفە. بۆ خاطري بزانن منشأي ئەو إختلافە إختلافي مشاربُ ومیول وأمزجەي بشرە، (مِنکُم)ي لە (جعلنا) تأخیر کردیە. زاتاً مشرەبي حکما وایە تا ممکن بێ جهەتي کثرە ت لە معلول دا إعتبار ئەکەن. شرعەت وشَریعەت لە أصلا بە رێێ ئەڵێن بچێ بۆ سەراو، مِنهاج بە رێێ واضح ئەڵێن وەکی جادّەو شەقام. لاشك ئە رێگای لە طرف خودا بۆ عِباد دانرێ واضِحە کەسي لێ بزر نابي، ئەوي خۆی بزر نەکا، وەئەیبا بۆ سەر ئاوي حیاتي دنیوي وأُخروي ﴿وَلَوۡ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمۡ أُمَّةٗ وَٰحِدَةٗ﴾ لەسەر دینێ ئەبون. شَرعي تکلیفي تابِعي شَرعي تکوینیە، أمزجەي طوائفي بشر مختلفە، بُقاعي أرضي مختلفە، زەمان تبدل وإختلافي ئەبێ، بناءً علیە شرعێ واحد بۆ عمومي بشر نابێ. ئەگەر دین دیني إلاهي لەیەك دین ئەو أحوالانە رعایەت ئەکا، ئەبێ. وەك دیني إسلام تکلیفي زماني گەنجي، لەگەڵاَ زەماني پیري جوایەزە، أحکامي سفر و حضرو سفر جوایەزن، وەگذا صاغي ونە صاغي. ئەوي بەچاوي إنصاف تەماشا کا إیمان دێنێ کە شَرعەتي إسلامي بە گوێرەي طَبیعەت داندراوە. مادام صاحبي شِرعە تي تکَویني وتکَلیفي یەك بێ، ئەبێ وابێ. بشر وەك سابقا زاندرا أُمّەتي واحد بوو، میزاج وطَبیعهتي ساذج بوو، وەك منالێ تازە پێ بگا، دوایێ بە گوێرەي رووکردنە حَضارەت میولي زیاد ومختلف بو، بە گوێرەي ئەو سَذاجَتە قابلِە بَشر بکرێ بە أمّەتێ واحِد. أمّا نظر بە حالَي حاضر لە دائرەي إمکان

چویتە دەر. هەرچەند پێغەمبەراني عِظام مُصلحيني كرام خريبنەوە ناتوانن إتحادێ عام لە بيني بَشرَ پەيدا بکەن، نەلە دين، نەلە تجارەت، نەلە سياسەت. تا فاطِرِي حَقيقي فِطرەتي بشر نەگۆرێ ئەو إتِّحادە قابل نيە. خوداي تعالان بەهەمو عِلم وقُدرَت وحِكمە تي خۆی سوپاس وستايشي خۆی ئەکا کە إتحادي هاويشتە بەيني (أوس) و (خزرج) فَكَيْفَ حالي بَشَر؟ بالخاصة رُأساي أديان وە رُأساي سياسەت ئەو أمَلَيان لە دماغي مُصلحِان نەهێشت. ﴿وَلَٰكِن﴾ جەنابي حەق ئەو شرايعەي دانا.

﴿لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَآ ءَاتَىٰكُمْ﴾ تجرەبەتان بکا، چی ئەکەن؟ وە ئەو کتاب ودينە چۆن مُحافظە ئەکەن؟ دين ئەکەن بە وەسيلەي چی؟ ﴿فَٱسْتَبِقُواْ ٱلْخَيْرَٰتِ﴾ مادام وابێ ئەگەر ئێوە راست دەکەن ايمانتان بە وَحدانيەتي خواو حَقيقەتي نبّوەت هەيە مُسارعە بکەن بۆلاي چاکە، تێ بفکرن بە عَقل وعَدل وإنصاف چی چاکە ئەوە بکەن، لە پاش ثبوتي نبّوەت وتفريقي أوهام وخيالات وأفكار. حاكميەتي عقل قابلي إنكار نيە، عقل ئەزاێ چ چاکە چ خراپە، أولا سعي بکەن عقل لە چەنگ ميول وأوهام وخيالاتي فاسدە نجات بدەن، دواێ رێ بە چاکە ئەبەن، بێ خلاف وشِقاق، ئەگەن بە مقصد.

﴿إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا﴾ بَدأي وجود لەوێيە گەرانەوەش بۆ لاي وێيە، کێ هەيە؟ بۆ چی بۆ خەلقێ وەکي خۆت يالەخۆت بەرەژێرتر خۆت لە خواي خۆت ئەکەي؟ بۆچ وەك (سەندەقوق) خۆت ئەکەي بە واسِطە لە بەيني خواو عِبادي خوا؟ تۆ نەبي خوا ئەوعِبادەي ناوي؟ رێی خودا نيشان بدە توش وەکي خەلْکي پێی دا برۆ، نهايەت حەقي إرشادت هەيە، کەس حەقي ألوهيەت وربوبيەتي لەسەر کەس نيە ﴿فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ٤٨﴾ جَزاتان ئەداتەوە، ذاتاً مَقصد لەو إنبايە ئەوەيە ﴿وَأَنِ ٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ﴾ بۆ صاحبي حکم، حکمي بالحق والعدل، بێ مەيل ومحُاباو فەرق لە

بەینی خۆیش وبیٚ گانەو دۆست ودوشمن، لە فَوقي هەمو خێرانە.

لە عَطفي (وَأنْ) قسەیان زۆرە کأنّهُ ئەفەرموێ: (یا رسول الله سبقي إلی الخیر بکە وە لە بەینیان دا حکم بما أنزل الله بکە).

ومَقصد لە إعادەي ئەو أمرە ﴿وَٱحۡذَرۡهُمۡ أَن يَفۡتِنُوكَ عَنۢ بَعۡضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَۖ﴾یە. خۆتیان لیٚ بپارێزە قَومیٚ شَیطانن وەرت نەگێرن. لە بعضي أحکامي خواي ﷻ بۆلاي توي ناردوە، بلێن بۆ إستماله لازمه مُساعدەي گەورە گەورەکان بکریٚ، ئەبن بە قَوتُ الظهر، چوکەلەکان تابع ودواي گەورەکان ئەکەون، ئەوان راضي بکرێن، ئەمان هەر راضین. ئاگاداري خۆت بە لەسەر ئەو حالەي نەگورێی گویٚ مەدە سفاسفي وان، تۆ حکمي خوا بەجیٚ بگەیێنە. ﴿فَإِن تَوَلَّوۡاْ﴾ جیرو جهنم با إعراض بنێن چ زیاني تۆي تیانیە. ﴿فَٱعۡلَمۡ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعۡضِ ذُنُوبِهِمۡۗ﴾ ئەگەر ئەوانە إعراضیان کرد لە متابعەي حُکمي تو، بزانە هیچ علەتي تري نیە إلاّ ئەوە نەبیٚ کە خوا إرادە ئەکا جزاي بعضە گوناهیان پیٚ بگەیەنیٚ لە دونیا بە نَوعیٚ کە هەمو کەس بزانیٚ ئەوانە (أبناء الله وأحباء الله) نین ﴿وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ ٤٩﴾ ئەوە إشارەتە بۆ عِلّةُ العلّة یعني سبب بە خروجیان لە إطاعەي کَلیمي خوا، خوا ئەو إرادە ئەکا ﴿أَفَحُكۡمَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ يَبۡغُونَۚ﴾ ئەوانە لاي خۆیان خوا پەرستن صاحیبي شرعەت وکِتابن، دینیان دینیٚ سماویە، ئایا ئەوانە لەسەر ئەو حالّە حکم بە مَیل

و مُحاباو مُتابَعهي هَوا کە حکمي مِلّتي جاهل وبیٚ دین وشرعەت وکتابە ئەوخوازن طلب ئارەزو ئەکەن، حقیقة جێی إنکارو تعجبە. ﴿وَمَنۡ أَحۡسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكۡمٗا﴾ مادام واضعي قانون بَشَر بیٚ وَلَوْ لە سەرامەداني حکما بیٚ، خالي نابیٚ لە میل وتَعَصّب، أمّا حُکمي خواي وانیە، نابیٚ وابیٚ. هەر حکمێکی وابیٚ حُکمي خواي نیە. حکمي أعقلي بشر نظر بە حُکمي خوا حُسني نیە، فضل لەوە کە

مساوي يا أحسن بێ. عقل ولَوْ إدراكي حُسن وقُبحي أشيا بكا، لكن لە دەست قُرَناي سوّي، زۆر بێ دەسەڵاتە زوو سست ئەبێ دواي هەواي نَفس ئەکەوێ. رُأساي (مُعتَزِلات) لەبەر صفاي إيمان وقوەتي عقلي إسلامي خۆيان ئاگايان لە هەواو هەوەس وأحوالاتي روح ونَفسي عُقلا نيە، بۆيە عقلّ ئەکەن بە حاكم، مع أنّه لاي وان حاكمي كُلْ في الكلْ نيە، لايان عقل محتاجە بەهدايەتي سَماوي و وەحي إلاهي. كێ هەيە حكمي لە حكمي خوا جوانتر بێ؟ ئەمەش ظاهر وئاشكرايە. ﴿لِقَوۡمٖ يُوقِنُونَ ٥٠﴾ بۆ قومێ لاي قومێ كە أهلي (إيقان) و (إذعان) بن وە (تَدبُّرْ) لە أشيا بکەن چاويان لە تحقيقي حق بێ.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ على العموم ﴿لَا تَتَّخِذُواْ ٱلۡيَهُودَ وَٱلنَّصَٰرَىٰٓ أَوۡلِيَآءَۘ﴾ جو وديان مەگرن بە دۆست مەيلي قلبيان مەدەنێ ﴿بَعۡضُهُمۡ أَوۡلِيَآءُ بَعۡضٖۚ﴾ جو بۆ جو، ديان بۆ ديان. أمّا جو لەگەلّ ديان، ديان لەگەلّ جو قط دۆستايەتيان نابێ. ئەگەر چي بعضاً جِلوەي سياسەت وا إيجاب ئەکا دەولّەتێ إظهاري (وَلا) بکا دەرهەقي جولەکان وەك حكومەتي (إنگلیز) دەربارەي (يهودي فلسطين) أمّا (وَلاي) قلبيان نيە، مع أنّه سياسەت لەگەلّ محبت وصداقەت هيچ رابطهي نيە.

﴿وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمۡ فَإِنَّهُۥ مِنۡهُمۡۗ﴾ خويان ئەگرێ حكمي خوايان لاسوك ئەبێ. ئێوە بە مُتابعەي هەواي وان، روو لە تَحريفي قُرآن ئەکەن، بەمَيل ومحُابا تَفريقي أحكام ئەکەن لە بەيني گەورەو گچکان لە دين مُغالات ئەکەن. خۆتان بە أولياو أحباي خوا ئەزانن بە نسب مغرور ئەبن حقيقة ئەمانە هەموي تَحريفي عبارەتي قرآن ئەگەر چي پێی نەبو أمّا تحريفي مَعنوي زۆر زۆر پێی بووە. لو عَصري ئێمە محبّەتي ئەوروپاييان أثري سوّي دەرکەوت، هەرچي مَيلي واني هەبێ أصلا قِمهتي ديني إسلامي لا نيە. لە هەمو آداب وشەرەف ومحاسني بشري خۆيان تجريد ئەکەن ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلظَّٰلِمِينَ ٥١﴾ ئەوسا رێتان لێ ئەگۆڕێ لە مصالحي دين ودونيا محروم ئەبن، ئەبن بە مَسخَرە، ولاّتتان

ئەكەنە مُستعمره، بە واسطەي ئەو ظُلمە كە لە خۆتاني ئەكەن، خوا هیدایەتتان نادا، رێی نجات نادۆزنەوە، بەڵكو بالعكس لەم وادي ضلالە زیاتر ڕوو ئەچن.

﴿فَتَرَى ٱلَّذِينَ فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ﴾ ئەوەي ببینێ، ئەبینێ، ئەوانەي كە لە دڵیان دایە، نەصاغي، بە سبب عداوەت وحسد، یاحُبّي راست. ﴿يُسَٰرِعُونَ فِيهِمۡ﴾ لەناو واندا مُسابقە ئەكا بۆ عرضي (وَلا)و (مُحبّت)و (جان سُپاري). ﴿يَقُولُونَ نَخۡشَىٰٓ أَن تُصِيبَنَا دَآئِرَةٞۚ﴾ ئەڵێن ئەترسین بەلاو مصیبەتمان توش ببی ئەگەر دۆستایەتیان نەكەین. تەماشاي تأریخي إسلام بكە كەمێ پاش زەماني (سَعادەت) تا ئەمڕۆ مسڵمانان لە ڕووي دۆستي غَیرە دین چیان بەسەر هاتووە، وە ئەمڕۆش لەسەر ئەو هەموو ذلّەت وحقارەتە كە بەسەر مسڵمانان دا هات، گەلێ لە رِجالي سیاسەت مُسارَعە ئەكەن لە (وَلا)و بەندەگی ئەو أجانبانە، مع أنّە ئەگەر لەگەڵ راست ومخلصەكاني ملّت ووطن پێك بێن، أملي نجات زۆر بە قوەت دەبێ. ﴿فَعَسَى ٱللَّهُ أَن يَأۡتِيَ بِٱلۡفَتۡحِ﴾ ئەگەر مسڵمانان بە طریفي بەخەبەر بێن یەكدي بگرن نزاعي (مَذْهَب) یان لە بەینا نەمێنێ، نێزیكە خواي تَعالی فَتح وفتوحێ بێنێ، دەركەي رەحمەت لەمسڵمانان بكاتەوە، لە پاش ئەو مَغلوبیە غالب ببن، دارودیاري دوشمن إستلا بكەن، أمّا ظاهري حال ئەوە ئەگەر محال نەبێ، زۆر دوورە.

علاوەي أختلافي (مذاهب) إختلافي (قومیەت) و (عنصر) (شقاق) و(نفاق) پێغەمبەري (قادیاني) و (بَهائي) و (بابي) هاتنەناو. هَیْهات بۆیە خوا ئەفەرموێ (عَسی) ﴿أَوۡ أَمۡرٖ مِّنۡ عِندِهِۦ﴾ خودا شتێ وابكا كە بەخَیالي بَشَردا نەیە ئەو رُأساي كُفرو ضَلال نابوت بكا، ئەو وەختە مسڵمانان بە مەدەدێكی مَحْضي إلاهي لەو ئەسارەتە نجاتیان ببێ.

﴿فَيُصۡبِحُواْ﴾ ئەو دڵ نەخۆشانە ﴿عَلَىٰ مَآ أَسَرُّواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ﴾ لە حِقد وحسد بەلكي جَحدي رسالتي مُحَمّدي وەحەقیەتي دیني إسلام ﴿نَٰدِمِينَ ٥٢﴾

أُمێدمان هەیە بە ألطافي خوا، خوا چارەي مسلّمانان بکا (بأَحَدِ الطَّرِيقَين) خالصەکان نجاتیان ببێ، غش دارەکان پەشیمان ببنەوە. بزانن ئێمە بەو نَوعە تفسیري ئەو آیەتانەمان کرد نەك بە گوێرەي زەماني پێغەمبەري، چونکي ئەو سورەتە پاش فتوحاتي زەماني (سعادەت) نزولي کرد ئیتر تأمل بکە لە ضیعي مفسرەکان وەروایەتي آسابي نزول.

﴿وَيَقُولُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ﴾ دەربارەي ئەو دلّ نەخۆش وپەشیمان بونەوەکان. ﴿أَهَٰٓؤُلَآءِ ٱلَّذِينَ أَقۡسَمُواْ بِٱللَّهِ﴾ بۆ ئێوە یا بۆ دۆستەکانیان ﴿جَهۡدَ أَيۡمَٰنِهِمۡ﴾ سوێندێ بە دلّ کأَنَّهُ سَعي تیا کراوە تابەدەست کەوتوە، نەوەك (لَغْوَ اليَمِين) سەر زارەکي ﴿إِنَّهُمۡ لَمَعَكُمۡۚ﴾ ئەوان لەگەلّ ئێوەن ئەي أهلي إیمان یا ئەي أهلي کتاب، لە جوودیان. نقلي ئەو سوێندە بالمعنی یە ئەگەر بە عَیني عبارەت با، ئەي فەرموو (إِنَّا) لە جیاتي (إِنَّهُمْ) لە محاورات هەر دوو نَوعە نقل جاریە، ئەلّێ فلان سوێندي خوارد (ئەمە ئەکا) یا (ئەکەم). ﴿حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فَأَصۡبَحُواْ خَٰسِرِينَ ٥٣﴾ ئەو جملەیە قابلە بلّێین لە طرف (مُنَزِل القرآن) بێژراوە، وە قابلە بلیَین قَولي مسلّمانەکانە. ئەو سعي وکۆششي کردیان بۆ جَلبي رَضاي أعداي (دین ودَمْ)، هیچ وپوچ دەرچو، وایان ئەزاني ئێوە لە بێ دەسەلاتي دا ئەمێنن. لِله الحمد خودا إنقلابێ واي کرد، ئێوە بونە صاحبي فتوحات تشکیلي دەولّەتتان کرد، ئەو گروهە خائننانە، خائب وخاسر بون، تیاچون زەرەریان کرد. خودایە بۆ مسلّماناني ئەو عَصرە لە شرق وغرب إنقلابێ بنوێنێ ئەو نَوعە کەسانە پەشیمان ببنەوە، سَعی وکۆششیان لە خدمەت کاري (أعادي) بە هەبا بڕوا، دەستەو ئەژنۆ وە ڕەنجەڕۆ بن.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ مَن يَرۡتَدَّ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ﴾ سَوادي أعظم لە قەومي نجیبي (عەرەب) أنتظاریان ئەکرد آیا عاقبەت بۆ کُفّاري قُرەیش ئەبێ؟ یا بۆ حضرەتي محمد؟ لە تقدیري أول باشە، هەر کەس لەسەر ئاین ورەوشتي خۆی

ئەمێنێ، لە تقدیري ثاني ئەچن بۆلاي پێغەمبەر ومسڵمان ئەبن. لە پاش فتحي مکە گروە گروە ئەهاتن أیمانیان ئـەهێنا، ئەڕۆیشتنەوە، ئەوەنـدە لـە خدمـەت صاحب رسالەت دا نەدەبون کە إیمان بەتەواوي لە دڵیـان قـرار بگـرێ و مَحْکَمْ بێ. لەپاش ئەوە کە حضرە تي (رەسول) وەفاتی کرد مُعظمیان مرتد بـون لـە دین گەڕانەوە، لاشَك مقصد لەو خِطابـە ئەوانـەن. عـلاوەي ئـەو رِدَّەتـە، چـەند کەسێ دەعواي رسالەتیان کرد وتبعەیٚ زۆریان بو، حتّـا خـاتونێ (سُـجاح) نـاو دەعواي رسالـەتي کـرد وەخـەلقێ زۆر لـە رجـالي قـومی غـَیّـوری عـەرەب دواي کـەوتن تابـە (مُـسیلمهي کـذّاب) بـە گانیـان دا. خـوا ئەفـەرموێ ئـەي ئـەوانـي إیمانیان هێناوە ئەوەي لە ئێوە بگەڕێتەوە لە دیني خۆي هیچ أهمیـەتـي نیـە، دینی إسلام بەرِدّەتي ئێوە خَلَلي پێ ناگا.

﴿فَسَوۡفَ يَأۡتِي ٱللَّهُ بِقَوۡمٖ﴾ لەمـەودوا خـوا قـەومێ دێـنێ ﴿يُحِبُّهُمۡ وَيُحِبُّونَهُۥٓ﴾ خـوا ئەواني خۆش ئەوێ ئە وانیش خوایان خۆش ئەوێ. محبەتي خوا لە حەق عِباد چی یە؟ محبتي عبـاد لـە حـەق خـوا چـی یـە؟ چـی گـوفـت وگۆیـە، ئەمەیـە. (مـتکلمین) بعـضـي تفـویض ئەکـەن، بعـضـي تأویـل. (صـوفیە) بـێ تفـویض وتأویل، حقیقەتی، إدّعا ئەکەن، ئەڵێن ذوقـی (ابـن تـي نَـشْناسي بـە خـودا تـا نەچشتی). حقیقة مُحَبّـەت چـشتێ ذوقیـە تعریـف نـاکرێ. من ئەوەنـدە ئـەڵێم محبّـەت بـۆ إطاعـە لـە هـەمو دەلیـل وبُرهـان بـە قـوەت تـرە، بۆیـە ئەوانـەي دەعوەتي (ناس) ئەکەن بە نـاوي (مَـسیح) یـا (عَلـي) یـا (شـیخێ لـە شـیوخی طَریق) تەمامي قوەتي خۆیان، لە إلقاي محبەتـي ئەوانەیە بۆ ناو دڵـی عِبـاد. ئەمڕۆ (ژاپۆنیا) نوعە محبتـەکي ملکـي خۆیـان هەیـە بـە أمرێکـی ئـەو خۆیـان ئەهاوێنە ناو ئاگر. وەعَیني سَعي ئەکەن بۆ بغضي حـضرةتي محمـد وأبـو بکـر وعمر وعلمایانی راسخي إسلام کەئەو مُحبَّت وبغضە لە دلي داگیر بووە، قطعیـاً روناکاتە حەق بەهەزار گورزي گران ئەو دڵە نەرم نابی.

﴿أَذِلَّةٍ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ﴾ لەسەر إیمان داران نـەرمن. نەرمـە خێـری؟ نـا نـەرمـي

تواضـع ورفـق ومرحمـەت. ﴿أَعِزَّةٍ عَلَى ٱلْكَٰفِرِينَ﴾ غـالبن بـە قـوەت وقـدرەت و شِدَّەتن ﴿يُجَٰهِدُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ﴾ لە رێی خوا غـەزا ئەکـەن مَحْض بـۆ رەضـاي مَولا إعلاي كلمة الله إنقاذي بَشَر لە شەڕ ﴿وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَآئِمٍ﴾ لـە هـیچ کـاري إلاهي باكيان بەسەر زەنیش لائمان نیە. ئەواني مُصلحن ئەبێ وابن، نەك دڵ بە خرتوپرت ئەگەر وابکەم وادەڵێن ئەگەر وانەکـەم وادەڵـێن، ئـەو کەسـە دڵیـشي نارِحەت ئەبێ چشی پێ ناکرێ. ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەوي ذکر کـرا لـە أوصـافیان خاصـة وصفي أخير ﴿فَضْلُ ٱللَّهِ﴾ إحساني خوایـە ﴿يُؤْتِيهِ مَن يَشَآءُ﴾ خـاص بـە قـەومێ (دونَ) قَومي، شخصێ (دونَ) شخصی ﴿وَٱللَّهُ وَٰسِعٌ عَلِيمٌ ﴿٥٤﴾﴾ جـودو إحسانـي زۆرە فراوانە. ترسي براني نیە، ئـەزانێ کـێ لایقـە بـۆ ئـەو أوصـافە. ئایـا ئـەو قەومـە کـێن؟ زۆر قـسەیان کـردوە حتّـا شَـیعي (علـي) ئـەڵێن ئـەو قەومـە خۆشەویستە إمامي علي وَعَسْكَري ظفر پێ گرتی لـە حـەربـي (جمـل وصـفین). پف یاخوا مبارەك نەبێ ئەمەیە جهادي في سبيل الله کە پـشتی إسـلامەتـي پـێ شکا؟ بعضي لەوان ئەڵێن ئەو قومە (مهدي) وأتباعیەتي، با بمـرن لـە إنتظـارا، مهدي ناوبیر خنکا، مهدي کە ئەڵێن لە (مکە) ظهور ئەکا تا ئەمڕۆ نەهاتوە لـەم رۆش بەولاوە تا حکومەتي (وهـابي) لـە حجـاز دابـێ، هـیچ. رەنگـە مرتـدەکان پاش إستلاي (إبن السعود) بە وهابیان تعبیر بدەنـەوە، ئەوانـە هَـذَیـانن. پـاش وەفاتي رەسولي أکرم کێ مرتد بون؟ وەچی قەومێ چارە سازي کـرد؟ بـاعثي غیرەت وهِمەت وعَزم وثُبات وإقدام کێ بو؟ تأریخ شاهدە. روایەتي ئەم وئـەوي چ پێ دەوێ؟ چەند أصحابەێ گوزین شاهدي ئەدەن ئەگەر أبـو بکـري صـدیق نەبایە دینی إسلام لەگەڵا صـاحـبي ئەچـوە قـەبري (ذلـك فـضل الله یـؤتي مـن یشاء).

﴿إِنَّمَا وَلِيُّكُمُ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟﴾ هـەر ئـەوان ناصـرو ظَهـیر وپـشتیوانـي ئێوەن، أجانب بۆ ئێوە کەڵك ناگرێ، خاصة کە سیاسەت غلبەي کرد، طمعیـان

غالب بوو، هەرچی بیکەن بۆ خۆیان ئەکەن. ئەو مؤمنانە ﴿ٱلَّذِينَ يُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ﴾ بەتەواوي بە جێی ئەگەیێنن ﴿وَيُؤۡتُونَ ٱلزَّكَوٰةَ﴾ زەكاتي مشروع ﴿وَهُمۡ رَٰكِعُونَ ٥٥﴾ خاضعن بۆ أمري إلاهي بە نَفس ودڵ پێ یان خۆشە زەكات بدەن، یاخود خۆیان بە (دون) ئەزانن بەرەژێرتر ئەبینن لەواني زەكاتیان ئەدەنێ مَنّ وأذی وخۆهەڵكێشانیان نیە. خلاصەي رابطە ي مادّي ومعنویان (علی وَجه الكَمال، بَلْ الأكمَلْ) لەبەینا بە قوەتە.

مَعناي راستي ئەو آیەتە ئەمەیە، ئەوەي ئەڵێن ئەم آیەتە دەرحەق حضرەتي علي نازل بووە وەقتێ كە ئەنگوستیلەیێكی دابە بە فقیرێ سائل لە وەقتي ركوعي نوێژ، قسەێ بێ ناوكە، مَقام مُناسبەي لەگەڵا ئەوە نیە. ئەنگوستیلە بەخشین لە وەقتي ركوع ئەوەندە قیمەت دار نیە شخصێ پێی ببێتەوە (ولّي وناصرو متصرف في الأمور) یعني خلیفە ي كبریاء، ئەو نوعە كەسە منحصراً ببێ بە خَلیفە، كەسێ هەمو مالي خۆی لە رێی خوا صرف بكا ئەبێ ببێتەچی؟ ئەبێ بە هەزار مَرتَبە لە فَوقي خَلافەت بێ. ئەنگوستلەێ نە دوڕ بووە نە ئەلمّاس، نە زوبەرجەد بووە نە عَقیق، نە جَزَعي یَماني، نە عقیقي بەد أخشاني بەخشیني و نە بەخشیني چی یە؟ وەأموالي روحیەي حضرتي (علي) لە آني نوێژ كردن كە (سَعدي) ئەڵێ:

(جان سوز دَر نماز جِهان سوز دَر وَغا)

لەو حاڵە دوورە. وەلەبەر مراعاتي جهەتي وەحدەت (وَلـیُكُمْ) ئەفەرموێ بە إفراط نافەرموێ (أولیاءُكُمْ). حاصلي لەو أهلي إیمانە نە (علي) بە خصوصي مقصودە نە(أبو بكر). لە زەماني نزولي ئەم آیەتە جارومجروري خلافت نەبو تا بڵێین بەو آیەتە كامیان مُرشّح ئەكرێن. ئەمڕۆ ئەم منازعاتە لە بەیني فِرەقي إسلام زۆر عَیب وشورەي یە، إسلام بێ نصیرو بێ معین و بێ خلیفە لە هەمو دنیا ژێر دەست، چارەي ئەو رەزالەتە نەكرێ (أبو بكر) خلیفەي بەرهەقە یا (عَلي) حقاً عَیني حَماقەتە.

﴿ وَمَن يَتَوَلَّ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ إيمانێ كامل مستلزم بۆ أعمالێ چاكە، ئەوانە حِزبي خوان غالبن لەسەر أعداء ﴿فَإِنَّ حِزْبَ ٱللَّهِ هُمُ ٱلْغَٰلِبُونَ ٥٦﴾ كەوابێ بە بەهانەي (نَخْشى أنْ تُصيبنَا دائرةٌ) لە دائرەي حزبي خوا دەرمەچن. بەخوا وا دەرچون روحيان دەرچو بونە ژێر چەپرۆكي ديان وجو. چەند مسلّمانێ أهلی دين أتفاقيان بو بونە (سيّدي أنام) إستلاي معظمي أمميان كرد كە زۆر بون بو لە مئاتي مليون تفرقەيان كرد، هەركەسە كەسێكی إتخاذ كرد بە (وَلي) خاصە ولی إرشاد ومعنويات، ژێر كەوتن بونە مسخرەي بشر، أول بە مسئلەي فضيلەت أبو بكر گەورەترە يا علي؟ آخر مادەي (قَوميەت)، روحي إيمان وإسلاميەتي لە دلاّندا نەما، آخرەت فەوتا ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ لەم رۆ تا قيامەت ﴿لَا تَتَّخِذُواْ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُواْ دِينَكُمْ هُزُوًا وَلَعِبًا﴾ ئەوانە لە كێ؟ ﴿مِّنَ ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكُمْ﴾ (جو) و (ديان) سائري أُممي تر كە پێش ئێوە صاحبي كتاب بوين ﴿وَٱلْكُفَّارَ﴾ رێ سەر را (رَ) قِرائەتە، رێ ژێر رێ ش (رِ) قراءَتە، يَعني هەر قەدمێ هەر كەسێ كافر بێ چ گەمە بەدين بكا يان نا، يا ئەوانەی كە دينی ئێوە يان كرديتە قەشمەري و گالتە، مەيان گرن ﴿أَوْلِيَآءَ﴾ بە نَصير وظَهير و محِب.

قەومێ ديني إنساني لا سوك بێ چون موالاتيان لەگەلّ ئەكرێ؟ ئەو كەسي بە حەق مُتَدَيِّن بێ ديني لا لە روح و لە جگەر گۆشە خۆشەويست ترو بە حُرمەت ترە. ئەمرۆ مع الأسف معظمي مسلّمانان ديني خۆيان كرديتە مسخرە قەشمەري و گەمەي پێ ئەكەن، هێشتا ئەواني أهلي (بِدْعَە) تن لەو رووە ئەهوەن ترن. ئەمە عجباً سَببي چی يە؟ لاي من سَببي بێ مێشكی مەلايانە تجديدي دين ناكەن بە نَوعێ كە لاي لاواني تازە پێ گەيشتو شيرين بێ لەزەتێكی لێ بزانن لەسەر ئەو هەمو تجددي كەلەم عصرەدا هەيە ئەوان هەر لەسەر حالي دە عصري پێش ئەمرۆ ئەرۆن. كەسێ خۆی ئاگای لە أساساتي

دینی إسلام ببیٚ ئەو أحوالاتەي سَوادي أعظمي مسلّمانان لەسەرین، بەدیني نازانیٚ گەمەي پیٚ ئەکا.

علمادي مادّە و طبیعەت ئیشیان گەیاندە دەرەجەیێك کە إنسان تیا حەیران ئەبیٚ، ئیستاش أكثري فرەقي مسلّمانان لەسەر معنویات ئەڕۆن، أما معنویاتي کە لە حَقیقەت دا هەموي شِرکە، وە بە عیني توحید و دیني حەقي ئەزانن. کە هاتنە باسي أولیاء الله مەپرسە بە جاریٚ نظامي کائنات تێك ئەدەن، حتا ئیش لە دەستي خوا دێننە دەر، ئایا کەسیٚ کەر نەبیٚ بەو معتقداتە راضیە؟ حاشا.

نازانم کەسیٚ (وَلي) بەد معنایە کە مسلّمانان تێی ئەگەن لە کویٚ هاتە ناو دیني إسلام؟. لە زەماني رسالەت، زەماني دوایي ئەو ئەو باس و خواسە نەبوو ﴿وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ إِن كُنتُم مُّؤۡمِنِينَ ٥٧﴾ لە هەموشت خاصة لەکاریٚ کە ببێتە موجبي تَفرەقە. ئێمە ئەگەر بە راستي مؤمن بین، خوا (وَلي) ئێمەیە واحدە وەحدەتي لە ئێمە ئەویٚ أهلي إیماني خۆش ئەوێن، با ئێمەش خوامان خۆش بویٚ یەکترمان خۆش بویٚ، چونکي ئەوەي خواي خۆش بویٚ ئەبیٚ خۆشەویستي خواشي خۆش بویٚ. أشخاصیٚ چەند عصر لەمەو پێش رابردون، نەیان کەینە بەهانەی عَداوەت، ئەگەر چاکەیان کردیە ئێمەش چاکە بکەین ئەگەر خراپەیان کردیە با ئێمە خراپە نەکەین بلێنی (تِلْكَ أمة قد خَلَتْ لَها ما كَسَبَتْ وَلَنا ما كَسَبْنا ولا نُسئَلُ عَمّا كانوا یعملون). ئەوەي خۆشمان ئەویٚ بۆ خوامان خۆش بویٚ، ئەوەی رقمان لیٚ ئەبێتەوە بۆ خوامان رق لیٚ ببێتەوە ئەوسا ئەبین بە کیتلەییٚ واحِد بە خوش و سەربەرزي لەسەر ئەرزي ئەژین.

﴿وَإِذَا نَادَيۡتُمۡ إِلَى ٱلصَّلَوٰةِ﴾ لازم نیە مُراد لەو بانگە بانگی معروف بي، ئەگەر ئەو سورەتە گەلیٚ پاش تَقَرُّري آذان نازل بووە، بەهەر نَوعیٚ بیٚ ئێوە کە بانگتان ئەکرد بۆ إقامەي نوێژ ﴿ٱتَّخَذُوهَا﴾ نوێژ یا بانگ ﴿هُزُوٗا وَلَعِبٗاۚ﴾ بە خصوصیش گەمەو گاڵتەیان بەوعبادەتە ئەکرد،مقصد گەمە بەنوێژ کەرەکانە.

ئێستا زۆر سەیرە لە بەیني مسلّمانان کەسیٚ نوێژی بکا گەمەي پیٚ ئەکەن.

لە کوردستاني ئێمەش أثرێکی لەو مَسخره تیا پەیا بووە، پەنا بەخوا، خـوا خێران کا. عجَابیه کەسێ أدنی شعوري هەبێ گەمە بە بانگ و نوێژ بکـا. آذانـي محمدي بە دەنگێ خۆش بە لهجەێ شیرین أدا بکرێ حقیقـة زۆر مـؤثره خاصـة بانگی سبەینێ، أما ئەگەر کەسێ وەکي (محمـود آغـاي) خـاڵۆزام بـانگ دا زۆر گران و مستکره دێته بەر گوێ. بعضه مؤذن بـانگ ئـەدەن إنسان قـصد ئـەکا لۆکه لەناو گوێی خۆی بنێ. أساس آذانـي محمـدي لـە خـەونـي (عبـدالله کـوري زیدي أنصاري)یه. مەلایان و محدثەکان گەلێ پەله پەل ئەکەن لەو خـصوصه، لکن غدر ئەکەن.

جەنابي رسول الله إعتباري بەخەوەکە ئـەو بانگـەي کـە عبـدالله ي أنـصاري لەخەودا بیستی قبولي کرد وە کردي بە شعاري نوێـژ ئـیتر چـی تیایـە قیـل و قالي چی پـێ ئەوێ با ئەو منقبە بۆ عبداللەي أنصاري بێ چی دەبێ؟ وەلەوەرا لازم نایێ خەون علی الأطلاق ببێته مـداري أحکـام. نوێـژ عبـادەتێ زۆر عَظیمـە عبد روو ئەکاته خواي بە هەمو وجـه تعظـیم و إجلالـي خـالقي خـۆی ئەیەنێتـە جێ، ئەو قراءته ئەو قیامە ئەو رکوعه ئەو سجودە چۆن گەمـەي پـێ ئـەکرێ؟ خاصه شکوهي جماعەت إتباعي إمام لە حَرکات وسکَنات هیبەت ئەدا بە ناظر.

﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەو هزو لَعبە بە نوێژ بە آذان ﴿بِأَنَّهُمْ قَوْمٌ لَّا يَعْقِلُونَ ﴿٥٨﴾﴾ لە هـەموو عالەم بێ عَقل وبێ إنصاف تـر (دیـانـي) أوروپـاین، لەسـەر ئـەو گەمـەد رقـص وسەماوتیاترۆیە، کە نـاوین لـێ نایـە نوێـژ عبـادەت، گـەپ بـە نوێـژي إسـلامی ئەکەن؟ سبحان الله لـەو بـێ مروەتیـە. تەماشـاي نوێـژي جمعـە نوێـژي جـەژن نوێژي باران بکەن، هیچ پێغەمبەرێ رێی بەو تەرتیباته نەبرد، لەسەر ئەو حاڵە لە ئێمە دەنگ ناکەین ئەوان گەمە بە ئێمە ئەکەن؟ حقیقة معکوسـێ متناسـبە. کەسێ عاقلێ بێ محاسني ئەو عباداته إدراك ئەکا ناتوانێ إنکار بکا. أما إنسانێ بێ عقل خاصه ئەو کەسەي خۆی بێ عقل بکا، قسەي لەگەڵ ناکرێ، تەماشاي حُسن وقبحي أشیاء علی ما هو علیه ناکا، بەڵکو ئەوي خۆی کـەر بکـا، حقـایق

ئەگۆڕێ. ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ﴾ توجيهي خطاب بكە بۆ أهلي كتاب، أما سائري كُفّاري جُهلا، نا، بۆچی؟ ئەواني أهلي جاهليەتي ئەگەر گەمە بە دين بكەن ئێمەيان رق لێ ببێتەوە إستكراه بكەن، هەرنەيسە، جاهلن زۆر عەيبيان لێ ناگیرێ. أما ئێوە أهلي كتابن مربوطي أحكامي سماوين ايمانتان بە خوا هەيە تصديقي أصلي رسالەت ونبوەت ئەكەن، ئەو سيّئاتە لە ئێوە دوورە ﴿هَلْ تَنقِمُونَ مِنَّآ﴾ أسبابي موجبە چيە ئێوە إنكار لەسەر ئێمە ئەكەن؟ ئەمان كەرهێنن بەكەرماندێ سُخط وقين كە عقابی لێ ترتب بكا هيچ سببي نيە ﴿إِلَّآ أَنْ ءَامَنَّا بِٱللَّهِ﴾ بە إيمانێ دروست جَزم ئەكەين كە خوايەكە بێ شريكە مُنَزَّهە لە تطورات وتجسم وتَمثُّل وإتحاد وحلول ﴿وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْنَا وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلُ﴾ بروايمان هەيە بە كتبي إلاهي ئەوەي بۆ ئێمەي ناردوە ئەوەي لە پێش دان بۆ أُمَمي سابقي ناردووە، ئايا ئەمە ئەبێ بە موجبي نَقمە؟ حاشا ثُمَّ حاشا.

﴿وَأَنَّ أَكْثَرَكُمْ فَٰسِقُونَ ٥٩﴾ علّە تي حقيقي ئەوەيە أكثري ئێوە خارجن لە دائرەي إطاعەتي إلاهي حتّا لە ديني خۆتان تەماشا كەن بە إنصاف، چتان بەسەر كتێبی خۆتان وديني خۆتان هێنا، كو ديني إلاهيتان كردە عَيني بشر پەرستي.

ئێوە لەسەر ئەو مَيل ومَشرەبە، چۆن بە ديني من راضين ئێمەتان خۆش ئەوێ موافقەمان لەگەڵ ئەكەن؟ نابێ. ﴿قُلْ﴾ يا محمد الرسول بەو قەشمەري كەرانە ﴿هَلْ أُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكَ﴾ بە خراپتر لەو قەشمەريە كە بە ئێمەي ئەكەن خراپترە ﴿مَثُوبَةً﴾ لە جهەت پاداش وجَزاي سُخرِيّە بە دين ﴿عِندَ ٱللَّهِ﴾ جَزاێ رأساً لە طرف خوا ئەو خراپترەيە بە إعتباري ظهوري لە داري دنيا، كێن ئەوانە؟ ﴿مَن لَّعَنَهُ ٱللَّهُ وَغَضِبَ عَلَيْهِ﴾ كەسێ خوا لەسەر أرحم الراحميني خۆی دووري بكا لە رەحمەتێ كە (وسِعت كل شيء) رقي لێ بگرێ رووي لطفي تێ

ئەکا ﴿وَجَعَلَ مِنْهُمُ ٱلْقِرَدَةَ وَٱلْخَنَازِيرَ﴾ جمهور لەسەر ئەوەن کە خوا بالفعل مسخي کردن کردني بە مەیمون وبەراز ئەمەش بۆ خوا پەرستان جێی إنکار نیە. (داروین) ئەڵێ: (إنسان لە أصلێکی مەیمونە ئەگەر إرجاع بکرێتەوە سەر أصلي بۆ چ نابی؟). بعضێ ئەڵێن ئەوە من حیث الأخلاقە. (سیّد رشید) نقل ئەکا لە (کتاب دُرّ المنصور) کە (إبن المنذر) و (إبن أبي حاتم) ئەڵێن: (ئەوانە دڵیان مسخ بو نەك جسدیان ئەوە مَثَلە وەك (مثل الذین حَملوا التورات ثم لم یحملوها کمثل الحمار یحمل أسفارا) (سیّد رشید) لە تفسیري آیەتي (بقرە) ئەوەي ترجیح کردیە وەلێرەش تسریح بە ترجیحي ئەکا، وە ردّي (إبن جریر) لە (مُجاهدي) رد ئەکا.

لام وایە ئەمە لەبەر خاطري أذکیاي منوراني عصرە، ئەمە قبوڵ ناکەن. أما عبارەتي (جعل منهم القردة والخنازیر) قیاسي لە (مثلهم کمثل الحمار)ی ناکرێ، وە لە تأریخي طبیعي أنسان بعضە نقلان ئەکا لە وقایع ثابتە کە بوە، کەسێ موي بەسەر بەدەنیا إستلاي کردیە عادةً وەك بزني لێ هاتوە. ﴿وَعَبَدَ ٱلطَّاغُوتَ﴾ لە نظري إنسانێ کە إنسان بێ عبادەتي بوت وأصنام وصور هیاکل، گاو پشیلەو قالۆچە، وە کەسێ وەك خۆي بَشَر هەرکەسێ بێ، مَذَلّەتي زیاتر تیایە لە مسخ بون بە مەیمون. مەیمون شرەفێکی حیواني تیایە، ئەوانە لەو شرەفەش محرومن خسیس ودنيء مُحَقَّرُ ومُهان. عجایب ئەوەیە ئەو دني طبعانە ئەو دناءَتە حس ناکەن پێی متألم نابن، بالعکس متلذذ دەبن. شێخ قبوڵ بکا لەبەر دەستي رادەوەستي چاو لەسەر یەك مل شۆر بە فخري ئەزانێ، سبحان الله لەو بَشَرە چ بَشَرە؟ ئەوانە هەموي إستهزاي خوایە، ئەگەر لاي خوا محقرو مهان نەبان، وایان بەسەر خۆ نەدەهێنا (نعوذ بالله من غضب الله).

بزانن ئەوەي سُخریە بە دین بکا خوا چۆن گەمەي پێ ئەکا! إنپراطورێ کە حکمي لەسەر (٤٠٠) ملیۆن نفوس بَشَریا وەك مەیمون رەقص وسەماو دانسي پێ ئەکا لە وِقاري بَشَري بە عنواني فنوني جمیلة ئەیکاتە دەر. سەرامەداني

سياسەت مدبراني مملكت وەك بەراز بێ غيرەت وناموسي ئەكا. ژنيان، كچيان، خوشكيان لەگەڵ أجانب ران لەناو ران قۆڵ لە قۆڵ هەڵكێشراو ئەيان سورِێنێ. لەسەر ئەو هەمو ذلّت ونقصە طعن لە ديني إسلام ئەدەن؟ هەيهاوار (بعضە أشعاري أبي علاي مُعَرّي):

(وقالَ السُّهيُ للشَمسِ أنتِ ضَئيلةٌ) إيرادي جوانە. ﴿أُوْلَٰٓئِكَ﴾ ئەو گرۆهە كە أستهزاء بە ديني ئێوە ئەكەن ﴿شَرٌّ مَّكَانٗا وَأَضَلُّ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ٦٠﴾ ئەگەر چی مَثوبەي ظاهري أسلافيان خراپترە، أما ئەوانە، مكَانيان بَدْ ترە، لە رێگەي راست دوور ترن. زێرا وَقايحي مَوروث ومكتسبيان تێ دا گرد بۆتەوە. كُفر لە كُفريان زياد كردوە، لاشَك جَزاي قيامەتيان شَديد ترە. ﴿وَإِذَا جَآءُوكُمۡ قَالُوٓاْ ءَامَنَّا﴾ ئەوەش نَوعە گەپێكە بە مسڵمانێ ئەكەن، زاتاً مقصود لەو آيەتە تذكير وتَحذيرە لەو جولەكە و ديانانەي كە من بعد أهلي إيمان توشيان ئەبن. حتا ناپليۆن كە هاتە مصر اِظهاري إسلاميەتي كرد إشتراكي جمعەي ئەكرد، گەلێ سياسي نَقيە بەراستيان ئەزاني بە تەواوي بۆي رام بون تا آخري ئەوی كردي كردي. إعتراض لەو سياسيونا نەكە لە عصري ئێمە مسڵمانن زۆر لازمە. من بڕواي بە سياسيون ناكەم، بۆ؟ ﴿وَقَد دَّخَلُواْ بِٱلۡكُفۡرِ وَهُمۡ قَدۡ خَرَجُواْ بِهِۦۚ﴾ لەگەڵ كفر ئەهاتنە لاي ئێوە وەلەگەڵ كفر ئەوان ئەچونە دەر، إيمان لە دڵيان دا نەبو بە قەدەر ذەرەێك ﴿وَٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا كَانُواْ يَكۡتُمُونَ ٦١﴾ بە چ قصدێ؟ بە چ فكرێ؟ ئەهاتنە لاي ئێوە ئەيان گوت ((ئێمە إيمانمان هێناوە)) ئەوي بزريان ئەكرد لە دڵی خۆيان دەگرت، خوا عالمترە لە ئێوە، ئێوە إيقاظ ئەكا ئاگادار بن، لە كيَدي ئەو نوعە كەسانە خۆ بپارێزن.

ئەڵێن: وەقتێ ئەوروپاي زۆر ئەترسان خەياڵيان لە (حَجّ)ي مسڵمانان ئەكرد ئەيان گوت هەمو ساڵێ ئەو هەمو مسڵمانانە ئەچن بۆ (مَكَە) ئەڵبەتە صندوقێكی عموميان هەيە هەر حاجيە مقدارێ پارەي ئەهاوێتێ شايەد حەربێ

عمومي ببێ ئەوپارەیە صرف ئەکەن ئەڵبەتتە تا ئەمڕۆ ئەو ثروه تە لە ملیارێ لیرە تجاوزي بوە. بۆ تحقیقي ئەو خەیاڵە بعضێ لە روس مسلمان بون ناوي خۆیان لێ نا (أحمدۆف) (أبراهیمۆف) (فلانۆف) خۆیان سونەت کرد چۆن بۆ (حَج) تەماشاي حالي حجاجیان کرد تێ فکرین ئەو نوعە خەیاڵە بە دەماغیان دانەهاتوە وە رواساشیان بەس بە دو أطماعي خۆیان کەوتون، حجاج رووت ئەکەن وئەیخۆن. گەڕانەوە حقیقەتیان بۆ قومي خۆیان بەیان کرد، ئەو ترس وهەراسەیان نەما حتّا مع الاسف ئەمڕۆش ئەو فکرە لاي ئێمە نیە.

﴿وَتَرَىٰ﴾ ئەگەر رائي﴿كَثِيرًا مِّنْهُمْ﴾ لەأهلي کتاب تجارەکانیان رواسایەکنیان ﴿يُسَٰرِعُونَ فِي ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡعُدۡوَٰنِ﴾ لەناو گوناهو ظلم وتجاوز لە حقوق ﴿وَأَكۡلِهِمُ ٱلسُّحۡتَۚ﴾ حرامي، دوني، خسیس، ﴿لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ٦٢﴾ ئایا ئەو نوعە طماعە لە إیمانە؟ گوێ نادەنە چاك وخراپ، هەر چەنگ کەوێ، بەهەر تەرزێ ببێ. ﴿لَوۡلَا يَنۡهَىٰهُمُ ٱلرَّبَّٰنِيُّونَ وَٱلۡأَحۡبَارُ﴾ أنە علماو مشایخەکانیان لەو سَیِّئاتە بالفعل إشتراکیان نەدەکرد. أمَّا بەوەندە نجاتیان نابێ، ئەبایە نَهیان لێ بکەن، ئەدي بۆچی نَهیان لێ ناکەن ئەو رواساي دینە؟ ﴿عَن قَوۡلِهِمُ ٱلۡإِثۡمَ﴾ لە درۆیان زاتا ئەوانە ئەگەر درۆزن نەبان ئەو هەمو سیّئاتەیان نەدەکرد. درۆزن، خاصة درۆزنەکاني سیاسي، بەدرۆ لەگەڵێ جێ خۆیان نجات ئەدەن، حتا لە محاکم ومجالس تشریعي براءَت وەرئەگرن، طبعا لەسەر سیاسەت رشت تر ئەبن.

﴿وَأَكۡلِهِمُ ٱلسُّحۡتَۚ﴾ لەحەرام خواردن بۆ نهیان لێ ناکەن. ﴿لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَصۡنَعُونَ ٦٣﴾ صنعەت لە عمل بە قوەت ترە، شتێ نەبێ بە ملکە پێی نالێن صنعەت. قابلە أحبار ورُهبانیوني بعضێ أعصار وأدوار إنزوایان کردبێ إشتغالیان بەو نوعە سَیِّئاتە نەکردبێ. أما چەند عصرێکە هەر چەند سیّئات وقایحي جوو و دیانان هەیە، رأسەکاني دینیان ئەیکەن، وەتحریك وتشجیعي مِلّتي خۆیان ئەدەن. ئەو درۆي کە دەربارەي حضرتي رسول الله ئەکەن بە

خاطرو خیالي بشردا نەهاتوە. زاتاً هەر دینیٚ کە گۆڕا هەر قەومیٚ کە بە فَساد چون، هەموي لە بەدي مەلایەکانیانە، ئەوان وەك دل وان، ئەگەر دل چاك بیٚ، گشت أعضا چاك ئەبن، ئەگەر دل خراپ بیٚ، هەمو أعضا خراپ ئەبن. ﴿وَقَالَتِ ٱلۡيَهُودُ يَدُ ٱللَّهِ مَغۡلُولَةٌۚ﴾ چ جایٚ رواُسای دینیان نەهیان لیٚ بکەن لەو جورە سیّئاتە لەوقسەي شنیع وکُفري گرانە إنکاریان ناکەن کە ئەڵێن خوا دەست بەستراوە بە (کەلەپچە) یعني بەخیلە. لاشك إنسان کە کەوتە تەنگنای ئەگەر إیماني زۆر بە قوەت نەبیٚ وەبەتەواوي مُسلم ومنقاد نەبیٚ، قسەی وا دەربارەي خوا ئەکا. ئەو نوعە إنسانە نەك لە جوان لە مسڵمانانیش دا زۆرن خاصە قەومیٚ کە نسبەتي هەمو شت مباشرة بۆ حضرەتي کبریائي بدەن، وەك جەنابی (غَوث) ئەفەرمویٚ لەو نَوعە قسانە قوەت وهێزي إیمان بەدەر دەکەویٚ. لاي من وایە ئەو قَولە معنایٚ تري هەیە کە مَقصدي جولەکەکان بوە وەلەو مقامەدا زۆر جوانە ئەوانە ئەیان گوت ئەوزاتە درۆزنە پێغەمبەریٚ راستي نیە، ئەمرۆ سبەینیٚ دەفەوتیٚ (تورات) تصریح ئەکا ئەوەي بەدرۆ دەعواي پێغەمبەري بکا خوا نابودي ئەکا ئابڕوي ئەبا. وەتەماشایان ئەکرد رۆژ بە رۆژ کاري حضرەتي محمدي زیاد ئەکا، بە قوت تر ئەبیٚ، سەر ئەکەویٚ، فتوحاتي بۆ ئەبیٚ، خاصە پاش فتحي (مکە) لەو تأثرو تحسرە ئەیان گوت خودا قُدرەت وقوەتي نیە دەست بەستراوي بیٚ دەسەڵاتە وە إلاّ نەدەبا ئەو کارە وابیٚ.

﴿غُلَّتۡ أَيۡدِيهِمۡ﴾ قوریان بەسەر مغلوب بون دەست بەستراوو رەزیل کران. لەسەر معناي پێشو ئەڵێن ئەمە دوعایە لە جوان بە بُخلێکی شَدید، یعني یا خوا ئەوان زۆر بَخیل بن خوا شُحیان تێدا خلق بکا، أما لە (حَسني بصري) نقل کراوە تفسیري (غُلّة) بە غلٍّ ي أسارەت لە دونیا وەعذاب لە جهنم ئەوجا پەلە پەل ئەکەن بۆ مناسبە لەگەڵ غَلّي سابق. کە نسبەتیان بۆ خودا ئەدا، بعضیٚ ئەڵێن جناسي لفظیە بعضي ئەڵێن مشاکلەي معنویە، یعني نظر بە معناي أصلي لُغەت، أما نظر بە معناي ئێمە حاجەت بەو کەشماکەشە نیە.

﴿وَلُعِنُواْ بِمَا قَالُواْ﴾ لعـنیٚ موٚبـد قابـل نیـه رەحمیـان پـیٚ بکـریٚ ﴿بَلۡ يَدَاهُ مَبۡسُوطَتَانِ﴾ نِعمهتي شامله قُدرەتي کامله، ئەوانه که حَصري نبّوەت وعـواطفي إلاهي له خوّیان ئەکەن لایان خوا بخیله بیٚ قُدرەتـه، أنّـهُ نـاتوانیٚ غـیری بـني إسرائیل پێغەمبەریٚ بنێریٚ ئەو دونیایه بوٚ وانه خەلکي طُفیلیه. حاشا خـوا رَبُّ العالمینه دەستي انعام وقُدرەت وقوەتي واسِعه. ﴿يُنفِقُ كَيۡفَ يَشَآءُ﴾ حـصر نیـه بوٚ قەومیٚ (دونَ) قَومیٚ، چوٚن حـەز بکـا وائەبەخـشیٚ، صـرف ئـەکا چ مـادّی چ مَعنوي، ولاشك مَشيّتي إلاهي لەگەلٚ علم وحکمەته، ئەو ئەزانیٚ کیٚ لایەقـه کـیٚ نالایەقه. جو مُجَسِّمن لایان خوا إنسانیٚ ظَلامه. تەماشـاي ئەوانـەي دەسـت بـوٚ خوا پەیا ئەکەن (غُلامي أحمدي قادیاني) ئەلیٚ خوا هەزار دەستي هەیه، ژاپون هەیکەلێکیان هەیه هەیکەلي خواي صەد دەست، (قادیانـي) یعـني پێغەمبـەري نوٚکەر ئەمەندەي بکەم دیوه ئەم خَلق وإیجاده بەصەد دەست ناکریٚ هـەورازي بردوه بوٚ هەزار. بەخودا ئەگەر ئیشي خوا پەکي لەسەر دەست بکـەویٚ خَلـق و إیجاد وترتیب نظامي ئەو عالەمه عظیمه به ملیوني دەسـت نـاکریٚ (إنمـا أمـره إذا أراد شیئاً أن یقول له کن فیکون) لەو نَوعه مقامه دەست نایەته خَیال حتّـا له حەقي صاحب دەست وەکو (سیّدِ) له حاشیەی (مُطَوّل) ئەفەرمویٚ. کەوابیٚ حاجەت نیه به تأویل به تفویض.

﴿وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرٗا مِّنۡهُم مَّآ أُنزِلَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَ﴾ لـه قـرآن کـه شـاهدي رسـالەتـي توّیه له نَصرو فتوحات ﴿طُغۡيَٰنٗا وَكُفۡرٗاۚ﴾ ئەوەي بوٚ توٚ ناردراوه له طـرف خـواي خوّت بوٚ گەلیٚ لەوانه تجاوزات وکُفر دەربارەي خوا یا توٚ زیـاد ئـەکا. ﴿وَأَلۡقَيۡنَا بَيۡنَهُمُ ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ﴾ زەرەریان بوٚ توٚ نابیٚ خوٚ بـه خـوٚي مـشغول ئـەبن ﴿إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡقِيَٰمَةِۚ﴾ دەوام ئەکا نابرێتەوه، أُمّتیش ئەتوانیٚ لەم عداوەتي وان إستفاده بکات.﴿ كُلَّمَآ أَوۡقَدُواْ نَارٗا لِّلۡحَرۡبِ أَطۡفَأَهَا ٱللَّهُۚ﴾ هەروەقتیٚ ئاگري شەرو شـوٚر وسَـلب

ونَهب وفتنـه ئـەنگێزي هەڵكـەن لـە حـەق ئێـوە يـا عـام، (أطفاهـا الله) خـوا ئەيكوژێنێتـەوە مـەراميان. حقيقـة تـا ئـەمڕۆ هـەر گَيـدیٚ (جـو) لـە حـەق مسڵمانانيان كردبیٚ بیٚ تأثير بوە، تأثيري واي نەبوە. أما ئەمڕۆ لە (فلـسطين) لە حەق مسڵمانەكان قـصور ناكـەن پـشتيوانيان بـە قوەتـە، أوميـد وايـە خـوا ئاگري هەردوكيان بكوژێنێتەوە مسڵمان ئەم مجارەش نجاتيان ببیٚ. واش بـوە (جو) زۆر تأيدي مسڵمانانيان دايە لە فتوحاتی (شام) و (أندلس) لكن ئەمـە لـە زێدە عـداوەتيان دەربـارەي (رۆم) و (غـوط) بـوە، وە(نـصارا)ش علـى الأكثـر ئاگريـان ئەكوژايـەوە حتـا ئـەو ئـاگرە عظيمهـي (بطـرس ناسـك)ي ناكـەس لـە ئەوروپا هەلي كرد عمومي دوەلي أورپاي سوق بو سەر ممالكي إسلام كرد، ئەو ئـاگرەش بـە غـيرەت وإقـدام وصَـبرو ثبـاتي كـاكي خۆمـان (صـلاح أيـوبي) كوژايەوە. وەئەوروپا چەند قرنـیٚ زەبـونـي دەوڵـەتـي عثمـاني بـوو تـا لەگـەڵ دەوڵەتي ئێران تێك ئەنگژان طرفين بیٚ هێز بون، أوروپاي إستفادەيان زۆر كرد لە هەمو لايەك غالب بون تاسەري كێشا (حربي عمومي) مـسڵمانان لـە شـرق و غرب زەبون بون، مع هذا مسڵمانان خۆ بە خـۆي رۆژ بـە رۆژ پـتر تێـك ئەچـن، وەأكثري خۆيان بوينە دوشمني ديني خۆيان عاقبەتي خێر بكا....

﴿وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادٗاۚ﴾ لـە زەمـانـي ئێمـە سـعیٚ زۆريـان بـۆ فَـسادي أخلاقە إمحـاي تربيـەي دينـە بـە فتنـەي ژنـان مـسڵمان گـيرۆدە بـون هەرچـی سـيّئاتە مُخِلّـي شـەرە في بَشَريَّتە بـەناوي مدنَيـەت تـرويجـي ئـەدەن وەرەواج ئەسـێنیٚ ﴿وَٱللَّهُ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ٦٤﴾ خـودا بـە قَهـري خـۆی عِرقـي فَـساد هەڵكـەنیٚ عـلاوەي فـسادي (جـو) و (ديـان) فـسادي (قاديانيـان) (بهائيـان) (شەدەلەي) يان وأمثاليان پشتی إسلامەتي شكاندوە بە نـاوي وِلايـەت وإرشـاد وإصلاح بەجاریٚ رُشد وصلاح ي إسلاميان بەربادكرد. ربّی !چارە چيە؟ قوەت وظهيري بیٚ... دينی إسلام نەما... چارە سازیٚ نيە بە غَيري حول وقوەتي تۆ.

﴿وَلَوۡ أَنَّ أَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ جـوو و دیـان ﴿ءَامَنُوا۟﴾ إیمـانىٚ دروسـت ﴿وَٱتَّقَوۡا۟﴾ لـــه فتنـــه بـــازي ﴿لَكَفَّرۡنَا عَنۡهُمۡ سَيِّـَٔاتِهِمۡ﴾ هـــي رابـــردوو ﴿وَلَأَدۡخَلۡنَٰهُمۡ جَنَّٰتِ ٱلنَّعِيمِ ٦٥﴾ كـەجێى أهلـي إیمـان وصـلاحه. أمـا ئـەو سیّئاتي ئەیكەن به عَینى خێرو واجباتي دیني ئەیكـەن چى جاىٚ إیمـان بیـنن مسلّمانان وەر ئەگێرن، ئەگەر چى ناو هەر ناوي إسلامیه، أما ناوك. ئـەو نـاوك نیه. حاصلي إسلامیەت تا ئەمڕۆ ڕۆژي وارەشي نەدیتیه ﴿وَلَوۡ أَنَّهُمۡ أَقَامُوا۟ ٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ﴾ به طَریقي عملیـان بـه تـورات وأنجیـل كردبایـه ﴿وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡهِم مِّن رَّبِّهِمۡ﴾ كتبي سائري رسلي بني إسرائیل ﴿لَأَكَلُوا۟ مِن فَوۡقِهِمۡ﴾ ثمراتي داران ﴿وَمِن تَحۡتِ أَرۡجُلِهِمۚ﴾ نباتاتي ناو أرضي سەر أرضـي ومعـادن اسـتفادەیان لـه هەمو شتىٚ ئەكرد إیمانیان به پێغەمبەري دێنا. ئەوانـي بـوت پەرسـت ورۆژ پـه رست ومانگ پەرست وگا پەرست بوو، مغلوب ئەكران. مُلكىٚ واسع ئەهاتـه ژێـر دەسـتي (ملّیـون) گـشتمان بعـد الأیمـان بـالله وەبـه حـضرتي موسـى وعیـسى ومحمد، ئەبوین به كتلَي واحد، ئەواني إنكارى صانع ووەحدەتي إلاهي وأصلي نبوەت ئەكەن، له كۆلّمان ئەكردنەوە، له دونیا بەخۆشى رامـان ئـەبوارد. لكـن عداوەتي ئەو مِلّه سائري دوشمني تري له فكر بردینەوە، ئەو رسـالەته كـه بـۆ توحید ناردرا، ئەمانه كردیانه باعث وسبَبي تفرقه.

بناءً علیـه تـا پێغەمبـەر زیـاد بـن تفرقـه زیـاد ئـەبىٚ. لـەو جهتـەوە خـودا رەحمـي كـرد، حـضرەتـي محمـدي كـردە خـاتم الأنبیـاء، دەركـەي ئـەو فتنـه وفسادەي پىٚ بەست. لكن نامەي ولایەت له زێدە فَسادي وتفرقه جێى نبوّەتـي گرتەوە. ﴿مِّنۡهُمۡ أُمَّةٞ مُّقۡتَصِدَةٞۖ﴾ طبیعى كُلّي فَرد له أفرادي أُمّـەت تێكـڕا خـراپ نابن، بعضيٚ ئەمێنىٚ لەسەر إعتدالِ له بەیني إفراط وتفریط ئەڕوا، ئەگەر ئەوانه زۆر بان باش بوو، لكن فسادا دائماً له إشتعال دادەبىٚ.

﴿وَكَثِيرٌ مِّنْهُمْ سَآءَ مَا يَعْمَلُونَ ﴿٦٦﴾﴾ کە أهلي فَساد غلبەیان کرد، أهلـي صـلاح چی پیێ ناکرێ، گەرچی ئاگري ئەنـدوهو حـیرەت لـە دڵیـان گـڕ ئـەخوا، شـەڕو شۆڕێ کە لە بەینی ئەم وئەمانە، هەڵدایسێ، گەرچی بـەناوي دین بـو، أمـا لـە حقیقەت دا طمعي دونیا بو. تا ئەم قَرنە، ئەو پەردە دڕا، امیش بـە دەرکـەوت، آمال ئاشکرا بو. وە دوو شت بوە سببي شکستي مسڵمانان إختلافي خۆیـان بـێ إعتناي به علم وعملي طبیعي، غلو لە دین و لە معنویات، إعتماد لەسەر خـوارق وکرامات، إستلاي إعتقـادي جـبري محـض یـا نیمـە محـض، انتظـاري خروجـي مهدي ونزولي عیسی. أوروپاي به علم وعملي طبیعي وکیمیـاوي بەسـەر ئێمـەدا غالب بون، نا بـەناوي موسـویّەت وعیـسویّت. وەنایەتـە خـاطر مِلّـت إصـلاحـي إعتقادیات وأفکاري خۆي بکا.

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلرَّسُولُ بَلِّغْ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ﴾ هەرچی لە طرف خـوا بـۆ لاي تـو هاتیته خوار بی گەێنە، أحکامي فرعي، إعتقادیات، أحوالاتي أهلي کتاب، یـەك آیَتْ إخفا مەکە. (وَاحذَرْهُم أنْ يَفتِنوكَ عَن بَعضِ ما اُنزِلَ إلَيْكَ) رابردوە ﴿وَإِن لَّمْ تَفْعَلْ﴾ حتّا یەك آیەت إخفا بکەي زاتاً نَقیضي موجبەي کُلّیە سالبەي جزئیە یە ﴿فَمَا بَلَّغْتَ رِسَالَتَهُۥ﴾ حـەقـي رەسـول ئـەوەیـە چـۆن مُرسِـلْ أمـري پـێ بکـا وا رەفتار بکا بۆ تبلیغي رسالەت نابێ بە هەوەسي خۆي بکا .هـەروەك تفریـق لـە بە یني رسل نابێ لە بەیني آیاتیش نـابێ، ئـەبێ هـەموي تبلیـغ بکـرێ. تقیـەو مراعاتي خواطر ومیول لە شأني رسول نیە. معناي ئەو آیەتە بەو نوعە ذکرکرا، ظاهرە، موافقي سیاق و سباقە شیعەي علـي ئـەڵێن مُـراد لـە (مـا انـزل إلیـك) خلافەتي حضرەتي علي یـە، ئـەي رسـولي خـودا خلافـەتـي علـي بـە أنـام دا بگەێنە، وإلاّ تبلیغـي رسـالەتت نـەکردوە کأنـە مقـصد لـە رسـالەتـي حـضرتي رسالەت پەنا، تبلیغي خلافەتي (علي بنأبي طالب)ە. گەلێ جارم گوتیە قرآن. نظر بە تفسیري شیعان شاهنامەیە کە بە سوپاس وستایشي علي داندراوە.

(سيدي آلوسي) لەو مقامە تفصيلاتێ جواني هەيە رێى قسەي بۆ كەس نەهێشتۆتەوە رەحمەتي خواي لێ بي. (سيِّد رشيد)يش نەختێ تحقيقاتي فەرموە دوايێ ئەڵێ من حەزم لەو مُشاجرە ومنازعە نيە موجبي تفرقە يە، هەر برا بەريشي خاوەني تازە موجبي تفرقەيە؟ حتى الأنصاف لەو مقامە ئەوەيە ئەو آيەتە هيچ مَسّي لەگەڵ (خَلافەت) نيە نە إي (أبى بكر) نە إى (عَلي)، مقابەلەيە لەگەڵ أهلي كتابە عَدوّي رسولن عدوّي ديني إسلامن لە زەماني رسالەت تا ئەمڕۆ رۆژ بە رۆژ ئەو عداوەتە تشدّدي كرديە العلم عند الله تا أبَدْ ئابڕێتەوە، حَذَر لەوان لازمە، مقابلە كردني وان واجبە، ئەمڕۆ بحث لە خلافەتي (علي) يا غيري (علي) حماقەتي مَحضە. صوفيش دەعواي زل زليان هەيە ئەڵێن ئەوەي بە (وَحي) بۆي هاتبى تبليغي ئەكا نابێ إخفاي بكا لەكەس، أما ئەوەي بە إلهام وكشف بێ لازمە إخفاي، أسراري طريقي لە سَوادي أعظم بزر كرديە، أسراري طريقي نَقشبَّهي لە سينگى (أبو بكر) داناوە حَتّا ئەڵێن ئەو وەقتە كە لە (غار) خۆيان بزر كردبوو ئەو أسرارە مقدەسە لەناو صندوقێ بۆ پێغەمبەر هات ئەويش بە (وَديعە) لاي أبو بكري دانا. خوا ئەزانێ ئەو وەقتەبە غَيري أسبابي نجات خيالي چيتريان نەبو. أسراري طريقي (قادري) لە سينگى حضرەتي (علي)دا دانا، خوا ئەيزانێ نە (أبو بكر) نە (عَلي) نەدەپرژانە ئەم فاك وفيكە، بەغَيري پەيڕەوي (قرآن) و (سُنَّة) هيچ أشغالي تريات نەبو. (أبو بكر) لە زەماني خۆي بە چى مشغول بو چى كرد چۆن إسلامەتي لە مردن نجات دا ئەو أعمالە لە كێ مرمري نقشيان لەكێ؟ أحوالي إمامي (علي)ش لە أهلي سيَر بزر نيە.

خلاصە ئەو دوو طائفە تابتوانن قرآن لە معناي حقيقي لادەدەن. يەكێ بە روايات لەأئمَّە ي معصومين، ديكرێ بە (ألهمني ربّي، حدَّثني قلبي عَنْ ربّي) مُرادي خۆيان دەچەسپێنن. لكن عبارەتي قرآن نَظم ونَسجي شيرين محكمي، بە جِبال ي خيالات لەبار يەك نايەتە دەرێ.

﴿وَٱللَّهُ يَعۡصِمُكَ مِنَ ٱلنَّاسِۗ﴾ خودا تۆ حفظ ئەکا لە کَیدي ئەوانە کە دوشمني دین و(دَم)ی تون هەرچەند بەلاو مصیبەت لە طرف وان بێتە سەرت نەقواي مادّي نە قواي مَعنويت فتورێکی نایەتە سەرێ وەخَوفي نادا بەتۆ کە منعت بکا لە تبلیغي (ما أُنزل إليك) خودا إمدادت ئەدا. حکما ئەڵێن هەرچەند قواي جسماني متناهي الأثره أما کە إمدادي لە مبدأێ مجرد بێ آثاري غیره متناهیەي لێ صادر ئەبێ. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ٦٧﴾ ئەو قومە کە راسخي في الکفرن (یُسارعون في الکفر) (یسارعون في الأثم) خودا هدایەتیان نادا نەبۆ ایمان نە بۆ صَدّي توکَیدي وان بە بائەدا. ئەو سورەتە هەر بە نزول آخره أماله أوائلي سوەري قرآنه آنَهُ تازه لە أوائِلي تبلیغه ولَو حضره تي رسالەت ئەوەندەي لە عمري نەمابو کە حاجەت بەو تعهده بێ وە فتوحاتیش تەواوي بۆ بوبو، جوو و دیاني حجاز کەلکي عداوەتیان پێوە نەمابوو، وەممکنە عیني مقصد إعتباري أُمّته پاش زەماني سعادەت پەیرەوي صاحبي رسالەت بکەن صبرو ثبات بنوێنن هیچ لە قرآن کتم نەکەن ئاگایان لە کَیدي جولەکەو دیانن بێ. ئەوانە لە أطرافي حجاز (إلى ماشاءَ الله) بلاوبوین عداوەتیان لەگەڵ دیني إسلام جدّیە فتور وقصور ناکەن ئێوە ثابت قَدم بن بە إحتراس بن خودا حفظتان ئەکا نصرەتتان ئەدا. لکن مع الأسف ئەو وَعظە لە گوێ نەگیرا زۆر پێ نەچو لەبەر عداوەتي خۆ بە خۆي ئاگایان نە لە دیانان ما نە لەجو تاکو روحي عِزّو شەرەفیان دەرچو.

﴿قُلۡ يَٰٓأَهۡلَ ٱلۡكِتَٰبِ﴾ ئێوەش گوێتان لێ بێ ئەي أهلي إیمان ﴿لَسۡتُمۡ عَلَىٰ شَيۡءٍ﴾ لەسەر چشتێ نین ﴿حَتَّىٰ تُقِيمُواْ ٱلتَّوۡرَىٰةَ وَٱلۡإِنجِيلَ﴾ مُراعاتیان بکەن بە تەواوي أحکامیان بەجێ بێنن. ﴿وَمَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡۗ﴾ سائري کتب کە بۆ رُسُلي بني إسرائیلي نازل بوە. لە نظري منا ئەو تعلیقي بالمحالە نە توراتێکی بۆ موسی هاتوە نە إنجیل نە سائري کتب (کما أُنزل) لەو وەقتەدا

وەك خۆ نەمابون، انجيل هەر تدوين نەكرابو له قبيلەي روايات هەر (حَواري)يـە شتێ نقل ئەكا له أقوال وسيَري عيسى، راست يادرۆ، وەسائري كتبي تر، هيچ، چەندان إعتنايان پێ نەكراوە، وەسَنَدي إتصاليان نيە. ئەوەي ئێمە ئەي بينين له كتبي مقدسيان سەراپا كفريات وخەرافات وتعليقاتە. في الحقيقه واضحه ئەو ناوو إسمي مُقَدّس بێ (مُلَوَّث) كرايە. أما ئێوە ئاگادار بن كتێبى تازە دەست لێ نەدراوتان بۆ هاتوە، مُلَوَّثي نەكەن..

﴿وَلَيَزِيدَنَّ كَثِيرًا مِّنْهُم﴾ الى الأبـد. ﴿مَّآ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ طُغْيَٰنًا وَكُفْرًا﴾ تۆ تَبليغي خۆت بكە (وما على الرسول إلا البلاغ) تَزيدي طغيـان وكفـري ئەوانـە مەكـە بـە بەهانـە، كتمـي آيـاتي خـوا مەكـە ﴿فَلَا تَأْسَ عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْكَٰفِرِينَ ٦٨﴾ لەسەرەوان عاجز مەبـە. تأسـفيان بـۆ مـەخۆ. زاتـاً خۆيـان غـريقن لـەناو كفـرو گوناە بەڵكو ئەگەر بێو شتێ بۆ خاطري وان كَتم كەي دەها زياتركـافرن ئـەبن. ديارە كفريش وەكي إيمان قابلي زيادەو نقصە يعني شِدّەت وضعف له بعـضێ ئەبن به (مَلَكَه) له بعضێ (دون) تر، وهكذا تانێزيكـي مـەحو ئـەبن. ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ يعـني أُمّـتي إيجابـە ﴿وَٱلَّذِينَ هَادُواْ﴾ داخلـي يَهـوديـەتـي بـوين. ﴿وَٱلصَّٰبِـُٔونَ﴾ قومێكن به إدعاي خۆيـان بـە تـەواوي لەسـەر ديـني حـضرەتـي (موسى)،ماين قورباني ئەسـوتێنن. عَطـري خۆشـبۆوي پيوگۆشـت وهێـسك بـۆ شەوبۆهي خوداي إسرائيلي هەڵ ئەكەن له عبادەت روو ئەكەنە ئەو موقعە كـە گۆيا حضرەتي إبراهيم إسحاقي كوري بردۆتـێ بـۆ سـەربرين لـە چياي (مينـا) مركزيان ئەمرۆ له قدسە،قومێ كەمن رۆژ به رۆژ لەكەمـي دان مـصاهره لەگـەڵ كەس ناكەن، سائري فِرَقي جـوو، هـەمو نـصارا، ومـسڵمانان بـە كـافر ئـەزانن. لەناو بَشَر بێ مَحَلّ وإعتبارن بۆيە له عبارەتيش اعرابيان مُخالفە.

﴿وَٱلنَّصَٰرَىٰ﴾ مَعلومن ﴿مَنْ ءَامَنَ بِٱللَّهِ﴾ به وَجهێ لايق به مَقـامي كبريـائي نەڵێن دەست له بەنـدە، ئێمـە أبنـاء الله وأحبـاء الله ين خـودا جـسمێ زەلامـە

مَصَوَّره، رەحمي خاصي ئێمەیە، نبوەت لە هیچ شعبێ نابێ إلاّ لە بني إسرائیلي، أنّهُ خوا ناتوانێ ئەو لطفه لە حەق شعبێ تر بکا، ئەمەش نَوعه بُخلێکە، نەڵێن إتحاد وحلولي ئەبێ، نەڵێن تَغَیّرو تطوراتي دێتە سەرێ، لەکردەوەي خۆي پەشیمان ئەبێ.

﴿وَٱلۡيَوۡمِ ٱلۡأٓخِرِ﴾ بەو جۆره کە رۆژێکە (لایُغني مَولیً عن مولیً لا یجزي والد عن ولده) فیدیە نیە شفاعەت بۆ ئەوانەي کە پێی هەڵدەخەڵەتێن نیە ذُراري أنبیاء ناسوتێن عذاب نادرێن، ئەو هذیانانە نەکەن بە دڵ وزوبان بڕواو إقرار بکەن هەر خوا مالکي رۆژي جزایە. ﴿وَعَمِلَ صَٰلِحٗا﴾ بە مجردي إیمان إکتفا نەکەن ایمانێ بێ عملي صالح داري بێ بەره، إیماني دروست سَوقي صاحبي ئەکا بۆ کردني چاکە، عَمَلْ وَلَوْ داخلي حَقیقەتي إیمان نەبێ، لە لوازم ومُقتضایەتي. إیمان بە رۆژێ بەو نَوعە لە رُسُل نەبێ وەرناگیرێ. إیمان بە رۆژي جَزا بەو تەرزه موجِبە بۆ إیمان بە خاتم الرسل. إیمان بە خاتم الرسل إیمانە بە جمیعي پێغەمبەراني عِظام من نوح إلی عیسی علیهما الصلوة والسلام.

﴿فَلَا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ٦٩﴾ جەنابي حەق لەگەڵ هیچ قَومێ هیچ شعبێ هیچ قَبیلەێ نسبەتي خاصي نیە (رَبُّ العالمین)ە کوردو جاوەيي هندوك لاي وەك عَرَب وسکسوني وهندوسە لە کُلّي قَومێ خودا پێغەمبەري ناردووه، ئەم نقبەیە تەنها بۆ ئیسرائیلي و عەرەب نی یە! دینی ئیسلام بیناي لەسەر مُساواتي حقوقي عمومی یە، کەرامەت بۆ ئەهلي تقوایە، نەجات بە ئیمان و عملي صالحه! هەر کەسی ئیمانێ دروست و عملي صالحي هەبێ، رۆژي جەزا ترسي لەسەر نی یە عاجز نابێ (با کەرە قەرەج و دۆم بێ)، مقصد ئەوەیە موسڵمانان وەك جوو و دیانان نەبێ، بە مجردي إنْتِساب خۆیان فیرفتە نەکەن! لکن مَعَ الأسف لەوان تێ پەڕین ﴿لَقَدۡ أَخَذۡنَا مِيثَٰقَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾ کە ئیمان بە خوا بێنن بە ئیمانێ دروست ، لە أوامري دەرنەچن. ﴿وَأَرۡسَلۡنَآ

﴿إِلَيْهِمْ رُسُلًا﴾ لــە خۆیــان ﴿كُلَّمَا جَآءَهُمْ رَسُولٌۢ بِمَا لَا تَهْوَىٰٓ أَنفُسُهُمْ﴾ کــە مناسبي حـالي روأسـايەكانـي ديـني و دنيـوي نەبايـە ﴿فَرِيقًا كَذَّبُوا۟ وَفَرِيقًا يَقْتُلُونَ ﴿٧٠﴾﴾ تکـذيبي بعـضيكيان ئەكـەن، بعـضيكيان ئـەكوژن ئەگـەر دەسەلاتيان هەبا تۆشيان دەكوشت باوجودي بە كَيدو مَكر قـصوريان نـەكرد.

﴿وَحَسِبُوٓا۟ أَلَّا تَكُونَ فِتْنَةٌ﴾ لايان وابو معذب نابن، ئيماني وان بە رۆژي جەزا وانەبوو كە مەنعيان بكا لە إتباعي هەواي نفساني، في الحقيقة ئيمان بە رۆژي قيامەت بەو وەجهەي كە قورئان ئەفەرموێ مايەی سعادەت و نەجاتي دونيـا و ئاخرەتە، تا ئيمان بە رۆژي جەزا ضعيف تر بێ إنسان سيئات پتر دەكات، بـێ مبالات تر ئەبێ، ئەوانەي كە (بالمرة) ئينكاري ئەكـەن بـە تـەواوي لـەززەت لـە گوناهان ئەبينن زێرا كەمێ و وجدانيشيان نامينێ، گوناه بۆ ئەوانە وەك شَهدي و مُصَفّايە. ﴿فَعَمُوا۟ وَصَمُّوا۟﴾ لەبـەر ئـەو حسابە كوّر بـوُن كـەرر بوُن ﴿ثُمَّ تَابَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ﴾ بەهــەر جـۆرێ بـوو بـە هـۆش هاتنـەوە، زانانـديان ئـەو ئيعتقادە چروكە، تۆبەيان كرد، خوا تۆبەی لێ قبـول كـردن، بەسـەريان نـەبرد ﴿ثُمَّ عَمُوا۟ وَصَمُّوا۟ كَثِيرٌ مِّنْهُمْ﴾ كەمـەكيان لەسـەر (تـوبـە) مانـەوە ﴿وَٱللَّهُ بَصِيرٌۢ بِمَا يَعْمَلُونَ ﴿٧١﴾﴾ با ئـەوان كـۆرو كـەرر بن، خـوا ئاگـادارە بـەوەی ئەيكەن، أقواليان ئەبيسێ أعماليـان ئـەبينێ، زاتـاً قـوليش عملـي لـساني يـە. دەربارەي ئەو كۆرو كەررانەيە لەو مَقامە هەر ئەوەندە دەگوترێ، جـەزاي وان نايەتە تَقريرو تحرير وَلَوْ تفصيلا نيشيان بۆ بدەين گوێ يان لێ ني يە. ﴿لَقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓا۟ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلْمَسِيحُ ٱبْنُ مَرْيَمَ﴾ فيرەقي نَصارى لە حـەق (عيسى) قسەيان مختلفە. قسمێ ئەڵێن خوايە خالقي ئـەرزو سـەمايە ألوهيـەت منحصرە لە مسيحى كوڕی مريمي، ئەو قسە ئينسان نازانێ بڵێ چی يە، كفرە، جهلە، حماقتە، دەسيسەو إضلالە؟ كەسـێ لاي وابـێ ئـەو عالەمـە صـانعێكی

هەیە وەکەمیّ لە لوازمي خلق وایجاد بزانیّ، کوو خیال و توهم دەکا کەسیّ وەك عیسى یا جبریل یا عقل و لاهوتي مجرد ئەتوانیّ خلقي ئەو عالەمە بکا؟ (عیسى) (قَرْبائیل) (رَفتمائیل) (کَرّوبین) و (حافیّن) (صافیّن) ناتوانن پێشکەیەك إیجاد بکەن. ئەتوانم لە عُمقي قلب شاهدي بدەم (عیسی) نەیزانیە (میکرۆب) هەیە. ئایا کەسیّ لە بەشەر بیّ باب ببیّ بعضي خوارق العادە بنوێنیّ، ئەبیّ بڵێین ئەمە خوایە؟ العجب ئەو قسە چۆن لە بشر ظهوري کرد، چ دەماغیّ ئەو حوکمە تصدیق ئەکا؟ لە چ میشکیّ لە چ دلیّ ئەچەسپیّ؟ مادام عیسى إبن مریم بیّ، ئەبیّ أصلی ألوهیەت تفرعي لە مریم کردبیّ. ﴿وَقَالَ ٱلْمَسِيحُ﴾ خۆی وتویەتی ﴿يَٰبَنِيٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ﴾ ئایا خۆی ئەبێتە خواي خۆی. ئەگەر خوایە ئەم قسەیەي بۆکرد؟ شایەد کەسیّ بلیّ خِلافي ئەو قسەي کرد وتویەتي خوام یا کوڕي خوام، افترا ئەکا درۆي بە زوباني (عیسی) هەڵبەستەیە، ئەگەر معاذ الله واي وتبیّ، قَولي جووان دەربارەي وي راستە. ﴿إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ﴾ لە عبادەت، لە صفات، لە زات و حقیقة، چ جاي (هُوَ هُوَ)؟ ﴿فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ﴾ کە دار الموحدینە لەگەڵ موحّدان لە جي بیّ گرد نابنەوە ﴿وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ﴾ کە جێی و مأواي مشرکانە ﴿وَمَا لِلظَّٰلِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ ۝٧٢﴾ ئە وي ظالم بیّ خاصة ئەو ظلمە عظیمە کە شیرکي باللەیە کەس نصرەتي نادا لە داري اخرەت با لەدونیا أنصاریان زۆربن ،لکن ئەو رۆژە بەدەر ئەکەویّ ئەواني بە أنصاریان زانیون نصرەتیان نادەن، یاخود پێی نادریّ ﴿لَّقَدْ كَفَرَ ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ﴾ ئەمەش گروهیّ ترە لە (نصارا) وغیرە نصارا ئەو قسەیە ئەکەن ، أما هیچ مشرکیّ ادّعاي إنحصاري الوهیەت لە معبودە باطلەکەی خۆیان ناکەن. ﴿إِنَّ ٱللَّهَ ثَالِثُ ثَلَٰثَةٍ﴾ یەکێکە لە سیّ یا، یاخود سیّ یەمینە. زاتاً مشرکي (ملِیون) شریکەکانیان لا، لە خوا مُقَدَّمە. یکیّ لاي خۆی مێژەر بەسەر بو باسي زاتێکی کرد لە (مَشایخي) عصر بعضە

(إسناداتي) پێ دا. وتم كەوابێ خوا بۆ چی یە؟ وتی خوا بۆیەیە أوامري إجرا بكا، كأنە جنابي (كبريائي) ئەمریەري شێخەكانە. ئەم سێ یە (أب) و(إبن) و(روح القدس)ە لكن (سَيِّدي آلوسي) بنا بە ریوايەتي (سَدِّي) ئەفەرموێ: (حضرتي كبريائي عيسى يا مريم)ە. في الحقيقة تفيصلي قسە ي لە بعضێ دیانان والە قضا ئەخوازێ كە (مريم)ە أصل الكل بێ، مشركەكان أكثري إلاهيان لا مؤنثە، ئەبێ ئەوانيش إلاهيان مێ بێ.

﴿وَمَا مِنْ إِلَٰهٍ إِلَّآ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ﴾ حقيقەتي الاه گەر متعدد بێ (من حيث الأفراد) وەكو سائري حقايقي ممكناتي لێ دێ، هەنگێن (إلاه) نابێتە (فوق الطبيعە) ئەو عالەمە عظيمە ئەگەر پەكي لەسەر تعددي (إلاە) كەوتبێ، بەسێ وچوار علاج ناكرێ زەحمەت بە مليۆنێ بكرێ. أما ئەو مشركانە لە شتی وا نافكرن، ئەوي جاهل بێ قسەي لەسەر زوباني يە، بە دڵ نازانێ ئەڵێ چی.

منداڵ بوم باوكم (رەحمەتي خواي لێ بێ) خطبەیەكي زۆر مؤثري خوێندەوە دەرویشێ گەلێ هاوهوي كرد پاش نوێژ ئەمري كرد كابرايان هێنا فەرموي تۆ ئەو هەرايەت بۆ كرد؟ نەت هێشت مسڵمانان بەتەواوي گوێ يان لە خطبەكە بێ؟ وتي لە شەوقي خواي. فەرموي تۆ خواي ئەناسي؟ وتي من هەندە هەندەي نازانم، خواو پێغەمبەرو غوثي گەيلاني ئەو عالەمەيان خلق كرديە. ﴿وَإِن لَّمْ يَنتَهُواْ عَمَّا يَقُولُونَ﴾ يعني لەوەي ئەیڵێن نەگەڕێنەوە بۆ توحيدي حقيقي ﴿لَيَمَسَّنَّ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنْهُمْ﴾ كە ئەو قائلانەن، معلومە هەمو دیان ئەو قسە ناكەن مزقەیێ ولَوْ زۆر كەمن لەسەر تَوحيدن، مسيح و مريمە بە عَبدو جاريەي خوا ئەزانن ﴿عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٣﴾﴾ نە (مسيح) نە (مريم) نە (روح القدس) چارەيان پێ ناكرێ. كەوابێ وەكو كوردي ئەڵێ (بە تەماي نیسكێ لە ئیمانێ نەگەڕێين). ﴿أَفَلَا يَتُوبُونَ إِلَى ٱللَّهِ وَيَسْتَغْفِرُونَهُۥ﴾ لەپاش إستماعي ئەو آياتي بێناتە، ئايا ناگەڕێنەو بۆ لاي خوا؟إستغفار ناكەن

لەو گوناهە عَظیمة؟ لەو کُفرە بێ مَعنایە؟ چی جایێ (تَوبە)، دەعوەتی عالەم ئەکەن بۆ ئەو کفرو ضلالە لە مشرق ومغرب مُبشریان بڵاوبویتەوە، دەوڵەتە متمدّنەکان پارەیان لێ صرف ئەکەن، تاکو خەڵکي لە دیني حەق وەرگێرن، بۆ ئەو کفرو زەندیقیە. عجایبە ئەوەي لەناویاندا موحد بێ (مسیح) بە خوا یان بە کوڕي خوا نەزانێ پێ یان ئەڵێن (مُلحِد) وەکي (مُتَشَیّخە کاني) ئێمە ئەوەي پێ یان هەڵ نەخەڵەتێ ئەی لێنێ (مُنکِر) وە بەڵکو (تکفیري) ئەکەن.

سبحان الله العظیم چ إنقلابێکە ﴿وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ٧٤﴾ أما ئەوان پەکیان لەسەر غُفراني خواو رەحمي خوا نەکەوتوەن عیسی بەسیە بۆ فدیەي نَجات، ئەواني ئەڵێن (خوایە) ئەیکەنە فدیەي نجات ئایا ئەو نَوعە تحمقە علاجي ئەکرێ؟ ﴿مَّا ٱلۡمَسِيحُ ٱبۡنُ مَرۡيَمَ إِلَّا رَسُولٞ﴾ لە رسالەت زیاتر چ مەزییەتي نیە، رسالەتیش لەو إنحصاری نەکردیە، پێشی ئەو چەند پێغەمبەراني عِظام بە آیات ومعجزاتي غَریبەو عَجیبە هاتین کەسیان نەیان ووتیە ئێمە خواین یا کوڕي خواین.

﴿قَدۡ خَلَتۡ مِن قَبۡلِهِ ٱلرُّسُلُ﴾ هەمویان دەعوەتي عبادیان کردیە بۆ وَحدانیەتي الاهي نَهیان کردیە لە شِرك، کەس لەوان نەي ووتیە شخصێ ظهور ئەکا پێی ئەڵێن (مسیح)، ئەو خواي ئێوەیە یا کوڕي خواي ئێوەیە ﴿وَأُمُّهُۥ صِدِّيقَةٞ﴾ لە شائبەي شرك وکفرە وعەیب وعار پاك بووە. لە عُمقي قَلبەوە ئیماني بە رُسُلي سابقە هێناوە. ﴿كَانَا يَأۡكُلَانِ ٱلطَّعَامَۗ﴾ ومعلومە نتیجەي طعام خواردن چی یە. ئەوانیش وەکي سائري حیوانات حیاتیان بە خواردن دەوامي کردیە، ئەگەر خوابان یا کوڕي خوا وە مصدري ألوهیەت بان چۆن وادەبون؟ کەسێ خواي تێ دا بێ یا لەگەڵ خوا إتحاد بکا چۆن حیاتي پە کي لەسەر لوقمە نانێ ئەکەوێ؟

﴿ٱنظُرۡ كَيۡفَ نُبَيِّنُ لَهُمُ ٱلۡأٓيَٰتِ﴾ لەگەڵ ئەو أدب ونَزاکەتە حقاً

أدبي قرآن (محيِّر العقوله). إتباعي هەوا تقليدي آبا وأجداد إنساني كوێر ئەكا، تەماشاي آيات ناكا، رووي لێ وەرئەگێرێ خاصة إعتقاد بە شتێ لەگەڵ محبەت بێ، بە هەزار دلائل وبرهان زەوالي نابێ. ﴿ثُمَّ ٱنظُرْ أَنَّىٰ يُؤْفَكُونَ ﴿٧٥﴾﴾ دواي نَظَري أول تەماشا كە ئەي صاحبي نظر وفكر، يا رسولي مُبَيِّن ومُبَلِّغ، بۆ چ جێي صرف ئەكرێن؟ ياكو تحويل ئەكرێن لە گوێ راگرتن وتأمل كردن لەو آياتي بيِّناته چ معقول چ منقول؟ في الحقيقة جێي تعجبە كەسێ بڵێ من الاهيم طالبي حەقم يا مُرشد ودَليلم حەقي بۆ ئاشكرا ببێ وەدەست لە إعتقاداتي باطلي خۆي هەڵنەگرێ. لە عصري ئێمە كە ئەڵێن عصري (نور) ظلماتي إعتقادي سوادي أعظَم لە بَشَر زيادە إشتداد دەكا. رۆساي أديان بلا تفريق بە نظر علماي طبيعەت ئەمرۆ بە (إبن هَبَنَّەقە) نابن، كەچي بعضێ دەعواي رسالەت ئەكەن. عجايب ئەمەيە ئەوإختراعاتي عجيبە كەهەر يێكێ لەصەد هەزار كرامەت بۆبشر نافع ترە، لە ثمرە ي علمي شيطاني حساب ئەكەن.

ئەبا علماي أديان سەري لوتي خۆيان رەش كەن مُقابل بەو عُظماي علمي طبيعەت چاو هەڵنەهێنن، وە ئەبايە باسي كرامەت لە كتب مەحوكەنەوە (غلام أحمدي قادياني) لە عصري (أديسون) چۆن زاري هەڵ ئەپچرێ بڵێ من (مەلام) فضل لە (رسالەت) واي لەو جهالتە ! لەوبێ شەرميە، عجايب تر ئەوەيە گەلێ لەو مخترعە گەورانە حالاً لەسەر كۆنە دينەكەن لە إعتقاديات خۆيان لە (كەرە) عاميەكان جودا ناكەن. ﴿قُلْ﴾ يا رسولي مُجتبى ﴿أَتَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمْلِكُ لَكُمْ ضَرًّا وَلَا نَفْعًا﴾ سوادي أعظم لە أهلي أيمان كە خوا ئەپەرستن يا لە ترسانە يا لە أمَلي إحسانە، كەم وايە خالصاً مخلصاً لوجە الله خوا بپەرستێ، چونكە خوايە. خواي تعالان عالمە بە طبعي بَشَر، عِبادەتي لە خَوف يا لە رجا بێ يا لە بەيني خَوف ورجا بێ، قبولي ئەكا. بۆيە لە پاش ئەو حالە عجيبەي مُشركان ئەفەرموێ (ئايا ئێوە عبادەتي شتێ ئەكەن كەلەبۆ ئێوە نە مالكي زەرەرە نە مالكي نفعە؟) نە جێي ئەمەيە

لێی بترسن نە شایانی ئەمەیە لێی بە أومێدێ بن. مقابلي ئەو كَلامە ئێوە ئەبێ (بورر) بن جوابتان پێ نەدرێ، لكن أهلي شرك لەو عصرە ئیشیان لە ئیش تێ پەڕاند شریکي خوایان بە ضارو نافعي مطلق ئەزانن، هەر حادثەێ ظهور بە أمرو إرادەي ئەوە بەلاێ بێتە سەر مسڵمانێ لە طرف ئەوە، چ لە دونیا چ لە عُقبی هەر خۆیەتي متصرفي زەمانە مُدبّري أرض وآسمانە صاحبي أمري (كُنْ) (فَكانَ)ە سُبحان ئەو هەزیانە لە عَوام هەر نەیسە لە خواص لە زوبدەي أهلي علم وعرفان صادر ئەبێ.

﴿وَٱللَّهُ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ٧٦﴾ هەر ئەوە همسُ الخطاب ئەبێ خطراتي قلب ئەزانێ، إحاطەي بە هەمو شت داوە، جزءي وكُلّي. من شایەدي ئەدەم الآن خوا ئەزانێ من چی ئەكەم لە چ حال دام چم لە دل دایە، أما ناتوانم بلێم (جبریل) یا (میكائیل) یا (عیسى) یاغیرە زەبرە ئاگاي لە حالي منە. لكن جهل وتقلید وحُبي كاذب سَوقي إنسان ئەكا بۆ قبول كردني مُزخرفات وخیالاتي باطلە بەڵكو محالات، تێ نافكرێ نازنێ ئەلێ چی ﴿قُلْ يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ﴾ ئێوەش گوێی لێ كەن ئەي مسڵمانینە ﴿لَا تَغْلُوا۟ فِى دِينِكُمْ﴾ لە دیني خۆتان تجاوز لە حد مەكەن ﴿غَيْرَ ٱلْحَقِّ﴾ زاتاً (غُلو) قط حەق نابێ وەكي (راغب) ئەفەرموێ (غلو) نە لە أموری دیني نە لە أموري دونیَوي چاك نیە نتیجەي خراپە، گەرچی (زُمَخشَري) ئەفەرموێ (غلوي) حەق هەیە وەك (غلو)ی (أهلي كلام) بۆ كشفي حقایق وسعي تەواو بۆ تحصیلي حَجِجْ وەك خۆیان یَعني أهلي عدل وتوحید كە (معتزل) یەكانن وە (غُلو)ي باطل هەیە كە تجاوز لە حەق بكا شەقاوي لەسەر باوێ إعراض لە أدلّە بێنێ إتباعي شوبهە بكا وەكي أهلي (أهواء وبِدَعْ) یعني سائري فرقي إسلام.

أمّا وەكي (سَیّدي آلوسي) ئەفەرموێ ئەوە (غلو) نیە استحصالي دەلیل وبرهان بۆ حكمي نظري لە واجباتە، تجاوز لە حد نیە. من ئەڵێم (غُلو)ي هەمو فِرە قي كَلامي هەمو حكماء هەمو صوفیە باطلە، سەر ئەكێشێتە كُفرو ضلال

غایەتي تَفرەقە ولَعْن ونەفرەتیە لەیەك (غلو)یان كرد لە تحقیقي كلامي (الله) فائدە ي چی یە؟ بۆ (غلو) یان كرد لە رؤیَتي (الله) چ ثمرەیەكي دا؟ (غلو) یان كرد لە أحوالي (بَرْزَخ وقیامەت) نتیجەي چ بو؟ (غلو)یان كرد لە إثباتي إختیار وسَلبي لە إنسان، زۆر بەدبو وەهكذا حُكماء (غلو)یان كرد لە وەحدتي حقیقي بۆ عِلتي أوَّل توشي سلسله كُفر بون؛ (صوفیە) (غلو)یان كرد لە معرفەتی (الله) نعوذ بالله بەجارێ لە دین دەرچون طَوریان كردە (طَوریَ) (وراء العقول). خلاصە طول وتفصیلي پێ ناوێ خۆتان تەماشا كەن ئەزانن (غلو) على الأطلاق (بەدە) باطِلە حَتّی تەماشای (غلو) لە مدنیەت كەن بزانن بشر توشي چ فَلاكەتێ بو لە سایەي ئەو (غلو)ە. ﴿وَلَا تَتَّبِعُوٓاْ أَهۡوَآءَ قَوۡمٖ﴾ باباوكو باپیري خۆتان بن، بابە ناوی مرشدي دین وهاورێی طریق بن. ﴿قَدۡ ضَلُّواْ مِن قَبۡلُ﴾ قسمێ لە (ضلال) هەیە گەلێ ئاشكرایە فكرو تأملێ واي پێ ناوێ كەبە (عَوام) نەكرێ. أما (أبالسە)كان رێی ئەو بەدیهیاتەش ئەگرن ئەیان ترسێنن وەك دیانان ئەلێن: (ئەمە لە ضروریاتي دینە مخالفەي ئەمە بكەي كافر ئەبی مستحقي لعني أبدي ئەبی). وەك فرقەێ لە ئێمە ئەلێن: ((ئەبێ (مُرید) لەبەر دەستي (شێخ) وەك مردی بێ لە بەیني دوو دەستي مردي شۆر، كەسێ بە شێخ بلێ (لِمَ) فلاحي نابێ، كەسێ ئەو قسە إنكار كا بە كافري ئەمرێ)).

حاصلي خەریك ئەبن سَلبي عقلیان لێ بكەن، ئەوجا بە هەوەسي خۆیان لێ یان ئەخوین. ﴿وَأَضَلُّواْ كَثِيرٗا﴾ كەلێكێشیان گومراه كردوە، یاگومراهێ زۆریان كردیە. ﴿وَضَلُّواْ عَن سَوَآءِ ٱلسَّبِيلِ ٧٧﴾ ئەلێن گومراهەكاني پێشو، پێش بَعْثَتي حضرەتی خاتم الرسلن. ئەمانە گومراهي وەقتي رِسالَتن، وەممكنە بلێین مقصد بەیاني سۆي إختیار وقطعي معذرەتیانە، زێرا بزر بون لە رێی راست، لە إنساني أدنی هۆشي هەبێ دوورە، ئەگەر خۆی بزر نەكا بزر نابێ.

كەوابێ ئێوەش بە متابعەي أسلافتان خۆتان لەم رێ یە جادەیە شەقامە راستە گوم مەكەن، وەرێ لە خەڵكیش مەگۆرشن، وەگەلێ قسەی تریش هەیە

بۆ دفعي تكرار فەرمویانە، أما من كەیفم پێ یان نایێ، ئەوەي ئارەزو ئەكا بنوارێتە تفسیري (آلوسي).

﴿لُعِنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِنۢ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ﴾ لە طرف حضرەتي كبریاءي ﴿عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُۥدَ﴾ لەزەبور ﴿وَعِيسَى ٱبۡنِ مَرۡيَمَۚ﴾ لە إنجیل دا. ﴿ذَٰلِكَ﴾ ئەو لعنە لە جهەت خوداوەندي غفور ورحیم ﴿بِمَا عَصَواْ﴾ سەبەب بە خروج لە إطاعەي فەرمایشتي إلاهي ﴿وَّكَانُواْ يَعۡتَدُونَ ٧٨﴾ لە عصیان دا متجاوزي عن الحد بون ﴿كَانُواْ لَا يَتَنَاهَوۡنَ عَن مُّنكَرٖ فَعَلُوهُۚ﴾ هەر مُنكَرێ كردبایانە كەس لەكەس نهي نە ئەكرد، وەك حالي ئێستاي ئێمە. قومێ (نَهي عن المنكر) یان تیا نەما، ئەوەي هەوەسیان بێتێ ئەیكەن. هەزار كفرو سیّئات صادر بێ لە جَمعي كە إعتقادي ولایەتیان پێ هەبن، قورِ بەسەر ئەو مەلایە نَهیان لێ بكا كافري ئەكەن ئەلێن منكري أولیاء الله ي لە نظري أُمَّت ئەبێتە مُلحد وزەندیق. خوا ئەزانێ سیّئاتي ئێمە گەلێ تجاوزي كردیە لە قبایحي بني إسرائیل ﴿لَبِئۡسَ مَا كَانُواْ يَفۡعَلُونَ ٧٩﴾ كارێ خراپیان ئەكرد، یاشتێ خراپ بو، ئەیان كرد بە دەوام. في الحقیقە ئەمە بۆ أُمَّت زۆر خراپە. (إمامي أحمد) و (تُرمزي) نقل ئەكەن لە (حُذَیفة بن الیمان) كە پێغەمبەر فەرمویەتی: ((بەو كەسەي كە نَفسي مني بەدەستە یا أمري بالمعروف نهي لە مُنكر ئەكەن، یاخود نێزیكە خواي تعالان لە طرف خۆی عقابەكتان بنێرێتە سەر، دوایێ لە خوا ئەپارێنەوە، خوا دوعاتان جواب نادا –یعني دوعاتان قبول نابێ–)). لەوبابە أحادیث زۆرە، لە پاش ئەو منكر بو بە معروف، معروف بو بە مُنكر. إنسان چ بلێ كەروأساي دین ودونیا بە فَساد چون، ئەمان وەك دلّن بۆ مِلّت، ملّت ئەبێ چی بكا؟ لاشك ئەو أحوالەي سَيِّئَە ي كە ئەمڕۆ تێی داین لە ثمرەي تركي أمري أمر بالمعروف ونهي عن المنكرە.

﴿ تَرَىٰ كَثِيرًا مِّنْهُمْ يَتَوَلَّوْنَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ ﴾ چ جایێ أمر بەچاكە نَهي لە خراپە، تۆ ئەبینی زۆر لەوان دۆستي ئەوانەي كافر بوين ئەكەن، لاي وانيش وايە كە كافرن وەمُشرك وبت پەرستن. يەكێ لە أجانب ئەگەڕێ لە ايران وطوران بزانێ قابله دەوڵەتي عثماني وإيران ئيتيفاق بكەن، لە پاش گەشت وگوزار وتفحص لە ميول ومنسوباتيان ئەگەڕێتەوە وە لە جرائد إعلان ئەكا ((ئەمانە قابلي إتفاق نين، زێرا گەلەكم ديتن محبەتي روسيان زۆربو چونكي دوشمني دەوڵەتي عثماني بو وە ئەيان گوت ئێمە لەگەڵ روس مُتفقين، غدرمان كرد شەڕمان بۆ عثمانيان كرد)).

ئەمڕۆ ئەگەر چی (آلي عثمان) (آلي قاجار) نەمان، لكن عداوەت لە بەيني فرەقي مسڵمانان وە دوەلوكەكانيان رۆژ ئەفزونە. ﴿ لَبِئْسَ مَا قَدَّمَتْ لَهُمْ أَنفُسُهُمْ ﴾ ئەوە چی يە؟ كە پيسە خۆيان ناردويانە بۆ زەخيرەي قيامەت؟ ﴿ أَن سَخِطَ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ ﴾ رق وغضبي خوايان بە نفسي خۆيان پێشە خۆ هەنارد. حقيقة ئەوەي موجبي غضبي الاهيە لە هەمو شتێ خراپترە، زاتاً ئەوەش نوعە غضبەكە إنسان إشتغال بە موجبي غَضَبي خِواي بكا (نعوذ بالله من غضبه وعقابه). ﴿ وَفِى ٱلْعَذَابِ هُمْ خَٰلِدُونَ ﴿٨٠﴾ ﴾ أبو الآبدينن، نەوەك وەكو وان تَوَهُّم ئەكەن، أياماً معدوداته.

﴿ وَلَوْ كَانُوا۟ يُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلنَّبِىِّ ﴾ ئەگەر ئەوانەي دۆستايەتي كافران ئەكەن لەو جولەكانە إيمانيان هينابا بەخواو حضرەتي (موسى) ﴿ وَمَآ أُنزِلَ إِلَيْهِ ﴾ تورات ﴿ مَا ٱتَّخَذُوهُمْ أَوْلِيَآءَ ﴾ ديارە ئەوانە إيمانيان بە خواو حضرەتي (موسى) نيە وە إلاّ إيمان ئەبو بە مانعيان لە دوستايەتي مُشركان وە (كَذا) ئەوەي لە مسڵمانان دوستي لەگەڵ دوشمني دين بكا لە زەرەري براي ديني، إيماني بە خواو حضرەتي محمد وقرآن نيە. ﴿ وَلَٰكِنَّ كَثِيرًا مِّنْهُمْ

فَـٰسِقُونَ ﴿٨١﴾ با ظاهریش بلێین (موسَوین) یا (محمدین)، کەسێ لـە إطاعـە دەرچو، ئەوەي بیکا ئەیکا.

﴿لَتَجِدَنَّ أَشَدَّ ٱلنَّاسِ عَدَٰوَةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱلْيَهُودَ وَٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْ﴾ أكثـــري بَشَر دوشمنن بۆ دیني حەق، چونکی سَدَّە لـە بـەینی إنسان وهـەواي نَفس، ئەگەر إنتسابێ بە دینێ لە أدیاني سابقە نەبێ، وە لە شرك زۆر روونـە چوبێتە خوار، عَداوەتەکەي بە قوەت نیە، قابلە بە ئاساني دینەکە قبول بکـا. سَوادي أعظمله جوولەکان نەك لەگەڵ دیني إسلام، لەگەڵ دیني موساي حـەق مـەیلیان نەبو، إنتسابەکەیان محضاً قومیەت وإستراحەت وجِدال بو، بۆ کردني گوناهان، بۆیە بە تأکیدي قَسَمي جەنابي (حەق) ئەفەرموێ (تۆ ئەبیني لە هەمو کەس بە عداوەت ودوشمنایەتي بەقوەت تر دەبارەي أهلي إیمان جولەکـەو ئـەوانـي روو چوین لە شرك)، کە شِرك بویتە صِلە ي مَوصلیان، عَداوەتیان عـداوەتـي دینـە نەك أشـخاص. عـداوەتـي جـوو بـۆ مـسلمانان (رۆژ أفـزون ومـستمرە). ئـەمرۆ شِدَّەتـي نـائري لـە فلـسطینە. ﴿وَلَتَجِدَنَّ أَقْرَبَهُم مَّوَدَّةً لِّلَّذِينَ ءَامَنُواْ﴾ ئەبینی لـە هـەمو کـەس نێزیـك تـر لـە جهـەت محبەتـەوە دەربـارەی مـسلمانن ﴿ٱلَّذِينَ قَالُوٓاْ إِنَّا نَصَـٰرَىٰ﴾ ئەوانەي کە بەراسـتي دیـانن بـە لَـوْثي تَعَصُّب ویَهودیِّ وشِرك مُلَوَّثْ نەبوین، ئەوانە في الحقیقە زۆر کەمن، غلبە بۆ ئەوانەیە کە ئەڵێن خوا (عیسی)یە عیسی (خوا)یە إبن الله یە، ئەوانە لە پاش محاربەي شـام وفتحي لە هەمو عالەم دوشمنایەتیان دەرحـەق بـە دیـني إسـلام وأهلـي إیمـان بەقوەت وزیاترە، ئاگري عداوەتیان رۆژ بە رۆژ إشتعال ئەکا چ بە دۆستي چ بە دوشمني مقـصدیان إمحـاي دیـني مبـیني أحمدیـە. لـەوەختی حـەربـي گـەورە (بینباش طابور) (نَشاجي أحمد نظمي) هاتە (کۆیە) ملاقاتمـان کـرد لـە أثنـاي حکایاتي حەرب ووتیو: (ئێمە خوراین چ ألمان بەسەر بکەوێ کە دوستمانە هەر ئەمان خوا، چ إنگلیز کە دوشمنمانە سەرکەوێ هـەر ئـەمان خـوا). ﴿ذَٰلِكَ﴾

ئەمە لەبەر چی یە؟ ﴿بِأَنَّ مِنْهُمْ قِسِّيسِينَ وَرُهْبَانًا﴾ عُلماي دين وزُهّاديان وەك أحبارو ربّانيّوني جوولەکەکان دلّيان قاسي نەبوە، طالبي علم وعبادەتن. ﴿وَأَنَّهُمْ﴾ ئەوان ﴿لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٨٢﴾﴾ وەك جوولەکان نالّێن ئێمە (بنی إسحاقين) شەرەفمان بەسەر (بَني إسماعيل) هەيە، إسماعيل لە جاريەيە لە إرثي إبراهيم (بەريە) أولادي ئەو لەوان مُحَقّرن، نابێ بە هيچ وجه ترفع بەسەر وان دا بکەن. في الحقيقه تکبر إنساني لەگەلێ سعادەت محروم ئەکا، هەرچەند من طَرفداري خانەدانيم، أما بەو نوعە نا مُجَرَّد إنسان خۆي پێ هەڵداتەوە خۆشی چ نەبێ، إنساني بەڕاستي ئەو کەسەيە حَسَب ونَسَبي باشی بێ، کە حَسَبي نەبو، نَسَبْ بە فَساد دەدا.

# ناوەڕۆكی بەرگی دووەم